دیوان و شەرحی حاڵی

# شێخ ئەحمەدی کۆر

«موکریانی»

لە: عەزیز موحەممەد پور ( داشبەندی ) وە
دگەڵ پێداچوونەوەی:
ماموّستا (هەژار) دا

# دیوان و شەرحی حاڵی

# شێخ ئەحمەدی کۆر

## (موکریانی)

گردەوەکۆیی، ساغکردنەوە، ڕێک وپێکی و،
هێنانەسەر، ڕێنوسی کوردی، چێ کردنی فەرهەنگۆکە

لە:

عەزیز، موحەممەد، پور (داشبەندی) وە

لەگەڵ پێداچوونەوەی:

مامۆستا (هەژار) دا

پی‌ناسەی ئەم کتیبە :

- دیوان و شەرحی حالی شیخ ئەحمەدی کوری موکریانی
- لی‌تویژەرەوە : عەزیز موحەممەدپور ( داشبەندی )
- ناشر : محمدپور
- چاپی : یەکەم ۱۳۷۸
- تیراژ : ۲۵۰۰ نسخه
- چاپخانەی : پەیام
- حروفچینی : محمدپور
- نرخ : ۳۰۰۰ تمەن

نشر محمدپور : تاران تەلەیفون : ۶۰۱۱۸۱۵

شابک : ۹۶۴-۹۰۱۲۷-۱-۰ ISB: 964 _ 90127 _ 1 _ 0

حُبُّ اَلوَطنِ مِنَ اَلأیمان



هەر، ئەو، رۆژەی، کە، دنیا هاتە، دانان
لە ئەو ساتەی قوڕی ئادەم، وە گیران
ئەوینی نیشتمان و، تۆرەمەو، هۆز
هەمو شێلران، بە ناوی لەش، دڵ و، گیان



گومبەذی شێخ ئەحمەد، لە گردی قەبران. کە
سیامەندی کوڕم
لە ساڵی ١٣٦٩ ی هەتاوی‌دا، بۆی هەڵ گرتووم



وێنه ی خه یاڵی خواناسی چاوتاریک و، دڵ و،
بیر ،ڕوشنی کورد، شێخ ئه حمه دی کوێر
که ی ده بێ یارب بکه ی من له حظه یک بێ ده ردو،داغ
کامڕان بم ئه ز،له ته ختی پاو خاکی مه وطه نێ
یاخوداچی من فیکرکرد،هه رزه ووپوچ و،عه به س
دورله چاو، بێ مڵک ومالّ بی قه وم و،خوێش ودادرس



به کوردی دیسان ،زیندو، ده بمه وه
له و،دونیاش، بو،کورد، تێ هه ڵ ده چمه وه
(ت)۶،ی مانگی شه عبانی ، ۱۳۳۹ی ه -ق ،م ، ۲ی مانگی ڕه شه مه ی ۱۳۰۰ه،هه تاوی
(ف ) ۶ی مانگی شه عبانی ۱۴۱۱ی ه - ق ، م ۲ی مانگی ڕه شه مه ی ۱۳۶۹ه - هه تاوی
ئیترمن ،هه ر،به وه ئومێدوارم
که تۆ ،ناوت که ریمه و، میش (هه ژار) م

## ئەو شوێن و کەسانەی ناویان لە پارچە هەڵبەستی
## « هەر خودایە نامرێ »
## دا ، هاتوە لەگەڵ رافەی هێندێک لەوشەکان کە دەبێتە سێ پاژ

پاژی یەکەم :

### وشەکان

( پێنوس ) کەرەسەی نوسین ، قەڵەم ـ ( خوست ) هێز ، توانا ، ووزە ـ(رەشەمە) دواهەمین مانگی وەرزی جستان ( زستان )ە ـ ( کەفچڕ ) کەف هەڵخڕێن ، کەف پڕژێن ـ ( زریان ) بەو بایە دەگوترێ کە لەلای زریلریان دەریاوە دێ و بە پێچەوانەی رەشەبایان شەماڵ کە لەلای باشورەوە دێ و زۆریش گەرمە ـ ( سەقرو ، هەڵۆ ) دوباڵەندەی ناودێر و تیژ باڵن ـ ( سوها ) ئەستێرەیەکی کەمنوری ئاسمانە کە خەڵک بۆ ئەوەبزانن چاویان نزیک بینە یان دوربین ، خۆیان بە دیتنی ئەم ستێرە تاقی دەکەنەوە،تەنانەت بۆتە،مەتەڵیش وەک دەڵین : من دەڵێم ئەستێرەی سوهام نیشان دە،کە چی ئەو مانگم پێشان دەدا ....ـ ( سۆما ) روناکایی ـ ( تەراز و کو ) ئەستێرەی میزان و حەوتەوانە ـ ( گەلاوێژ ) ئەستێرەی سیوەیلە ـ ( کاروان کوژە) بەم ئەستێرەیە دەگوترێ کە لە پێش بەرەبەیان دا هێشتا شەوی زۆرماوە لەلای رۆژ هەڵاوەتەوە هەڵدێ و کاروانچیان دەخەڵەتێنێ،چونکو بە دیتنی ئەو،لایان وایە رۆژە و،وەری دەکەون.پاشان بۆیان رۆون دەبێتە کە هێشتا هەر شەوە ـ( ئاو هەڵدێر ) ئاوشار ، ئاڤگە ـ ( قەتیس ماو ) رامـاو ، بـێ جوولە ، واق ورماو ـ ( زیز و زویر ) مانگرتو،نەویست،راضی نەبوو ـ ( کێوی و کەوی ) جەنگەڵی و نامو،ماڵەکی وراهاتوو ـ ( ووزە ) توانا و هێز ـ ( ئاوەز ) هۆش ، بیر ، فام و ئەقڵ ـ ( کڵ ) ئەستون ، کۆڵەکەی بەخشت و بەرد و ئاسن دوروست کراو ـ ( قەڵت وبڕە) لەت و کوت کراوە ـ ( کڕ کەوتوو) بێدەنگ و مات ـ ( دەربڕ ) بوێر و کڕنە کەوتە ـ (چڕ) هەڵەموت و

سەخت‌ودژوار، زۆر سەرە و ژور ـ ( شاهید چیای ) ئاماژەیە بۆ ئەو کۆ بونەوەیەی کە(هەژار) بەنیۆنەری (ک.ژ.ک) سەرهەنگ ئەحمەد(میرحاج بە نیۆنەری ک‌ه)و جەودەت‌بە نیۆنەری‌خۆی بورنەلە سالّی ١٣٢٣ دا ، لەو شوێنەدا پێکیان هێناو هەر لەو رۆژە وە ناوی(دالّان پەڕ)یان گۆڕی‌وکردیانە -(سێ سنور) : چونکو دەروانێتە هەرسێک سنوری ئێران و تورکیە و عێراقەوە ـ ( قاقڕ ) ویشک ، بێ‌گیا وگۆلّ و ئاو ، بێرون و چوّل ـ ( دۆڕان ) دۆڕاندن ، بەفیڕۆدان ، هەڵ خەڵەتان ، لە ڕێگە هەتلە بورن ، لادان لە ڕێگەی راستەقانی ـ ( خیچ و سوڕ ) خیچان قرتان ، لە گەمەوکایە چونە دەرەوە ، دۆڕاندن ، لە دەست‌دانی هەل و ماف ـ ( سوڕ بون ) ماندو بون ، فل بون ، لە کـار کـەوتن ، واز لە کـایە وشـتی واهێنان ـ ( ئوّغر بـەخێر ) ووشـەی خـێر و خوشیێ‌یەکە ، پتر بـۆ ئـەو کـەسانەی لەسـەر سـەفەرەن یـان لە ڕێگـەدان دەکـار، دەهـــــێندرێ .

پاژی دوهەم :

## جێگە و شوێنەکان

( ئەلبورز ) واتە کێو و چیای بەرز ، چونکو ئەل ـ هەل ـ هەڵ ، بە واتای چیایە . واتە هەڵبەرز ، کێوی هەرە بەرز. ئە لبورز،بەم چیایە دە گوترێ کە کە وتوتە لای ژورووی(باکور)شاری(تاران)ەوە کە نزیکەی ٥٠٠٠پێ لە روخی دەریا بەرزترە (دەماوند) واتە خاوەن دەم وە دودو و دومان ، لە تەماوون بوو . ئەویش ئەو چیایە کە کەوتوتە رۆژ هەڵاتی شاری تارانەوە و ، دوازدە مانگە بە هەوی لێ ناچێتەوە و ، گۆیا ئەو جێگەیە کە ( فەرەیدونی ) کوڕی جەمشیدشای ئێران بە فەرمانی ( ضەحاک ) لەوێ بەند کراوە ، تائەوەی کاوەی ئاسنگەر شۆرشی کرد و ، ضەحاکی گرت و فەرەیدونی رزگار کرد . ئەویش زیاتر لە ٥٠٠٠ پێ بەرزە .

( ئەلوەند ) واتە ئەو چیایە کە کەوتوتە لای رۆژئاوای شاری ( هەمەدان ) کە جێگەی لێ حەسانەوە و راز و نیازی (باباطاهری عوریانی ) لوڕ بووە . ( جودی ) ئەو چیایە کە کەشتی حەضرەتی نوح دوای طوفان و لافاوەکە ، لە سەر ئەوێ نیشتە سەر عەرد و ، خۆی لێ گرتە وە و ، لەنگەری گرت ، کەوتوتە کوردستانی سەر بە تورکیاوە و ، بەشیکە لە کێوی (ئارارات ) : کێوی جودێ لە گەڕی تۆفانا کەشتیکەی نوحی لە سەر سەردانا . (هە ژار)

( بێستون ) چیای بێستونی سەربە شاری کرماشان (کوڕماچان ـ کورماجان )کە تەتەڵەو کەتیبەی داریۆشی یەکەمی لەبەرزایی لای رۆژهەڵاتەوە لێ هەڵکەندراوە و ئیستاش شار وُ چکەی (بیستون ) لە داویندا ، هەڵکەوتووە ، کۆتەڵی (هێرۆکلیسی) یۆنانیش هەر لە دەم رێگە و ژێر ئەو نوسراوەیە دا ، دانراوە .

( پەراو ) پڕئاو ـ پڕلە ئاو : ئەو چیایە کە کەوتوتە پازدە کیلومتری لای باکوری شاری (کرماشان )ە وە کەوینەی خوسروە پەروێز و شەودێز ( چارەوای تایبەتی خوسروە ) و ، زۆر نەخش و نیگاری‌کەی تێدا جێ‌کراوەتەوە ، کانی و ئاوێکی زۆر گەورە و

خۆشی لێ ساز دراوە . دیارە ئەم چیا پڕبیت و بەرەکەت و پڕ لە ئاوە ، هەر لە دەریاچەی خضری زیندۆە بگرە تا دەگاتە بێستون ، بە درێژایی کێوە کە ئاو و ئەشکەوتی تێدایە کە هێشتا زۆربەیان ، بە باشی ، نە زاندراون و ، نەدۆزراونەتەوە . دیارە ، ووشەی (پەراو)یش کە بە واتای دەفتەری تێدانوسینە ، هەر لەووشەی ئەم پەراوەوە وەرگیراوە چونکو ئەم کێوە پڕیتی لە نوسراوەی هەڵکەندراو .

( زەردکۆ ) یان کۆە ڕەنگی لوڕستان سەرچاوەی دو زێیی گەورەی وەک ( زایەندە رود ) و ( کارون )ە . زایەندە رود ، بە نێو شاری ئەصفەهان دا تێ دەپەڕێ و دەڕژێتە گۆلاوی (گاوخوێنی )وە . کارونیش دەڕژێتە کەنداوی ( فارسەوە ) .

( شاهۆی ماچۆ ) کێوی شاهۆی ماچۆ ماچۆکان واتە هەورامانێکان،دیارە ، پیر خضری ناوداریش هەر هی ئەو شوێنە پیرۆزە یە . ( قەڵای دزڵی ) هەورامان ، یەکێکە لە ( ١٨ قەڵا ) پتەوو بەرزەکانی هەڵوخانی ( ئەردەڵانی کوردستان )کە لەکاتی خویندا شا عەباسی صەفەوی ئەندیشی لێ دەکرد .

( هەڵگۆرت ) چیای پشت ئاوایی گرک و روسی ـ ناوچەی بانەکایەتی کوردستانی ئازادکراوی ئەو دیوە و بەرزترین چیای کوردستانە لە وێدا .

( پیڕس ) ئەویش هەر لە ناوچەکانی سەربە شاری ( رەواندوزە )و ، ئەو دیودا هەڵکەوتوۆە. ( صەلاحەددین ) چیای سەربە صەلاحەددین کە ئیستا بوتە شار و زانستگای لێ دامەزراوە و ، خۆشترین هەوارگە هاوینی کوردستانی ئازادکراوە

( چیای مەغلوب ) لە لای ( دهوکە)وەیە،ئەو شوێنەیە کە عەزیزئاغای داسنی کوڕەکانی خوی بە ناوی ( دەلکەوان و صەیدەوان و مەلکەوان ) بە هەڵە لەوێ کوشت و ئەم چیرۆکە دڵ تەزێنە لە وساوە تا ئیستا لە نێو کوردان دا بە تایبەتی برا کوردە ئیزەدیکانماندا ، هەروەها ماوەتەوە .

(گەڵی لالەش ) واتە دۆڵ و دەرەی لالەش . کە شێخ (عەدی حەکاری ) ڕیبەری برا کوردە ئیزەدی و داسنیەکان لەوێ نێژراوە و جێگەیەکی یەکجار خۆشیشە . بۆ

ئاگاداری پتر ، بروانه کتێبی ( ئاداب و رسوم کوردانِ ـ محمدپور،که مامۆستا هەژار "چی له بەزیدی دەزانم "ی لەسەر نووسیوه ) . ( سپێی ڕێز )ی خەیلانیان ، (قەندیل)ی مامه کۆییان ، دو چیای هەره بەرزن له سنوری کوردستانی ئەم دیو و ئەو دیو ، له لای روژئاوای ئیرانی سەربه پیرانشاره وه ( ئاکۆ ) ناوچەی (ئاکۆ) سەربه شاری ( رانیه و چوار قوڕنه ) که زۆربەی ناوچه که هی عەباسی مامەند ئاغایه .

( ئارارات ) چیای ناوبه دەرەوەی ئارارات که کەوتوته کوردستانی تورکیه ، ئیران و عیراقه وه ، سی ڕێی پڕ ئاوی وەک ئەرەس ـ ئاراس ـ فورات و دەجله ، سەرچاوەیان لەوێ هەڵده قولێ و ، دوازده مانگه بەفری پێوەیه .

( دالآن پەر ) یان سێ سنور ، کەوتوته پشت شارۆلکەی زیوەی مەرگەوەڕو ئاوایی (دزه)ی حاجی سەیید عەولآ ئەفەندی شەمزینی ،که من،خاوه و خیزانم له ساڵی ۱۳۷۴ی هەتاویدا ، چوینه ئەوێ و وێنەیه کشمان بۆ یادگار لەم جێگەیەدا هەڵگرت. دیاره لایەکی ئێران و لایەکی عێراق و ئەوی دیکەشی تورکیایه ( که هه موی ، هەر کوردستانه ) .

( سورداش ) که ئێستا شارۆلکەیەکیش هەر بەو ناوەوه له نێوان سەد و بەندی (دوکان) و سولەیمانی دا هەیه ، کەوتوته بەشی پشتی ئەو شاره وه که له کاتی خۆیدا شیخ مەحمود ـ حەفید ـ لەو کێوه دا چەند جار شەری دەگەڵ انگلیس کردوه و سمایل ئاغای سمکۆش هەر لەویوه هاتوته شاری سولەیمانیه و میوانی شیخ مەحمود بووه .

(ئەزمەڕ) ئەو چیایەیه که کەوتوته باکوری شاری سولەیمانی و نێوان سیتەک و تەگەران و قەلآ چوالان و چوارتا ، وه .

( پیره مەگرون ) ئەو کێوه ، له ئەزمەرەوه بەره و سەر چناری لای سولەیمانی و ڕێگەی ماووت ، دەکشێ و بەرزاییشی کەمه .

( سوڵتان ) یان کێوی سوڵتان سەید وەقاص، لەنیوان ئاوایی قەمطەره و خاتون باغ و

قورغان دا ، هەڵکەوتوە و جێگەی زیارەتی خەڵکیشە :

سەید وەقاص هەربەگەڕی رەش بەڵەکی ؟ وەکو جاران بەکلوک و کەڵەکی ؟
لایەکت ( چۆمی مەجید خان )ی بە رین ماڵ و قوپی هەمو پڕ پوڕ و پەرین

"هەژار"

( مالوک ) یان کێوی چەکوچ و مالوک کەوتوتە پشت ئاوایی قەمطەرە و نیوان دەرمان و قزلجە و یەمین ئاوا ، وە .

( میر قاص ) ئەو کێوەیەکە کەوتوتە باکوری ئاوایی باغچەی حاجی مارفاغای دێبوکری و نیوان سەر باغچە و کانێ رەش و هاچی دەری ، وە .

( تەرەغە ) ئەو چیا بەرزەیە کە ئاوایی عیلم ئاوا و تەرەغە کەوتونەتە ئەم لاو ئەو لایەوە . جێگەی ژیانی چەندین ساڵەی هەژار و بنەماڵەی ئەوان بوە.ئاوەڕوی دێتەوە سەر نوبار و عەزیزکەند و پاشان عەباس ئاوای نزیک داشبند و چومی زێوینەڕو (تەتەهو) ، وە . دیارە شەرگەی سەیفەدین خانی گەورەی موکری لەگەڵ شا عەباسی صەفەویش دا بوە . سەر تروپکی ئەو کیوە زورپان و گوڕە و جێگە و وارشی عەنبار ئاوە کەشی هەرماوە .

تەرەغە!چونی ؟ سەرت هەر بەرزە ؟ لێک جیابونەوەمان چەند وەرزە ؟
توکە قیت ماویە وە بارت بارە هەرە مە ی جوانی لە تو را دیارە

" هە ژار"

( لوکەر ) کە ئێستا یەکێکە لە پاریزگاکانی وڵاتی ئەفغانستان،زوربەی دانیشتوەکانی کوردن . بو ئەو مەبەستەش هەریروانە کتێبی ئاداب ورسومی کوردان .

(قوچان )یان هە ریمی شاری خە پوشانی کون کە لە سە ردە می صە فە ویە کانە وە بگرە بە رلە وانیش جێگە ی کوردە راگوێزراوە کانی کوردی ئیران بوە.ئێستاش نزیکەی ملیونێک کورد لە پاریزگای خوراساندا هە ن کە زوربە یان بە زاراوەی کورمانجی باکور،دە ئاخوێن ( دەدوێن ).

(تاران )پێ تەختی وڵاتی ئیرانە،(کەرەج ) ئەم شارە لە ٤٥ کیلۆمتری رۆژئاوای تاران دا هەڵکەوتوە . بنەماڵەی بارزانی و پەنابەرەکانی دیکەی کورد،دوای تێشکانی شۆرشە مەزنەکەی بارزانی لە ساڵی ١٩٧٥ زایینی دا لەوێ دانیشنە جێ کراون .
(بێرۆت) ئەم شارە پێ تەختی وڵاتی لوبنانە .( مصر ) وڵاتی مصر مەبەستە .
( ئەنقەرە ) یان ئانکارا ، پێ تەختی تورکیە یە( عیشق ئاباد ) پێ تەختی تورکەمەنستانە کە کوردی جەلالی و دیکەشی لێ یە .
(باکۆ و ئیرەوان ) پێ تەختی ئاذەربایجان و ئەرمەنستانن،کە لەو دو وڵاتەش داکورد زۆرن .درسیم و دیاربەکر و خەرپوت ، هەر سێکیان لە کوردستانی داگیرکراوی تورکیە دا هەڵکەوتون . ئامێدیش ئێستا دەگەڵ دیار بەکر،دا بونەتە یەک شار .
( بەدلیس ) یان بەتلیس زایینگە و نێژینگەی ئەمیر شەرەف خانی بەدلیسیی یە کە لە کوردستانی تورکیە دایە .
( ئاغجەلەر ، زاخۆ ، دهۆک ، بارزان ، شلێر ) هەمویان لە کوردستانی ئازادکراوی ئەو دیودا هەلکەوتون . ئاغجەلەر سەربە شاری کۆیە . شلێر سەربە شاری پێنجوێنە . زاخۆ وبارزان سەر بە پارزگای ( دهۆک )ن .
( سۆران ) بریتیە لە ناوچەی هەولێر و کۆیە تادەگاتە حەریر و باتاس و شەقلاوە و هەریمی رەواندز .
( جزیروبۆتان ) لە کوردستانی سەربە تورکیە و سوریەدا هەڵکەوتووە . (بادینی) ناوچەکانی رەواندز ، بارزان ، جزیروبۆتان ، شار و گوندە کوردنشینەکانی ورمێ و ماکۆ و خوێ و سەلماس دەگریتەوە . دیارە ئەم ناوە لانی ئایینی هەیە ، نەک هەریمی .
( موکری ) یان موغری لە گۆمی وانە وەبگرە تا دەگاتە شنۆ ، سەردەشت ، نەغەدە ، سابلاغ ، بۆکان ، سقز ، بانە ،تیکاب ( تیک ئاو ) ، شیز (تەختی سولەیمان ) ، مەراغە ، بناو ، نێوان دو ئاو ( میان دو ئاو ) و دەشتی مۆغان ، هەموی پێی گوتراوە موکری ، یان موغری واتە جێگە و شوینی موغ .

( ئەردەڵان ) وڵاتی کوردستان ، سنە و مەریوان تا دەگاتە ناوچەی کرماشان و هەمەدان و زەنجان و موکری .
( فەیلی ) ئیلام بە هەمو هۆز و هەریمەکەیەوە تا دەگاتە لوڕستان و خوررەمئاوا .
( جوانرۆ ) شاری جوانرو و روانسەر و تا دەگاتە هەورامان .
( هەوشار ) شاری تیکاب و ناوچەکانی دەور و بەری تا دەگاتە هەریمی بیجار و شاهیندژ واتە دژی شاهین یان قەڵای هەڵۆ .
( شاری شیرین ) شاری قەصری شیرین یان کرماشان مەبەستە .

پاژی سیهەم :

ناوەکان

( قەدەم خێر ) ئەو شێرەژنەیە کە لەسەردەمی رەضاشای پەهلەوی دا ، لە لوڕستان شۆرشی هەڵگیر ساند ، بەڵام لە دوابیدا ، دەستی هەڵگرت و زۆر بە سەربەرزیەوە کۆچی دوایی کرد . دیارە سەبارەت بە قەدەمخێر و قزی خان و چەن شۆرە سوار و شێرەژنی دیکەی کوردستانی باشور ، چەند وتاریکم نوسیوە کە بە خواستی خودا ، لە کاتی خوێدا ، بڵاو دەکرێنەوە (هەڵبەت بۆ کۆنگرەی ئەرکەوازی لە سالی ١٣٧٣ دا نواندمن ، بەڵام تا ئیستا وەک زۆر نوسراوەی تر ، هەر حاشار دراون و چاپیان نەکردون .
( فاتمەلەڕە ) ئوگر و خزمەتکارەکەی بابا طاهیری عوریان .
( عەلی سینا ) ئەبو عەلی سینای ناودێر ، کە ماموستا هەژار قانونەکەی ئەوانی لە حەوت بەرگ دا بە فارسی هەڵگێراوەتەوە .
( خانی ) ماموستای هێژا ئەحمەدی خانی‌یە کە ماموستا هەژار مەم و زینەکەی لە کورمانجیەوە هەر بە هەڵبەست کردوتە موکریانی .
( شێخ ئەحمەد ) جزیری ، خواناسی گەورە و بەناوبانگ کە ماموستا هەژار

دیوانەکەی ئەوانیش کە بە کورمانجی یە ، بە موکریانی شەرح کردوە .
( قاضی ) قاضی موحەممەد ، سەرکۆماری کودستان بو لە شاری مەهاباد ،کە دەگەڵ صەدر قاضی برایی و حەمەحوسین خانی ئاموزای بە فەرمانی حەمەرەضا شا ، لە سەردەمی سەروک وەزیری قەوام دا ، لە چوار چرای مەهاباد لە قەنارە دران .
(١٣٢۶/١/١١)
( بارزانی ) مەلا موصطەفا بارزانی کە نزیکەی پەنجا سال شورشی گەلەکەی بە ئازایەتی و مرۆڤایەتی راگرت و پاشان لە سالی ١٣٥٧ هەتاوی دا لە نەخۆشخانە یەکی ئامریکا دا کوچی دوایی کرد و تەرمە پیروزەکەیان هیناوە شاری شنۆ و پاژ چەن ساڵ بردیانەوە بۆ بارزان .
(باوک و کوڕ ) واتە شێخ عەبدولقادر شەمزینی و سەید موحەممەدی کوڕی ،کە هەر دوکیان بە فەرمانی کەماڵ ئاتاتورک لە قەنارە دران .
( شێخ سەعیدی پیران ) سەرۆکی ئایینی و رامیاری گەلی کوردی تورکیە کە ئەویش هەر لە سەر فەرمانی کەماڵ ئاتاتورک لە ساڵی ١٩٢٥ ز دا لە سێداره دران .
( مەحمود ) شێخ مەحمودی سولەیمانی کە دوای چەن ساڵ بەربەرەکانی دەگەڵ حکومەتی ئینگلیس و دەربەدەری و زیندان ، پاشان لە بەغدا،بە دەرزی هەوایی ، کوژرا .( ١٩٥۶.ز. )
( سمکۆ ) سمایل ئاغا سمکۆ ، دوژمنی هەرە گەورەی ئینگلیس و رەضا شای پەهلەوی،پاژ چەن ساڵ بەربەرەکانی بە فیڵ و فەند لە سالی ١٣٠٩ هەتاوی لە شاری شنۆ،دا ، رەشە کوژ کرا .
( بداغ سوڵطان ) میری خواناس و بەدەسەڵاتی موکری کە شاری مەهابادی ئێستای بنیاد ناوە . مزگەوتی سور و پردی سور و بازار و کاروانسەرای ئەو شارەی لە سەردەمی شایەتی صەفەویێەکاندا ، دامەزراند . چازان و خواناسێکی وەک مەلا جامی و دەیان مامۆستا و پسپوری دیکەی لە هەندەران را ، هێنا ئەو شارە،لە

خوێندنگای ئەوێدا ، کە ئەوسا کە "سابلاغی" پێ گوتراوە دامەزراندوە و مـوچە و بەراتی بۆ بڕیونەتەوە . زۆر ئاوایيشی کردۆتە مُوقوفە وبژیوی فەقێ و خـوێندکار و بەڕێوبەرانی مزگەوت و حوجرەکان . دیارە لە سەردەمی شا سولەیمان صەفەوی دا ، سکەشی لێداوە . ئێستاش گونبەذ و بارەگای هەمیشە تێدا حەسانەوەی لە سەروی شارەوە،جێگەی رێزی خەڵکە .
( هەژار ) ناوی نهێنی وهەڵبەستی ، مەلا ئاو رەحـمان کـوڕی مـەلا مـوحەممەدی حەسەن خاڵی شەرەفکەندیی موکری‌یە کە من ئەم هەڵبەستانەم بە بۆنەی کـۆچی دوایی ئەوانەوە داناوە .
( خاڵە ) خاڵە مین ، حاجی سەید حەمەد ئەمین بەرزەنجی ، بلیمەت و هـۆنەری چازانی کورد ،کە دانشتوی شاری نەغەدەیە .
( حەقیقی ) کاک عەباسی حەقیقی ، شاعر و هۆنەری بەناوبانگی کورد لە تـیرەی شێخ ئاغای دێبۆکری‌یە کە دانیشتوی شاری بۆکانە .
( ئەفخەمی ) میرزا ئیبراهیمی ئەفخەمی شاعیر و دڵسۆزی گەل خۆشەویستە کە لە شاری بۆکاندا نیشتەجێ‌یە .
( ئاوات ) سەید کامل هاشمی ،کۆنە هاواڵی خاڵە مین ، حە قیقی و هەژار ، یە کێکە لە هەرە هۆنەرە بەرزەکانی کورد ،کە دانیشتوی ئاوایی قاقلاوایە .
( هێدی ) کاک خالید حیسامی خەڵکی ئاوایی شێخ ئاڵی بۆکانە و ئێستا دانیشتوی شاری کەرەج و یە کێکە لە شاعیرە بەرزەکانی کورد . ئەویش هەر دێبوکری‌یە .
( صەلاح سوران ) کاک حەسەن کوڕی برایم خانی ساروقامیشی فیضا... بەگی و برای دوکتور عەلی گەلاوێژ و لە نەوادەکانی بداغ سوڵطانە کە ،سەرەرای هۆنەریی ، بـەسەر چـەند زمـانی وەک ئـینگلیسی ، فـەرانسـەوی و ئـالمانی و هـیتریش دا ، دەسەڵاتی هەیە و وتو وێژیان پێ‌دە کا .
( پەشێو ) مەبەست عەبدوڵا پەشێوە کە ئەمرۆ باشترین هۆنەری کوردە .

( بێکەس ) شێرکۆ بێکەس، کوڕی مامۆستا فایق بێکەسی کوردستانی ئەودیوە و لە هەرە هۆنەرە باشەکانی کوردە .
( کەلیموللا ) تەوەحودی ، نوسەر ، هونەروەر و هۆنەری کوردی خۆراسانە .
( سەرخڕ ) واتە دۆڵ و دەرە و شیوە بەلام ناوی ئەوگەرەکەیە لە مەهاباد دا ، کە هەژار لەوێ ، هاتوتە دونیاوە.
( نەیار ) دژ ، دوژمەن - ( بنەبڕ ) تەواو بو ، لەبنە هاتو .
( هێمەن ) سەید حەمەد ئەمینی شێخ الاسلامی، کە هەر لە سەرەتای فەقێیەتیەوە دەگەڵ هەژار دا بوون و هەر پێکەوەش ناوی هۆنەری نەتەوایەتیان لە لایان قاضی موحەممەدەوە پێ بەخشراوە .

پرسین لە دو مەل ، هاوالی پێشو      یەک گیان و دولەش لە یەک جیا بو
دندوکی زێڕین ، دەسکردەی خودا      ئالقەی کۆیلەیی زێدیان لە گوێدا

ئەم دو هەلبەستە هی "مەلی خەیال"ن کە لە سالی ١٣٤٦ دابو ماموستا هیمەن ئەم نوسیون .
( تۆلە ئەستێن ) نازناوی هەلبەستی خۆمە ( موحەممەد پور ) .

تێبینی :

دیارە ئێستا کە سالی ١٣٧٨ هەتاویە و ئەم کتێبە (( شێخ ئەحمەد )) چاپ دەکرێ ، خالە مینە دەگەڵ هەژار و هیمەن و مەلا غەفوری حافظ لە گۆرستانی بداغ سولطان دا ، یەکتریان گرتۆتەوە . دیارە میرزا ئیبراهیمی ئەفخەمی لە سالی ١٣٧٣ ، مامۆستا حەقیقیش لە سالی ١٣٧٥ ، سەید کامل ( ئاوات ) لە سالی ١٣٦٨ دا کۆچی دواییان کردوە. خوداوەندی بە بەزەیی و دلۆڤان لە ئێمە و لە ئەوانیش خۆش بێ .

به نام خداوند بخشنده مهربان

## فرازهایی از زندگینامه استاد ( محمدپور )

در شبه قاره وسیع و پهناوری که به نام هند در دل اقیانوس پیش رفته و به نام سرزمین هفتاد و دو ملت شهرت یافته است و نیز در کشور همسایه‌اش پاکستان که سابقا" جزو این سرزمین بوده‌است ، سخن از دیاری می‌رود که سیه چشمانش از دیرباز شهره آفاق‌اند ، سخن از کشمیر زیباست که در وصف آن گفته‌اند :

اگـر فـردوس بـر روی زمـین اسـت
همین است و همین است و همین است

به راستی کشمیر زیباست و ما نیز همتای این بهشت کوچک و زمینی ، در غرب ایران ، فردوس دیگری داریم که هیچ بیننده‌ای از تماشای آن سیر نمی‌شود و در برابر آنهمه طراوت و زیبایی خدادادی ، سر تعظیم فرود آورده ، جهان آفرین را سپاس می‌گوید که یکجا چنین نعمت و زیبایی را بدان خطه ارزانی فرموده‌است . اصولا" روستاهای غرب ایران ، بخصوص کردستان سرسبز و خیال‌انگیزاند و در هر فصل سال زیبایی و طراوت دیگری دارند .یکی از این روستاهای خوش آب و هوا و باصفا ، روستای « حاج لک » در منطقه مکریان ( ناحیه چوم مجید خان ) از توابع بوکان است که چشم‌اندازی بدیع و شاعرانه دارد.زمزمه جویبارها و نغمه پرندگان این منطقه چنان است که دل از دست مسافر غریب می‌رباید و گاه ده‌نشینان و

کشاورزان دور و نزدیک ، دل از دیار خویش برکنده ، در همانجا ماندگار می‌شوند .

استاد « محمدپور »، زادهٔ این روستا است . وی در تاریخ نوزدهم اسفند ماه ۱۳۱۹ در خانواده‌ای صنعتگر و کشاورز و در عین حال بسیار مذهبی ، دیده به جهان گشود . استاد « عبدالرحمن » با همفکری پدربزرگ خانواده ـ به میمنت میلاد فرزند عزیز خویش ، اورا « عبدالعزیز » نام نهادند . پنداری که می‌دانستند نوردیده و نورسیدهٔ ایشان در بارگاه عظمت الهی ، بنده‌ای عزیز و مقرب و فردی شایسته و استادی ارزشمند خواهد بود .

استاد عبدالرحمن ، خود مردی باتقوا و دلیر ، از اهالی کردستان و فرزند استاد « شیخهٔ » محمدپور ، از ایل جلالی (گلالی ) بودند . به اقتضای خوی ایلی و طبیعت عشایری که زیر بار نفوذ و سلطهٔ هیچ حاکم ستمگر و ظالم پر قدرتی قرار نمی‌گیرند ، ایشان نیز بر اثر اختلاف با خان ده ، در سال ۱۳۱۵ هجری شمسی ، محل سکونت خویش روستای « داره لک » مهاباد را ترک نموده ، همراه با خانواده به قریهٔ « حاج لک » و چند سال پس از آن ـ سال ۱۳۱۹ ـ باز بر اثر وقوع پاره‌ای اختلافات با خان ده ، به قریهٔ « گوگجلوی مرحمت‌آباد » و « ساروقامیش » می‌روند . سپس در سال ۱۳۲۱ به روستای « قره‌گل* » و « داشبند بوکان » رفته و در همانجا ماندگار می‌شوند

---

* گل در زبان فارسی بر گل محمدی و گل سرخ اطلاق می‌شود ولی مراد از (( قره‌گل )) در زبان ترکی ، زیباترین نوع گل سرخ است که رنگ آن به سیاهی می‌گراید ـ معادل (( رز نوار )) در زبان فرانسه ـ در زبان عربی نیز گلستان سعدی به((روضةالورد)) ترجمه‌شده‌است.از سوی دیگر طبق اطلاعات بدست‌آمده،روستای ((قره‌گل)) که در حدود چهار کیلومتری شمال غربی قریهٔ ((حاج‌لک)) واقع شده‌است ، به معنی (( تالاب سیاه )) است که

( ادامه در صفحه بعد )

نسبت استاد عبدالعزیز محمدپور به « داشبند » به همین سبب است .

روزگار کودکی استاد چندان خوش و دلخواه سپری نگشته است . زیرا در همان اوان کودکی ( سال ۱۳۲۸ ) ، مادر گرامی خود ، ملازاده « بانو رقیه » را از دست می‌دهند . این خاطرهٔ تلخ را هرگز از یاد نبردند و همچنان با ایشان است . اما به یاری کردگار ، ذوق سرشار و استعداد خدادادی خویش را پی می‌گیرند ، پای همت به راه آورده ، دست از طلب دانش برنمی‌دارند . تحصیلات خویش را در سال ۱۳۲۶ شمسی در حوزهٔ علمیهٔ قره‌گل آغاز می‌کنند و تا سال ۱۳۳۰ طبق روال آن زمان ، پس از خواندن گلستان و بوستان ، مقدمات صرف و نحو عربی را در همان روستا ، فرا می‌گیرند . سپس از سال ۱۳۳۰ تا اواخر ۱۳۳۱ در روستای داشبند ، به مطالعهٔ کتب ادبی فارسی و عربی اهتمام می‌ورزند . در سال ۱۳۳۲ شمسی برای ادامهٔ تحصیل در شاخهٔ علوم دینی به مناطق اشنویه ، لاجان ، مهاباد ، مجدداً قره‌گل ، قازان لو ، جامرد ، قباغ‌کند ، باغچه ، قوزلو و ... ، رفته ، در محضر استادانی چون شادروان ملا محمدامین قاجری که از شاگردان بنام و ممتاز استاد عالیقدر ملا محمد کویی عراق معروف به « جناب ملا » بوده‌اند ، زانوی تلمذ بر زمین می‌زنند .

بطور خلاصه به اکثر مناطق کردنشین ایران و عراق سفر می‌کنند و از محضر علمای بزرگ و نامدار وقت ، همچون ملا محمد رئیس ، مدرس حوزهٔ علمیهٔ گلالهٔ عراق ، و حاج ملامحمد ولزی و حاج محمدجسیم قباغکندی ، استفادهٔ شایان

---

در زبان کردی به آن (( گوله رەش ))می‌گفتند . ولی ترکها ـ غزها ، سلجوقیان ، تاتارها و مغولان ـ که در حدود ۲۰۰ سال براین منطقه فرمانروایی داشته‌اند و نام بیشتر روستاها و مناطق ، حتی رودها و کوهها را نیز تغییر داده‌اند ، ((گوله رەش )) را به (( قره‌گل )) تبدیل کرده‌اند .

می‌برند و سرانجام در سال ۱۳۴۲-۱۳۴۱ به دریافت گواهی‌نامهٔ افتاء و اجتهاد و تدریس در مذهب امام شافعی ، از دست استادان عالیمقام همان منطقه ، مانند شادروان حاج ملا محمد باقر مدرسی بالکی و حاج سید ملا علی المانه‌ای مریوان و نیز ملامحمدعلی ولزی و دیگر استادان از مناطق مکری نائل می‌گردند و علوم متداول عصر،نظیر معانی ، بیان ، بدیع ، منطق ، حکمت ، فلسفه ، کلام ، اصول ، فقه ، تفسیر ، هیئت و نیز ادبیات عرب را در شهرهای سقز ، بانه ، پیرانشهر ، اشنویه و بوکان فرامی‌گیرند و نیز در زمینه تحصیلات رسمی ، دیپلم مدرسی منقول را از مؤسسهٔ دارالفنون تهران ، دیپلم ششم ادبی را از شهرستان زنجان و مدرک لیسانس در زبان و ادبیات عرب را از دانشگاه تهران ، اخذ می‌نمایند و با تسلط بر سه زبان عربی ، فارسی وکردی ، در صدا و سیمای مرکز کرمانشاه مشغول به کار می شوند و از عهدهٔ ترجمهٔ این زبانها بخوبی برمی‌آیند . استعداد خدادادی و موهبت سخنسرایی استاد محمدپور ، خود بحث دیگری است .

ایشان دارای سروده‌های لطیف و خیال‌انگیز می‌باشند . پنداری که طبع روان ایشان در لطافت اشعار ، از چشمه‌سارهای جوشان و آب زلال کوهساران زادگاه خویش ، کردستان ، سیراب شده است . آنجاکه دست نوازشگر نسیم سحرگاهی از لابلای برگها و شاخه‌ها ، برگی را به آهستگی جدا ساخته ، در آب چشمه رها می‌سازد تا همچون قایقی کوچک و سرگردان شناور بر امواج ، بازی سرنوشت را پی گیرد . استاد ، سیمایی موقر و آرام دارند ، در نخستین برخورد ، آثار صداقت و درستی از نگاهشان خوانده می‌شود که از یکرنگی و صفای درون ایشان حکایت می‌کند . باکمال تأنی وگشاده‌رویی هر سؤال را پاسخی شایسته و درست می‌دهند . صبور ، متواضع و آرام هستند ولی در عین حال به تبعیت از خوی عشایری و تسخیرناپذیر خویش ، در مقابل ستمگران زانو نمی‌زنند و همچون دریائی طوفانی و

یا کوهی فرازمند و آتشفشان برخصم تاخته و با دلایل محکم و مستند او را مغلوب می‌سازند. گویی غرور علم چنین اقتضا می‌کند که مردان خدا و عالمان وارسته، جز در برابر حق و حقیقت تسلیم نشوند.

تألیفات استاد محمدپور، متعدد و افزون از حد توصیف است. این بار قلم توانا و طبع وقاد را در تصحیح دیوان «شیخ احمد کور» - شاعر روشندل و شیرین سخن کرد - بکار بسته و حق مطلب را چنانکه شایستهٔ مقام شاعری چون اوست، ادا کرده اند.

آنچه در مورد این شاعر بی‌همتای کرد، شگفت‌انگیز می‌نماید این است که چگونه تصاویر بدیع و خیال‌انگیز طبیعت به خامهٔ سخنوری که از نعمت بینایی محروم بوده‌است، در قالب اشعار موزون شکل گرفته و جاری شده‌است. بی‌تردید جهان‌آفرین پاک، قدرت و نیروی خلاقه‌ای به وی عطا فرموده که بجای داشتن چشم ظاهر، از چشم باطن بهره‌مند شده، آنچه را که در عالم اندیشه احساس می‌کند، با نهایت زیبایی در پردهٔ خیال به تصویر کشیده‌است. شیخ احمد در جهان دیگری سیر می‌کند، به موجودات بیجان، جان می‌بخشد و طبیعت در چشم او، دور از دستبرد تمدن ماشینی و تلاش ویرانگر بشر امروزی است.

توفیق روزافزون استاد محمدپور ارجمند را در راه رسیدن به آرمانهای والای انسانی و پیشبرد مقاصد ارزشمند فرهنگی، از درگاه ایزد متعال خواستار و امید آن دارم که نخل پربار وجودشان از دستبرد حوادث ایام مصون و همواره سایه‌گستر و بردوام باد.

دکتر مهیندخت معتمدی

سه‌شنبه ۱۳۷۷/۷/۷ - تهران

بەناوی خوداوەندی گەورەو دلۆڤان

## چەند خاڵێکی گرینگ و ، بەرچاو لە ژیانی
## ماموستا « عەزیز موحەممەدپور » دا

لەم وینە ویشکانێە بەر بلاوو ، فراوانەدا ، کە بە ناوی « هیند » خۆی لە دڵی ئوقیانوس دا جێگردۆتەوە ، بە نێوی ولات و، سەرزەوی حەفتا و دو ، کۆمەڵ ، ناو دێر بۆوە . هەروەها لە ولاتە هاوسایەکەشیدا ، واتە « پاکستان » ، کە ئەمیش لەوە پێش ، هەر بەشێک بوو ، لەو ولاتە . دەربارەی ولاتێکەوە ئاخەوتن دەکرێ ، کە ئافرەتە شەپاڵ و ، چاورەشەکانی ، هەر لە مێژەوە ، ناودێری هەمو ولاتانی دنیان . واتە : قسە لە ولاتی « کشمیر »ی دڵرفێن ، دەکرێ ، کە سەبارەت بە پەسندی ئەو گوتراوە :

ئەگەر بێتو ، بەهەشت لەم زەوییە دابێ
ئەوە « کشمیر »ە ، هەر دەشبێ وەهابێ

راستە « کشمیر » گەلێک جوان و ، زرافە ، بەلام ئیمەش وێنەی ئەو بەهەشتە خشپیلاتەو، رازاوەمان لە رۆژاوای ئیران ، دا هەیە . بەهەشتێکی ئەوتۆ ، کە هیچ بینەرو ، گەریدەیەک ناتوانیە بەلایا بڕواو ، سەری کڕنوشی سەرسامی لە بەرانبەر ئەوهەمو جوانێە شورشتی و ، خودا پێداوییدا ، دا نەنوێنێ و ، دەستی رێزی بۆ بەسینگەوە نەنیەو ، سوپاسی خوداوەندە خوڵقێنەرەکەی نەکاو ، بە سەر سوڕماویێوە نەڵێ : گەلێک سوپاس ، بۆ بەزەیی و ، دڵۆڤانی یەزدانی مەزن ، کە چۆن ئەم گشتە پیت و ، بەرەکەت و ، رازاویەی بەم ناوچەیە بەخشیوە .

بێگومان گوندو ئاوایەکانی رۆژئاوای ولاتی ئیران بەتایبەتی ، کوردستانی (ئازیز) هەموی سەرسەوزو ، خەیاڵ بزوێنن،لە هەر کەش و ، بەشێک لە چوار کەش و ،

بەشەکانی ساڵدا ، حاڵ و هەوالیکی تایە بەتیان هەیە .

ئاشکرایە یەکێک لەم ئاواییە خۆش ئاوو هەواو دڵگرانە ، ئاوایی « حاجی لەک »ی ناوچەی « چۆمی مەجیدخان »ی هەریمی بەربڵاوی « موکریان »ی سەر بە شاری «بۆکان» و ، «نیوان دو ئاوان » ، واتە « میاندواو »ە ، کە بەراستی دیمەنێکی دڵگرو ، شاعیرانەی هەیە . قەڵپەزی ئاوی چەم و ، روبارانی ، دەگەڵ چریکەو جریوەی پەلەوەرانی ، ڕێگەی هەمو ڕێبوارێکی ، بەلەزو ، زیبڕی بەیانی و ، ئیوارانی دەبەز و ، لەز ، بردوە .زۆرجاری واهەیە ، پاڵەو سەپانو ، وەرزێرانی دورو نزیک ، بۆ حەسانەوە و پشودان ، خۆ دەگەیەننە ، سەر ئەم چەم و ئاوەو ، لە ژێر سێبەری دارە چنارو ، عەرعەڕ و ، پڕ بارەکانیدا ، بۆ ماوەیەک دەمێننەوە .

ماموستا « موحەممەدپور » ، لە رۆژی نۆزدەهەمی مانگی رەشەمۆی ساڵی ١٣١٩ هەتاوی دا ، لە نێو خێزان و بنەماڵەیەکی وەرزێرو ، صەنعاتکارو ، ئاییندا پێی ناوەتە سەر زەوی و ، چاوی هەستی هەڵێناوە . باواگەورەی بنەماڵە «وەستاشێخە» و باوکی ماموستاش - ئاورەحمان - بە بۆنەی پیرۆزیی لە دایک بونی ئەم منداڵ و ، کۆرپە ئازیزەی خۆیانەوە ،گویزە بانەیان گرت و ، ناویان نا « عەبدولعەزیز » . وەک ئەوە دەیان زانی کە ئەو کۆرپە ساوایە ، لە داهاتودا ، لە بارەگاو ، قاپیەی خوداوندی میری مەزندا ، دەبێتە کۆیلەکی بەردڵ و ، ئازیز و لەنێو کومەلگایەکەی خۆشیدا ، وەکو مرۆیەکی ، بەکەلک و دڵسۆز ، ماموستایەکی بە ئەمەگ و خزمەتکارخۆی دەنوێنێ .

ماموستا ئاورەحمان ، کە پیاوێکی گەلێک بەپارێز و ، ئازا و ، نەترس و ، بوێری کوردستانی موکریان بوە ،کوڕی وەستا شێخەی موحەممەد پور ، لە هۆزی گەورەی (( جەلالی - گەلالی )) کوردە .

ناوبراو ، بە هۆی خوو ، خدەی عێلاتیانە و سورشتی هۆزایەتیوە ، هیچکاتێک ، سەری بۆ زۆر و زۆرداریی هیچ فەرمانرەوا و زۆرداریک ، دانەدەنواند ( رقی دنیای لە دەرەبەگ و ، مەعموری دەوڵەتی بوو ) . هەر بۆیەش لەساڵی ١٣١٥ هەتاوی دا ،

ئاوایی « دارالەک »ی ناوچەی شارویێرانی مەهاباد ، بەرەو « حاجی‌لەک [1]»ی چومی مەجیدخان و ، هەر بەهۆی ناکۆکی لەگەڵ دەرەبەگی ئەوێش‌دا ، لە سالی ١٣١٩ دا بەرەو ئاوایی « گۆێگجەلی » ناوچەی مەرحەمەتابادی سەیفولقوضاتی قاضی و ، لە وێشەوە بۆ « ساروقامیش »ی سالاری میرزا فەتاحی قاضی ( ١٣٢١ ) ، « قەرە گۆل - ١٣٢٢[2] » ، « داشبەند - ١٣٢٩ » ، « عەولا تەپەسیی - ١٣٣٧ » و « وشتەپە - ١٣٣٧ » و

---

١-ناوی لەک و ، زەند ، کە لە سەردەمی فەرمانرەوایەتی کەریم خانی زەندەوە ( کە خۆی کوردی لەکی ناوچەی هەرسین وتویسرکانی کرماشان و هەمەدان و خەڵکی ئاوایی ترشمال ، بووە ) دوای تێک شکاندنی ئازادخانی ئەفغانی کە یەکێک بوو لە هەرە فەرمانفەرە ناودار و ئازاکانی نادرشای ئەفشار ، لە ئاذربایجان دا ، ماوەیەک خۆی و ، کۆمەڵێک لەم کوردە لەکانە ، وەک مەلازەند ( کە گۆرستانی نێوان ئاوایی دارەلەک و قزلقویی شارویێران ، هەر بەناوی ئەوەوە ماوەتەوە ) دارا ، لەک ( کە ئاوایی دارەلەک هی ئەو بووە ) و ، حاجی لەک (کە ئاوایی حاجی‌لەک و چناران ــ کەلبی رەضاخان : لە سەردەمی ئاغامحمدخانی قاجاردا ، کەلب عەلی رضاخانی فەرمانرەوایی ئەمان ، هاتە ناوچەکە ، ناوی چنارانی کردە کەلب‌عەلی رەضاخان . دیارە بە فەرمانی ئاغا موحەممەدخان ، کۆمەڵیکی زۆر لە خەڵکی کرمان و هۆزی لەک ، بە زۆر کۆچیان پێ کرا و ، لە شاری نێوان دو ئاوان ( زێرینەرۆ و زێوینەرۆ ) ، « میاندوآو » دا ، نیشتە جێ‌کران ، تەنانەت گەرەکەکانیشیان ، هەر بە ناوی خۆیانەوە بوو ، کە ئێستا هەمویان خۆیان بە ترک و هاونژادی جەنگیز خانی مەغول . دەزانن . نەوەشمان لەبیرنەچێ ، ئێستاش شێوەی ئاخەوتنیان ، دەگەڵ ئاخەوتنی کوردەکانی دیکە ، توفیری هەیە ، بۆ وێنە : خوێن بە خێن ، حوسێن بە حسێن ، قسە بە قوسە ، دلبەر بە دولبەر و ... ، کرک دەکەن ــ « داشبەندی »

٢ قەرەگۆل بە مانای گۆلە رەشە : هەلبەت ئەم ئاوایە هەر بە ناوی ئەم گۆل و ، زەلکاو ، قامیشەلانەوە ، کراوە کە لە بەرەوی ئاوییەکەدا ، هەلکەوتووە و ، بێ بەشی بەکۆەکانی « رەمول ئاتابلاغی‌عەلیابات » گیراوە و ( پاشماوەکەی ئەوبەرە )

پاشان «ئالی کەند ـ ۱۳۳۸ » ماڵ و ئاژاڵ ڕەپێچەک دەدەن و ، باروبنە دەپێچینەوە ( دیارە لە ساڵی ۱۳۳۸ هەتاویەوە تا ساڵی ۱۳۵۲ کە لە پایزی ئەم ساڵە دا عەمری خودا بە جێ دێنێ و ، لە گۆرستانی شێخ صەفی دا ، دەنیژرێ ، هەر لەوێ بۆهەمیشە دەمێنێتەوە ).ئاشکرایە ناودێربونی ماموستا عەبدولعەزیز موحەممەدپور «بە «داشبەندی » هەر لەبەر ئەوە بوە کە بنەماڵەکەیان چەند ساڵ لەم ئاوایەدا ، ماونەتەوە و هەر لەوێشەوە ، چووە بۆ خویندنی نێو فەقێتی .

سەردەمی منداڵێتی ماموستا زۆر خۆش و بە دڵ نەبوە . چونکو لە هەوتی فامین و چونە بەرخوێندنەکەیدا ، دایکی بە بەزەیی و زۆربە و دڵۆڤانی ، واتە مەلازادە روقیا (کچی قاضی مەلا رەحمانی بنو عەباسی ) لە ساڵی ۱۳۲۸ی هەتاوی دا ، لە ئاوایی قرەگۆل دا ، کۆچی دوایی دەکا . کە ئەم روداوە دڵتەزێنە ، ئێستا و ئێستاش وەک نەخۆشێک پێوە نوساوە و هەر ئازاری دەدا .

بەڵام دەگەڵ ئەوەشدا لە سەر فەرمانی باوکی ، وە بە یاریدەدەریی خوداوەندی میری مەزەن ، هەست و مرخ و لێهاتویی خودا پیداوەیی خۆی ، وەکار دەخا . پێی نێبران و جەغتی خۆی دەنێتە رچەی شوێن کە وتنی خوێندن و دەستی لێ هەڵناگرێ.

ئەو خویندنە کە لە ساڵی ۱۳۲۶ هەتاویدا لە حوجرە و زانستگەی ئاینی

---

لای باکور و،باکوری رۆژهەڵاتەکەشی ناواڵەیە . دیارە ترکەکان بەنیکرایی لە تاتارەوە تا دەگاتە غوز و سەلجوقی و مەغول،نزیکەی دوصەد ساڵی رەبەق ناوچە کوردنشینەکانیان داگیر کرد بوو ، وە بە پێی داب و نەریتی خۆیان ، ناوە کوردیکانیان هەڵدەگێراوە و ، دەیانکردنە ترکی ، ناوی گولە رەشیشیان وەک کەژ و کێو و ، چیا و روبار و ناوچەکانی دیکە ، گۆری . ئەوە لە لایەکەوە ، لەلایەکەی دیکەشەوە چونکو ئەم ناوە گۆراوانە بۆ ماڵیات و پیتاکی مری دەنوسرا ، هەر بەم جەشنە بەزەق و زیندوبەنی مانەوە و ، ناوەبروە کوردیکانیش لەبیر چوونەوە .

« موحەممەدپور ـ داشبەندی »

«قەرەگوڵ » دا ، لە خزمەت مامۆستا ملا محمود سالکیدا ، دستی پێکردبوو ، هەتا گوڵستان و بۆستان و نامیلەکە سەرەتاییەکانی زاکونی صەرف و نەحوی عەرەبی ، رۆییشتبو و پاشان ماڵیان چو بۆوە « داشبەند » سەر لە نێو و دوای دو ساڵ خویندن ، لە ئاوایی داشبەند ، بەرەو قەرەگوڵ گەڕاوەتەوە ، وە تا سالی ١٣٣٠ هەر لەوێ بۆوە . ئەوساگەڕاوەتە بۆ داشبەند و ماوەیەک لە خویندن تەرەکەمە دەبێ . تا ئەوەی لە پایزی سالی ١٣٣١ دا ، بۆ درێژەدانی خوێندنەکەی ، دەچێتە شنۆ ، لاجان ، مهاباد ، قەباکەند ، قەرەگول و بە دەیان جێگەی دی ، وەک بۆکان ، سەقز ، بانە ، مەریوان و ... ، وە لە خزمەت مامۆستایانی چازانی وەک مامۆستا مەلا حەمەد ئەمین قاجری دا ، کە خۆی یەکێک بۆوە لە قوتابی و خویندکارە ناودارەکانی جەنابی مەلای کۆ ( مەلا موحەمەدی گەورە ) بەچۆک دا ، دێ و ، کەلک وەردەگرێ.

دوای ئەوانە ، دەچێتە زۆربەی ناوچە کوردنشینەکانی تری کوردستانی ئێران و عێراق و ، لە خزمەت مامۆستایانی وەک مەلا موحەمدی ڕئیس - دەرس وێژەوەی گەلاڵەی شینکایەتی سەربە شاری « ماوەت » ، مەلا سمایلی « پێنجوێن » ، حاجی مەلا باقری « بالیک » ، حاجی مەلا سەیەد عەلی « نێبی » ، حاجی مەلا جەسیم « قەباکەندی » و ، زانای هەرە ناودار ، مەلا عەلی وەلزی ، حاجی مەلا موحەمەد وەلزی ، حاجی مەلا حوسین مەجدی و ... ، دا ، زانستەباوەکانی سەردەم وەک : مەعانی ، بەیان ، بەدیع ، مەنطیق ، حیکمەت و فەلسەفە ، کەلام ، ئوصولی فیقە ، تەفسیر ، هەیئەت ، ئەدەبیاتی عەرەب و ... ، زۆر بە باشی دەخوێنێ و ، پاشان بە پێی داب و نرێتی فەقێیەتی ، ئیجازە نامەی ماموستایەتی لە ساڵەکانی ١٣٤٠ و ١٣٤١ لە خزمەت مامۆستا مەلا باقر و مەلا سەید عەلی دا وەردەگرێ و ، بۆ خویندنی زیج و ئوسطرلاب و هەیئەت ، دەگەڕێتەوە ناوچەی موکریان و ، دەچێتە خزمەت مەلا عەلی وەلزی لە ئاوایی حەمامیانی بۆکان . ئەوانە تەواوناکا، لەلایەن ڕژێمەوە دەگیرێ و دەخرێتە بەندیخانەی « قزلقەلعە » سورەقەلای تارانەوە . دوای ڕزگار بون ، دێتەوە ئاوایی « ئالی

کەند » و سەر لە نوێ بۆ ماوەی چەند مانگێک دەچێتەوە مەهاباد و پاشان ئیجازە نامەیەکیش لە خزمەت ماموستا مەجدی ، حوسینی و ، وەڵزی ، وەردەگرێ کە دەربارەی فتوا دان ، دەرس گوتنەوە ، ئیجتهاد و ... ، لە سەر مەذهەبی ئیمامی شافعی یە و ، ئێستا لە پێشەکێکەی کتێبی « فیقهی شافعی » دا ، دەبیندرێ .

دوای ئەوانە شایەد نامەی دیپلۆمی مودەررسیی مەنقول ، لە « دارالفنون »ی تاران ، دیپلۆمی ئەدەبی لە شاری زەنجان ( ژەنگن ) وە هەر وەها ، لیسانس ( ماجستر ) لە زمان و ویژەی عەرەبدا ، شایەتنامەی توانایی دەرس گوتنەوەش لە زانستگاکان دا ، هەر لە زانستگای تاران بەشی زبان و ، وێژەی عەرەب ، وەردەگرێ و ، هەر لەویش ماوەیەک دەرس دەڵێتەوە .

ماموستا دەستەڵاتیکی تەواویشی بە سەر زاراوەکانی کوردی ، زمانی عەرەبی و تورکیش دا هەیە و ، هەموویان پێکتر وەردەگێرێ . ماوەیەک لە کرماشان بە ناوی وەرگێری زمانی کوردی ، عەرەبی و ، فارسی ، لە رادیۆ دا ، کار دەکا . سەرەرای ئەمانەش ، لێهاتویی خودا پیداوەیی ئەوان جۆریکە لە وتەدان و راوێژکردن (خوطبە دان ) و نەترساندا ، جیگەی سەرسورمانە .

ناوبراو ، سەرەرای نوسینی پەخشان و ، وتار ، خاوەنی گەلێک هۆنراوەی جوان و هەست بزوێنە . هەر دەڵێی مرخ و هەستی بێخەوش و رێک و پێکی ئەوان ، ئەم هۆنانەی لەو سەرچاوە و ، کانی و چەمە زولاڵ و پاک و خاوینەی کە لە چیا بەرزەکانی زێدە خۆشەویستەکەی هەڵ دەقولێن و دڵی کەژ وکۆ و ، دانیشتوانی لە غەم و پەژارەی تینوایەتی رەزگار دەکەن ، هەڵینجاوە . کە شنەبای بەرەبەیانی ، زۆر بە ئەسپایی لک و خەڵفە شلک و نەرم و نۆڵ و گەڵاداره ساواکان دەلا وێنێتەوە و جار و بارەش ، گەڵایەکیان بە دەم ئاو دا ، دەدا و وەکو بەلە مێکی گچکەڵانە دەکەوێتە بەر تەوژمی شەپۆلەوە و وێنەی لێ قەوماو و ، ژێر چەپوکەکانی دنیا بەولا و لادا دەرێ و شانۆی بەسەر هاتی ئێمەی کوردی پێ نیشان دەدەن .

مامۆستا دیمەنێکی یەجگار زۆر ئارام و لەسەرەخۆ و ، پیاوانەی هەیە . هەر لە یەکەمین کۆ بوونەوە و تێ هەڵ ئەنگوتنی دا ، نیشانەی راستی و دوروستی لە روانینی سەرەتایی دا ، وەک نوێنەرو نوێنگەیەکی راستەقانی دڵ و دەرون پاکی ئەوان خۆی دەنوێنێ . کاتێ پرسیارێکی لێ دەکرێ ، گەلێک بە هیدی و لە سەر خۆیی ، بە رویەکی ئاواڵە و خۆشەوە ، وڵام دەداتەوە . زۆر خۆ راگر و ئارام و تا دڵت دەخوازیە ، خۆ بە کەم زانە .

دەگەل ئەوەشدا ، بە پێی خو و خەصڵەتی عەشایری و ژێر باری زۆر نەچونەوە ، هیچکاتێک لە بەرانبەر زۆردار و چەوسێنەرەوەکان دا ، سەری دا نەنواندوە و هەرگیزیش دانانوێنێ . لە بەربەرەکانی و لەبەر یەکدا راوەستانی دژو نەیاران دا ، دەچەقێ و ، وێنەی دەریایەکی خورۆشان یان باشتر بڵێن ، وەکو کێوێکی ئاگرپژێن ، رودەکانە خەنیم و بە دەمی دا دێتەوە و بە بەڵگە و سەنەد ، بەر پەرچی دەداتەوە و لە مەیدان وەدەری دەنیە . وادیارە غوللوری زانست ، هەر ئەوەی بەشوێنەوەیە ، کە دەبێ پیاوانی خواناس و زانایانی هەڵکەوتوو ، بەم چەشنە تەنیا لە بەرانبەر حەق و حەقخوازی دا ، دەست ، دانە وێنن و زمان لە پلە نەترازینن ، ئەگینا ، سەر بۆ کەس نەچەمێنن و مل بۆ زۆردار نەنەوێنن .

نوسراوەکانی ماموستا موحەممەدپور ، لە هەمو بابەتەکان دا ، بەکوردی ، فارسی و عەرەبی ، گەلیک زورن و تا ئێستا چەند دانەیەکیان لە چاپ دراوە *.

ئەم رایە وادیارە نۆرەی قەڵەمی بەوزە و توانا و مرخ و هەستی رۆشنکەرەوەیان بەپێی لێ کۆڵینەوە و ساغکردنەوە و راستە و پاستە کردنی شەرحی حاڵ و دیوانی شێخ ئەحمەدی کۆری موکریانی ، هۆنەری خواناس و شیرین زمان و قسە خۆشی رۆشنبیری کورد ، کەوتوە کە بەراستی بەم چەشنەی شیاوی پلە و پایەی

گەورەیی و مەزنایەتی ئەم ذاتە پیروزە بوّوە ، جو لاّوەتەوە و ئەرکی سەرشانی خوّی لیرّەشدا ، بە باشی و ماموستایانە ، بەجیّ هیناوە .

شیّخ ئەحمەد ئەو هوّنەر و هونەرمەندە ، سەر سورّ هیّنەرەیە ، کە زوّر بە سەر سامیّوە ، توانیوّیتی ویّنە جوان و خەیاڵ بزوینەکانی سورشت بە خامەی سیحراویی و ، دمەوەری و وتەبیّژی ئەویش ، بو ئەم ، کە لە روناکی چاوی رواڵەتی بیّ بەش بوّوە ، ئەئاوا ریّک و پیّک بخاتە قالبی هەڵبەستی خاوەن کیّش و پیّوانەوە .

بیّ سو و گومان ، بەدیهیّنەری عەرد و ئاسمان ، هیّزو توانایەکی وای بەم ذاتە بەخشیوە کە لە جیاتی چاوی سەر ، لە چاوی دڵ ، کەلکی وەردەگرت و ئەوەی لە دنیای بیرکردەنەوەدا هەستی پیّدە کرد ، زوّر بە جوانی و رازاوەییەوە لە پەردەی خەیاڵ دا وەکو کوّتەڵ دەرازاندەوە . شیّخ ئەحمەد لە عالەمیّکی دیکەدا ، دەگەرا . گیانیکی تری دەبەرگیانداران دەکرد . سورشت لە بەر چاوی دڵی ئەمان دا ، ماوەڵیکی زوّربە توّفیری دەگەڵ شارستانیّتی ماشینی و ، هەوڵ و ، تەقالای ویّرانکەرانەی ئەودا هەبوّوە .

لە کوتایی دا ، سەرکەوتنی روّژ بە روّژ ، پتری ماموستا « موحەمەدپور »ی بەریّز ، لە ریّگەی گەیشتن بە ئامانج و ئارەزوە بە دڵ و بەرزەکانی مروّڤایەتی و بەرە و پیّش بردنی هیوا بەرز و بە کەلکە کەلەپورە ویّژەییەکانی گەل ، لە یەزدانی مەزن داوەخوازی دەکەم . بە هومیّدم داری پرّبار و بەرزی هەبونیان ، لە دەستدریّژی و روداوەی روّژگار بە دور بیّ و هەروەها بە سیّبەر و بەرکەسەر و بە دەوام بمیّنیّتەوە*

۱۳۷۷/۷/۷ هەتاوی
۷ی گەلاّریّزانی ساڵی ۲۶۱۰ ک

* ئەم پیّشەکیە ، وەرگەراوەی پیشەکیی دوکتور مەهیندوخت موعتەمەدی کوردستانیە کە لەلایەن سیامەند و ، گولالەی موحەممدپورەوە ، پیک هاتووە . بە هیوای خزمەتی زیّدەتر .

## تێ هەڵچونەوەیە ک:

پاش ئەوەی ئە م کتێبە، لە ساڵی (۱۳۶۹)ی کۆچی هە تاویدا، بۆ ماوەی ۱۵ رۆژی رەبە ق، لەلایەن، مامۆستای هێژاو، چازانو، هەمیشە زیندو مەوە (مامۆستا هەژاری رەحمەتی) کەوتەبەر پێدا چوونەوەو، پەڵە وهەڵە هە ڵگرتنەوەو، راستەو، پاستە کردن، درا، دەست پیت چن (حروفچین) بۆئەوەی بخرێتە ژێرچاپەوە، بەلاّم هێشتا پیت چنینە کەی، تەواو، نە بوو، بوو، یەکێک لە کتێبفرۆش و، کتیبێ خەڵک بەنی خو، زانەکانی ولاّت.[1]

وەک بە لاّی لابەلا، لەناکاو، لیّم پەیدا، بوو، داوای دیوانەکەی لێ کردم، بۆئەوەی چاپی بکا، دیارەبەرسفی نەرێم، پێداوە، بەلاّم رویلێ نامو، بەڵینی لێ ساندم، بۆئەوەی زیانی ماڵی لێنەکەوێ، من دەست راگرم، تا، کتێبە کەیئەوان کە، بە گوتەی خۆی پیت چنی کرابوو، کە وتبۆە ژێرچاپەوە، دێتەدەرێ. دیارە، ئەم چاپە هەر چاپ

---

۱ ـ بەتایەبەت هی براو، مامۆستاو، نوسەرو، زانا کوردەکانی کوردستانی ئەو دیو، کە بەبێ‌سێ و، دوو، لێ کردن و، دەبە رچاو گرتنی حەلاّل و، حەرام، سەرلە نوێ چاپیان دەکە نەوەو، ئەرک و ما فی خاوەنە کانیشیان بە فیرۆ، دەخەنە، ژێر لیچەوە، دیارە هێندێکلە خاوەن گۆڤارو، چاپە مەنێ، سەر بە میرێیە کانیش هەرئەم رە چە، چەوتەیان، رەچاو، کردۆەو، بەدەیان کتێب و، نامیلکەیخەڵکیان، لەچاپ داوەتەوەو، مزەو، بەرهەمەکەشیان، ناوەتە نێو گیرفانی خۆ یا نەوە، هەڵبەت ولاّمی ئەم چەشنە ئاکارە، نالەبارانەش نیازی خەڵکە؟!

ئاشکرایە، ئەگەر، لەدزە کەلو، پەلبە رو، مال بڕو، داهاتو، سامانی خەڵک بە فیڕۆ، خۆرە کانیش، پرسیار، بکرێ، هەرئەو، ولاّمەدە دەنەوەو، بە خەیاڵ، خۆیان لەتۆڵەێ دەستی قاضی دین و، ئایین و، شتیدیکەش، قوتار، دەکەن؟!

بوو، تانەوەی لە سەرە تای سالّی ١٣٧٢، دا، دۆستێک بە رگێکی، لەم دیوانەبۆ، ناردم، بەم پێیە، قۆرت و، تەگەرە، کەوتە، پێش چاپکردنی دیوانەکەی ئێمەوە. کە هەرلاپەرەیەکی بە (٢۴٠) تمەن بە کام پی‌سێت لێ زێڕ پیتچنی کراوەو، لەو ساوە تائێستا، ماوەتەوە: لەدەر فەتێکا، بە پێی خوو، خدەی خۆم، سەرلەبەری کتێبە کەم خوێندەوە، بەراستی زۆرشتی سەیرو، سەمەرەم، دەربارەی بەسەر هاتو، باری ژیان و، چەشنی خواپەرستی‌و، تەرزی بوون بە هۆنەرو، تەف بە زارا کردن‌و، تۆبە، کردن‌و، شتی وای شیخ ئەحمەدی کورو، گۆڕێنی زۆرێەی، ئەو، ووشەو، هەڵبەستانەی بیرو، باوەڕی ئەمیان رون کردۆ تەوەو، قرتاندنی چەن پارچە هەڵبە ستێک لەدیوانە کەو، درانە پاڵ هۆنەرا نی دیکەی ناو، ئەحمەدەوە، و چەن مەبەستی تر، وەبەرچاو کەوت. بە چە شنێکی وا ئەگەر بمەوێ لەسەرهە مویان بدوێم، مەثنە و یێکی هەزارمەنی گەرەکمبە لاّم لانی کەم پێویستە ئامازە بۆچەن خاڵ، لەم گشتە خاڵە گرینگانەبکەم‌و، بە کورتی‌لەسە ریان بڕۆم، و ئەوانی کەش هەڵگرین بودمر فەتێکی تر، و، هێندیکێشیان حەواڵەی ناوەرۆ کی ئەم بە سەرهاتە بکەین، کەلەنێو دیوانەکە دا، هێنامەو، مامۆستا (هەزار) یش، بەسەریدا چۆتەوە.

## خاڵەکان:

١: تۆبە کردنی شێخ ئەحمەدی کۆر، بە لای (شێخ حسن، قەرە چیواریّ) وە.[1]

وەک ژياننامە نووسەکانمان، نووسیویانە، ئەم ذاتە لەسالّی ١٢۶۴ی کۆچی مانگیدا، هاتۆتە دنیاوەو، لەسالّی (١٣٢۶) شا کۆچی دوایی کردوۆە: واتەکانی شێخ ئەحمەد لەتەمەنی ٧۴ ساڵیدا بوۆە شێخ حەسەن پێ ناوەتەسەر عەردمئاشکرایە عەقلّ ئەوە نابرێ، پیرە پیاوێکی ٧۴ ساڵە، ماتە هەڵگرێ و، چاوەڕوانی پێگەیشتن‌و، بە خۆدا هاتنی کۆرێەیەکی تازەلەدایک بوو، بێ‌تابە خۆیا بی‌و، بیێتە رێ بەرو، رێی نیشاندەر. ئەوساکە بە کوێرو کوتری‌و، لەرزە لەرز، بچێتە لای‌و، تۆبەی لەسەردەستی بکا:! ئەوە کە گوتمان لەوکاتە دا، تە مەنی شێخ ئەحمەد ٧۴ ساڵ بۆوە، بەم پێیەیە:

---

١ ـ ئاواییەکە، لەنزیکەی شاری (کەرکوک)ی سە ریە کوردستانی ئەودیو.

ئەگەر تەمەنی شێخ ئەحمەد ٨٥ سال بوو بێ و، لە سالی ١٨٥٦ ی زایینیدا، وەفاتی کرد بێ [وەک ماموٚستانە مین ئەفەندی نووسەری نوٚ سکورمانی ئە لمانی دەلێ] وەبە گوێرەی هەلبە ستە کەی خوٚشی (شێخ ئەحمەد) [چووٚە لە هیجرەت یە کهەزارە دو صە دو، شەصتِو، بە داج] یان بواج،[1] کە بەحیسابی ئە بجەد، دە کاتە سالی ١٢٧٠ یان ١٢٧٢ هـ. ق دەبێ سالێک یان ٣ سالٚ دوای گوتنی ئەم هەلبە ستە: [١٢٧٣ هـ. ق] وەفاتی کردبێ و، لەسالی ١١٨٨ هـ. ق پێشاە هابتێتە دنیاوە [١١٨٨ ـ هـ. ق ١٢٧٣ هـ. ق] [١٧٧١ ـ ز ـ م ١٨٥٦ ـ ز ـ م]

ئەگەرتەمەنیشی (٩٥) سالٚ بوو بێ و هەرلەسالی (١١٨٨) دا هاتبێتە جیهانەوە، دەبێ لەسالی ١٢٨٣ هـ. ق، و ١٨٦٦ ز، دا کوٚچی دوایی کردبێ، خوٚئەگەرتەمەنیشی (١٠٥) سالٚ بووبێ دەبێ لەسالی ١٢٩٣ هـ. ق، و ١٨٧٦ ز ـ م دا، وەفاتی کردبێ، ئەگەرتەمەنی (١١٥) سالٚ بووبێ، کە زوٚریەی نووسەرەکان لایان وایە، دەبێ لەسالی [ ٥ ـ ١٣٠٤ هـ. ق، ٧ ـ ١٨٨٦ (ز)] دائەم جیهانەی جێ هێشتبێ و، روی کردبێتە جیهانی پەسلانەوە.

دیارە ئەم سالە، لەگەلٚ سالێ وەفاتی کاک ئەحمەدی سولەیمانیدا یەک دەگرنەوە [١٢٠٨ هـ. ق ١٣٠٥ هـ. ق]

وەهەربەم لێکدانەوە یەش ناکرێ بە لای کاک ئەحمەدیشەوە توٚبەی کردبێ و، بوو، بێتە دەرویش شێخ ئە حمەد:

سەرەڕای ئە مانەش، هەروەک ماموٚستا قاضی خضری ڕای گەیاندوە و، ینمەش لەشوێنی خوٚیدا، ئامازە مان، بوٚ کردوٚە و، خودی شێخ ئەحمەدیش، لە پارچە هەلبە ستێکیدا، دەری بڕ یوە، ئەویندارو، نوٚ گری مەولاناخالید بوٚە [١١٩٣ هـ. ق ـ ١٢٢٤ هـ. ق] تە نانەت لە پارچەیەکی، کەدا، لایەنگریی و، هەستی خوٚشەویستی خوٚی، سەبارەت، بە سەید (طەها) و، شێخ (عوبەیدیلا) ش کە لەسە ر رەوشتی مەولانا خالید (نە قشبەندی) بوون، دەر بڕیوە. وەک لەجێگەی خویدا، رامان گەیاندووە. زور، وێ دە چێ، سەید طەها و، شیخ ئەحمەد، لە (بە غدا) یان

---

١ ـ لەبرێ، نور سراوەدا، لەبری (بداج) ووشەی (بواج) هاتوٚە، بە لاٚم هەر وە کو شێخ ئەحمەد خوٚی لەهەلبەستی دوایی دا، ووشە کە دویاتە، دەکاتەوە، (بداج) راستە، و، بواج چەوتە.

(سولەیمانی) دا، چاویان پێک کە وتبێ و، هەرئە و یە کتر، ناسینەش بوو بێتە هۆی ئەوە، کە شێخ ئەحمەد سەرئە نجام بە نابە ڕێتە بە ر، خانە قای نە هری.

ئەوەش ئاشکرایە. مەولانا خالید، بە هۆی ناکۆ کی لەگەڵ تا قمێ دەر ویش و، لایەنگرە کانی شێخ (مەعروف) نۆدێی [باوکی کاک ئەحمەد] شاری سولەیمانی بۆ هەمیشە جێ هیشت و، لەئاکاما، [١٢٢۴ هـ. ق] لەولاٌتی غەریبایەتیدا (شام ـ سوریە) بو هەتاهە تایە سەری نایەوە، دیارە شێخ ئەحمەدیش هەرلە دەست تا قمێ دە روێش و، ووشکە صۆفی و، کوڵکە مەلای شاری (سولەیمانی) و، دەورروبەر رای کردوۆە و، بە نای بردۆ تە شاری (کۆ) و، لەژێر چاوە دێری حاجی مەلا عبداللّە، جەلەیی کە هاواڵ فەقێ و، دۆستی کاک ئەحمەدی سولەیمانی و، شێخعەلی کە رکوک بوو[١] و، حەمە ئاغای بەناوبانگی کۆ، دا ماوەیەک دەحەسێ تەوەو، چەند مانگێکیش بە ناوی مەلا ئەحمەدە کۆرەوە دەنێردرێتە ئاوایی (ئۆمەر گونبەت).

هەڵبەت لەۆێش، ویێ هەڵ نا کە نو، ئەنجا، روو، دەکاتە خانە قای (نەهری) و، تا دورخستنە وەو، وەفاتی شێخ (عبیداللّە) بۆ طائفی لای (مەکّە)[٢] هەرلەوێ دەمێنێتەوە.[٣]

٢: بون بە حاجی: شێخ ئەحمەد نە چۆتە زیارەتی ماڵی خودا و، خزمەتی حەضرەتی رەسوڵی ئەکرەم(ص ع) وەئەم هەڵبەستەی بۆتە هۆی بە هەڵە چونی ئەم مەبەستە، گۆڕدراوەو، راستەکەی لە دیوانە کەدا، یە. دیارە زۆرکەسیش ئەمیان دە گەڵ حاجی کاک ئە حمەدی سولەیمانیدا، لێ گۆڕاوە.

٣: پارچە هەڵبەستی [یارَسُولَ‌اللّٰهْ ذەلیل و، دڵ حەزینم رەحمەتێ] وەک لەلاپەرە کانی (١٠١) تا (١٠۴) دیوانی مامۆستامە لا عبدالکریم رەباتی (١٩٢٧.ز) شدا هاتوۆە. بە ناوی مامۆستا حەمدی[٤] دراوەتە قەڵەم و، کراونە تەپێنج خشتەکی.

---

١ ـ باوکی جەنابی مە لاو، با پیرەی مامۆستا مەسعود موحەمەد.
٢ ـ لە کۆتایی صەدەی سێزدەهەم و، سەرەتای صەدەی چاردەهەم. [١٣٠١ هـ. ق] دا.
٣ ـ بۆباشتررون بونەوەی ئەم مەبەستەو، باری ژیانو، هەڵوە دایی شێخ ئەحمەد، سەرنج، بدەنە ئە و پێشە کیەی لە (دیوانە کەدا نورسیومە).
٤ ـ ئەحمەد بە گی کوری فەتّاح بەگی صاحیبقران. [١٢٩٥ هـ. ق ـ ١٨٧۶ ز] ١٣٥٥ هـ. ق ـ ١٩٣۶ ز]. زوریش رێدەچێ مامۆستا حەمدی هەر لاسایی ئەحمەدی کۆری کردبێتەوەو، لەبەر، هەڵبەستە کەی ئە مانەوە هەڵی گر تبێتەوە:

هەڵبەت، توێفیرێکی بە رچا ویش لەنێوان ئەوەکەی ماموٚستا (رەباتی) و، ئەمەکەی مندا، دەبیندرێ. دەگەڵ ئە مەشدا، لەوێشا ناوی (ئەحمەد) هاتووە ئە ک (حەمدی) کە نازناوی ماموٚستا ئەحمەد بە گ بوٚوە و، لە هەڵبەستە کانیدا هێنا وێتی بە لاّم هە روە ک لەولاّ می ماموٚستا (جەمیل روٚژ بە یانی) دا، کە لایان وا بوو، ئەم پارچە هەڵبەستە هی ئە حمەد موختار بە گی جافە [۱۳۱۶ ـ ۱۳۵۳ هـ. ق] گوتم، بەپێی ئەم نووسراوەی بە لای منەوە هەیە، لەساڵی (۱۳۱۱ هـ. ق) دا لەشاری (کە رکوک) ئەم هەلبە ستانە بە ناوی ئەحمەدی کوٚرە وە تو مارکرا ون کە ئە وساکە تە مەنی ئەحمەد بەگی جاف پنج، ساڵ بوٚوەو، تەمەنی ماموٚستا حەمدیش، لەو، سەردە مە (۱۳۱۱) دا ـ (۱۶) یا (۱۸) ساڵ بوٚوە.

هەر، وەک عەقل نای بڕی هی ئە حمەد موختار بە گی جاف بێ،ناشی بڕی هی ماموستا حەمەدی بی. بە لاّن، چونکو لەسە ردەمی ناودە رکردنی ماموٚستا حەمدی دا کە بە هوٚی خوٚشە ویستی خوٚی و، باوکی وە [فەتاح بە گی صاحیبقران] بە لای شێخ مەحمودی ئە مرە وە، دەنگی دا بووە، لەلایەکی کە شەوە بلاّ و بونەوەی هەڵبە ستە پڕ نرخەکانی بەنێو، خەلکدا بێوە هوٚی پترناسینی، لەم لاشەوە ئە بونی کەسێکی وا کە بتوانێ ناوێک لەئە حمەدی کورو، هەڵبەستە کانی بێنیو، ئەوەش، کەبوٚ، ئە هاتیش، ناوی حەمدیش هەر ئەحمەد بووە هەلبەستەکانی ئە میان داوە تەپاڵ ئە وانە وەوە ئە وش کە ماموٚستا یەکی وەک (ڕە باتی) ش، کردونیە پێنج خشتەکی و، لە چاپی داون و، بە نێوخە ڵکدا، بلاّوی کردونە تەوە، دەستیان، داوەتەیەک بوٚئە وەی ناوی حەمدی (ئەحمەدی صاحیبقران) یان بە سە ردابڕێ و، ناوی (ئەحمەدی کوٚر) یان، لەسە ر، بسرێتە وە.

۴: ئەوهە لبە ستانەی دراونە تە پاڵ شێخ ئەحمەدی شێخ بابە وە:[۱] ئە وەی زوٚر جێگەی سە رنجە، ئەوەیە، هەروەک لەماموٚستای بە رێزو، چازانی خوٚم، خودا، لێ

---

۱ ـ [دیارە من تائێستا ئەم ذاتەم، بوٚ، نە، ناسراوە هەڵبەت زوٚریشی بە شوێندا، گە راوم، تە نانەت کاتی خوٚی لە ماموٚستا (هەژار) یشم‌پرسی و، ئەم و وایانەش، پرسیارم، لەکاک ئەجمەدین ئەینسی کرد، بە لاّم، ئە یتوانی پێم بناسینی و، رونی کاتەوە، کێ بەو، چەن ساڵ دوای شێخ ئەحمەدی کوٚر بووە. تارونی کە ینەوە، ئاخوٚ، مزوٚلکەی، نورسە وەی ئەم چەشنە هەڵبە ستانە، دەگەڵ سەردە می ژیانی ئە ماندا، دیتەوە یان، نا؟].

خۆشبوو مامۆستا، مەلا عەلی وەلزی و، میرزا حەمەدەمینی حە مامیانی خزمی نزیکی شێخ ئە حمەدم بیست باو کی ئەحمەدی کۆر، ناوی شێخ مەلا موحەمەد، نیودێر، بە شێخ بابۆ، یان، بابا بوۆە.[1] دیارە شێخ ئەحمەدیش، لەکۆ تایی پارچە هە ڵبە ستیکا ئەم راستەقانی‌یە، دەر، دەخا، کە، دەلی:

ئەحمەدی شیخ‌باب،پدر،مەدحی نە بی‌خیر البشر

گەربوت تەواو بێ، (بی بەصەر) یئەمن لەخوفی‌مورتەعیب

کە وا بوو، دەکرێ ئەم وەیەک چونە، بوو بێتە هۆی ئە وە کە هێندێک لەهەڵبەستەکانی ئەحمەدی کۆر، بدرێنە پاڵ (ئەحمەدی شێخ باب) وە.

لەناکامی ئەم لێکدا نە وانەی، لە دیوانە کەدا، هێناومن، بە راشکاوی رێا، دە گەیەنم، کە ئەحمەدی کۆری [دهۆکو، زاخۆی] مامۆستا (هەژار) و، مامۆستا (بابامەردوخ) لاپەرەی ۱۵۷ ـ ج ـ ۱: مەشاهیری کورد، و مەلائەحمەدە کۆرەی مامۆستا فەیضی بەگ [مەلائەحمەدی ئومەرگونبەت] و، ئەوەکەی مامۆستا موحەمەدعەلی قەرە داغی و، هی‌کەش، هەرئەو ئەحمە دی کوری ئێمەن [ئەحمەدی کۆری موکریانی)، کە حاجی قادری کۆییش بە سندی دەڵێ:

[ئەحمەدی کۆر، لە سابلاغە: بەیتە کی باغە، بە یتەکی داغە] دیارە مامۆستا (هەژار) یش، بە هۆی پێدا چونەوەکەی و، باس لەسەر کردنمان. لە حوضور مامۆستا (روزبەیانی) دا.

مۆری راستی‌و، بێ‌گرێ و، گۆلیان، بە م مەبە ستانەوە، ناوە. پێویستە، ئەوەش بێژین: ئەگەر، ئەحمەدێکی کە ش لەوسەردەمەدا، ئەویش لەدەورو، بەری (کۆیە) دا هەبایە، بێ‌گومان حاجی قادر، کویێ، وەک شێخ ئەحمەدی کۆر، ئەمیشی دەخستە. نێو لیزگەی چامەی

[شاسواری بە لاغەتی کوردان]ە وەو، باسیی دەکرد:

۵: هەڵبەستی بەهارەو، شێخ ئەحمەد: بۆنەوەی بە باشی رون بێتەوە، کە هەڵبەستی (بەهارە) هەرهی ئەحمەدی کۆرە و، (شیرین تەشی دەرێسێ) ش، هەر، هی وەفایی (مهابادی)یە، پێویستە، سەرنج بدرێتە، ئەو، لێ توێژینەوەی کە، لەدیوانە

[1] ـ بودرێژەی ئەم مەبە ستە بروانە خودی دیوانە کە

کەدا، هێنا و مـە.

٦: کتێبی مەهدینامە: زۆربەی زۆری مامۆستا و، زاناکانی وەک خوا، لێ خوشبوو، مامۆستا عەلائەدین سەجا دی[1] و مامۆستا بابا مەردوخ کوردستانی، و، مامۆستا موحەمەد دعەلی قەرە داغی و، هی کە ش، ئەم کتێبەیان داوە تە پاڵ، مامۆستای، مامۆستایانی ناو دارو بلیمەتی کوردی وەک مەلاعەولای بێتوشی و، شێخ مەعروفی نۆدێ و، ابن الآدە می باڵە کایەتی ... واتە مامۆستا مەلاموحەمەد (ابنُ الحاج) سەردە شتی ئالانی وە، بە لام نە مەهەڵەیەکی رێگە شێوێنو، فیڵە بازانەی (باب)ە: واتە: پێغەمبەری داتا شراوی صەدەی نۆزدەهەمی کۆچی. من بە ش بە حاڵی خۆم، کاتێ دە مروانێ مامۆستا یەتی و، بەسە رهات و، زانستی، مامۆستا (ابنُ الحاج) کە دەیان زانا و، بلیمەتی وەک (بێ تووشی) پێگە یاندوە. سەرم سوڕ، دە ما: چۆن دەکرێ ئاش و، دۆ کولێو، حەوت ترینگەیە کی ئاوا، کاڵ و، نە کولێو، پڕ، لەدڕوو، داڵ و، زیوانو، بڕوێشی تەژی لەزیزانەو، وورکە بە ردی کاکڵ و، واتاو، ووشەو رستە، بە ئاگری طە بعی زانا یە کی وە ک (اِبنُ الحاج) کولابێ و، نرا بێتە سەر ئاگردانی بیر، لێ کردنەوەو، هەڵ سە نگاندن و، پاشان کرابێتە دە فری هەڵبەستەوە و، لەبەر دەمی مامۆستا و، زانایاندا، دا، نرابێ؟! تا ئەوەی خوداو، راستان، لە کاتی روانینی ئەوێشەکێ بە نرخەی، کە مامۆستای هێژاو، بە رێز.

مامۆستا عَبْدالرئوف، نەقشبەندی ئالانی (بیژ، وەیی) لەسەر، کتێبی (رَفْعُ الْخِفاءْ شَرْحُ ذاتِ الشِّفاء) کەدە قە کە بەهەڵبەست هی شێخ موحەمەد جەزەری کوردە و، ژاڤە کەش هی (اِبنُ الحاج) و، برای بەرێزم مامۆستا (مەلاعبدالرَحمن یعقوبی) پاوەیی خاوەنی نە شری اِحسانی تاران، لە چاپیان داوە، لە لاپەڕەکانی ٢٠ تا ٢٣، دا، ئەم مەبە ستەم، بۆڕون بووە، کە چۆن میرزا حوسین عەلی نووری لەژێر ناوی نهینی.

(موحەمەد، دەرویش) دا، لە ئاوایی (سەرگەڵوو) ی لای ماوەت و، (شەدە لە)و، شوێنە کانی تری لای (سولەیمانی) و، ترا، ئەم بزوێشە کاڵ و، نە کولێوەی، بە

---

١ ـ [لاپەرەکانی ٧٣ ـ ٨٠ ـ دەقەکانی ئەدە بی کوردی یا نُصُوصُ الأَدبِ الکُردی چاپی ساڵی ١٩٧١ (ز) کۆڕی زایاری (بە غدا) لەگەل پێدا چونەدەی دوکتور، رەسول موصطەفادا]،

ناوی ده سپوختو، دەستاوی ماموٚستا یەکی وەک (ابنُ الحاجِ) دەر خواردی خەڵک داوه.

که وابوو، ئەم (مەهدینامە) یە فڕی بە سەر. زانا و، بیلمەتی
خواناسی کوردە (اِبنُ الحاجّ) وه، نه بۆوه و، ناشبێ.

ئەمەش وێنەیە کە لەم ئاشە شولەزەردە و، دو کولێوه، نه کولێوەی مام میرزا.

هەر دە مێنن أشْرارُ النّاسْ چیش نازانن، دە کە ڕو، کاس

له کۆتاییدا، سوپاسێکی پڕبەدڵ و، کوردانه له برای خۆشەویست و، ناسیاوی لە مێژینە. کاک ئەحمەدێن ئەنیسی دەکەم، کە بە پێی توانا و، لێک دانەوەی خۆی، زحمەتی دەگەڵ دیوانی شێخ ئەحمەدی کۆرداکێشاوه و، ئەوەی لەووزە یا بۆوە کۆتایی نه کردوه. خوا، جەزای بە خێری هە موالایە کمان بداتەوه ـ ئامین ـ رَبُّ الْعالَمینْ.

عەزیزە موحەمەد پور نیۆ دێرپه، مەلاعەزیز، داشبەندی.

شاری تاران ـ ۱۳۷۲/۴/۲۷ کۆچی هەتاوی ـ رێکەوتی
۲۷/ مانگی موحەرەمی ۱۴۱۴ کۆچی مانگی
۱۸/ مانگی جولای ۱۹۹۳ زایینی ـ
۲۷/ مانگی پوشپەڕی ۲۶۰۵ ـ ک:



# جَلی‌زاده

**کوڕی زانای به ناوبانگی کوردوئیسلام .حاجی مه لا(۱۲۵۰-۱۳۲۶ھ - ق )**

ئه سعه دی جه لی یه ، که دۆستی زۆر، نزیکی موفتی زه هاوی ، نالی و، شێخ عومه‌ری بیاره و ،ئاوالْ فه قێی ،حاجی قادری ،کۆیی و، کاک ئه حمه دی سوله‌یمانی و، شێخ عه لی که رکوک وخۆشه وستی شێخ ئه حمه دی کۆر،بووه . شێخ ئه حمه د، ماوه یک ، له په نای ئه مان و، حه مه ئاغای کۆ،دا،ماوه ته وه



هەر خودایە نامری

بە بۆنەی کۆچی دوایی مامۆستا هەژار لە ساڵی ١٣٦٩ گوتراوە

## هەر، خودایە، نامرێ

کاتێ لە، ساڵی ١٣٦٨ کۆچی. هەتاویدا[١]، بە، بۆنەی جێژنە پیرۆزەی جێژنی قوربانەوە، چوومە زیارەتی، ماموٚستای هەرە، چازان و، هێژام، واتە ماموٚستای بلیمەت و، هەژاری گەل خۆشەویست. کە، وەک، پەپو لەی دەوری شەم، هەمو هەست و، خوست و، گیان و، لەش و، خواست و، ویستی، خۆی، لە ماوەی ژیانیدا، کەڵکە ڵەی هەڵسوڕان و، خولانەوە، بە، دەوری، ئۆگری، زێدە کەیدا، لێی ببۆوە، هەوێن و، ماکەی بوون و، ژیان و، شەوو، روژوو، دەم و، ساتی، نە دەناسی و، ئەوەندەی هەبوون و، بگرە چەند ئەوەندەی، کەش، هێشتا، بەلایەوە، کەم، بوو. وەک. زوٚر، جار، دەی درکاندو، دەی فەرموو، بە فەرموودەی حەضرەتی پیغەمبەر (پیاو، کە پیربوو، دوو، خەصڵەتی، تێدا، جحێڵ دە بێتەوە. هیوای سامان و، درێژی تەمەن بەڵام من، درێژی تەمەنم، هەربۆیە، دەوێ، کارە کانمی تێدا، بە ئاکام. بگەیەنم. وەک هەموو، رایەک فەرموی ئەو ماوەیە، چت کردوٚوە؟

ئاخو ئاداب و، ڕوسومەکەت چاپ نەکردوٚوە؟ عەرضم کرد، دیوان و، شەرحی حالی شێخ ئەحمەدی کوٚرم تەواو، کردوٚوە و، چونکو، لەدو جێگەشا، باسی ماموٚستا هاتوٚتە گوٚڕێ، کە، لەسەر، بابەتێک لە، خزمەت ماموٚستا ڕوٚژبەیانیدا، لەگەڵ ئیوٚە دوا بووم و، ئەویکەش، بە حوضوری ئیوٚە دە گەڵ ئەوانا، باسم

---

١. واتە ١٤/١٠/١٣٦٨.

کردبو، هێنا و مەتەخزمەت، تا هەردوک، بابەت و، باسەکان، بەسەر کەیەوە، کەم و، کورێیەکانیان، پڕ کەیتەوە، بۆ ئەوەی دوای چاپ کردنی نەفەرموی، من ئاگام لێی نەبوۆوە. ئەگینا، دەزانم، نابەرژێیە، ئەم کارانە. فەرموی، بۆتۆ، هەمو، دەم، دەمێکەو، پێم خۆشە، نووسراوە کانت بخوێنمەوە. دای نێە، ئێستاوا لێکدانەوەی قورئانە کەم، بەدەستەوەیەو، دەش زانی دەمەوێ بڕۆم. بۆ فەڕانسە. دوای هاتنەوە، بەسەر، هەموی دا، دەڕۆم.

عەرضیان کرا، مەم و، زینەکە، نابەی، فەرمویان کاری چەن مانگێکی هێشتا ماوە، نیشانەو ئاکسانی (Aksan) بۆ، دا، نەندراوە. گوتم، من ئەوەکەی خۆم، داناوە. گوتیان، بەیانی، زوو، بۆم بێنە، کاتێ بردمە خزمەتیان، سێ چوارجار، فەرموی، بەراستی کاری چەند، مانگت لەسەر سوک کردوم.

جا،ئەوە بوو، دوای گەڕانەوەیان، ڕۆژێک، ولامیان، دامێ، چومە کەرەج، فەرموی ١٥ ڕۆژی تەواو کارم لەسەر، شێخ ئەحمەد کردوۆە، بۆ خۆشت دووبارە بەسەریدا بڕۆوە، بە پێی فەرمانی ئەوان لەسەر، را، پێیدا، چومەوەو، لە روژی ٢٢ر٢ر١٣٦٩ دا. لەدوبارە کردنەوەی بوومەوە. ئەوەش بلێم، هەڵبەستێک، زیادەلە، ئەوانی دی کە، بە قەڵەمی میداد. نوسرا بوۆەو، من بۆوم، ساغ نەکرا بوۆە، مامۆستا فەرموی بەخوا، منیش ئەو لەتەییم، هەر بۆ، نەخراوە سەریەک. پێچو کتێبە کەم، دا، حروف چینی بکرێ و، دوای ماوەیەک، رۆژێک، بەپێی عادەتی خۆم، دوحەوتەیان بیست ڕۆژ جارێک، سەبارەت، بە حاڵ و، باڵیان پرسیارم کرد. گوتیان لە نەخۆشخانەی ساساندا، کەو تۆوە، لە پێشدا خێزانم و، دوایەش خۆم. چومە خزمەتی.

کاتێ کاک عەولای برای عەرضی کرد، هەستاو، پاڵی بە، تەختە کەوە دا، چو مەپیشەوەو، دەست و، ڕو، ماچ کران، دەستی گرتم و، فەرموی چت کردوۆە، هەڵبەستە کەی شێخ ئەحمەد ت ڕاست کــردەوە عەرضم کرد. بەلێ. لام، وایە، بۆی چوبم و،

دە بێ بەم جۆرە بێ: تازەد . واتە: تازەت عومر بوتە سێ عوز، یا خودا، سێ پەنجە بێ، مەبەستی ئەوەیــە تۆ، ئیستا، ئەمەنت، بۆتە سێ عوزرو، تازە سێ عوزرت شتووەو، هێشتا، لاوی، هیوایە، ئەم سێ عوزرە، هەریە کەی ببێتە، پەنجا ساڵ و، صەدو، پەنجا ساڵی کە، ئەمەن ڕا بوێری.

لـول و، حـەڵـقـە، تـوکـی، مـەرخـوز، غـەم ڕەوێـنـی دەردی عـاجـز
تـازەد، عـومـر، بـۆتـە، سـێ عـوز، یـا خـودا، سـێ پـەنـجـە بـێ.

فەرموی هەر، ئەوەیەو، وەدوی مە کەوە. بەلام، (تازەد عومر) بگۆڕەو، بێکە: (تازە عومرت) کە ئیستا، هەربەم جۆرەیە. پاشان. گوتیان. بە خواستی خوداوەند . دوای گەڕانەوەم، لە ئورۆپا، پێشە کێکی، بەدڵی خۆمی لەسەردە نووسم. بەڵام. بەدا خێکی، گەلێک گران و دڵ چۆ قینەوە،بە هەزاران، حەیف و، مەخابنی گیان و، لەش سوتێنەوە،چوون هەر ئەو چوون بووو، زیارەتی من و، پێشە کێکەش، هەر، ئەو دەست و، ڕو، ڕاموس کردنەو، پێدا چونەوە کەی هەوەڵ بوو.

کاتێ ئەوان گەڕانەوە، من، بە هۆی نەخۆشی گورچیلەوە (کولیە) و، گیر بونی بەردەلە موسوڵدان و، میزە ڵدانمدا، ماوەی چەند ڕۆژێک سۆندم پێوە هەڵاوە سرا بوو. پرزەی هاتوو، چوو، چونە دەرم لێ بڕا بوو. بەڵام هەردەم پرسی، تا ئەوەی شەوی پێنج شەمۆی ڕۆژی (٢ر١٢) مانگی ڕەشەمەکات ژمیری ٩ خێزانم، «کە بە ڕاستـی وەک کـچێکـی بـەئـەمـەگـی مـامۆسـتـا دەجـولایـەوەو، ئەوانیش وەکو باو کێکی بەبەزەیی و، دلۆڤان، لایەنیان دەگرت و، ئـەنـانـەت، چـەن جـار، وێـنـەیـان، بـەمـاڵ و، مـنـداڵـەوە دەگـەڵ هەڵگرت و، لەنەخۆشخانەی ساسانیشا، فەرموی چاوت لەخیزانت بێ. وەک یـادگـار یێکـی مـن ئـاگـات لـێـی بـێ) دەسـتـی کـرد، بە گریان، گوتم بۆ، دەگری، من باشم و، خەرا پیش بم،گریانم ناوێ بە کوڵەو، گرەوە، گوتی بۆ،تۆ،نا گریم. مامۆستا، مامۆستا هەژار! ئەوسا، زانیم، ئەو ڕۆژە، پڕ ئەوژمە، پرشنگدارەش، وەکو.

صه دان ئه ستێره ی ئاسمانی که ی ولاته که مان، بۆ هه میشه که وته پشت هه وری ڕه ش و، تاریکی نه مانه وه و، بۆ هه تا هه تایه هه ڵوی به رزه فڕی گیانی له، شه قه ی باڵی داوه و، چۆته وه، به ره قاپیێه که ی باره گای خوداوه ندی میری مه زن و، ئێمه ی دڵ به هه زار خۆشیشی به بێ هه زار هێشته وه و، هه زاره تری کردین. پاش تا وێک تاسان و، حه به سان، هێق و، کوڵه و گر، ده ئه و ک مان له چاوی فرمێسک تێدا، قه تیس ماوی پڕ، له گریان. سه رم، هه ڵبری و، گوتم، هه واڵی. کاک ڕه حمانم (میصباحی قاضی) بۆ بپرسه. گوتی و لامنا داته وه: که ره ج؛ کپه: بم خه نه ماشێنه وه: شه وه که س نییه، بمان با... کاکڵه که ی، هه رچی کردم نه م توانی، له جێگه ی خۆم هه ستم و، ته نانه ت وه کو ته رمێک، بکه ومه شوێن ته رمه پیرۆزه که یه وه مپاشان کوتم، ئه و ئاوا تانه شه م، وه کو، ئاواته کانی، (مه لی خه یاڵه) که م، که بڕیار بوو، مامۆستا هیمن، پاش خۆینده وه یان، قه رضی کۆن و، نوێیم بداته وه و، کاره ساته کانی ئه و چه ند ساڵ، لێک جیا بونه وانه مان، بداته وه و، خه شم له دڵ ببڕێ، که به داخه وه، قه رضی تازه شی که وته، سه رو، هیچی نه دامه وه و، بۆ هه میشه ده گه ڵ هه سته پیرۆزه که یدا، ئه وانیشی گۆڕ، کردن، بۆ هه تا هه تایه، چوونه ژێر گڵکۆێ بێ به زییه وه و، هیچکا تێک، وڵامی ئه و هه مووه، پرسیارانه، ناداته وه.

ئه وسا، گوتم، هه روه ک مامۆستا خۆی، له سه ر، کیلی پێپینی، کاک خوله کاوانی، له ئاوایی بێتوانه ی، ده شتی بیتوێنی، لای ڕانیه ی کوردستانی عیراق که، له ئاوایی ئاقوپانی خۆشناوه تی، که وته، به ر، ڕهێله ی ره شاشی، فڕۆ که، شه ڕ که ره کانی ده وڵه تی به عثه وه، نوسیۆیه تی (هه ر خودایه نامرێ) به ڵێ هه ر خودایه هه تا، سه ر، هه رده مێنێ و، هه ر گیزاو، هه ر گیز، له ولاتی هه ربون، ناچێته، ولاتی خاپوری نه بونه وه.

به لام. ئه وانه ی له گه ڵ. به ره ی هه زاردا، بوون و، به هه زاری ژیاون و، به هه زاریش گه ڕاونه ته وه. باره گایی خوایی، پاش

مەرگیش، هەر، لەگەڵ گەلا، دەمێننەوەو، هەرگیز، لەدڵی کومەڵ ناچنە دەرێ و، لەماوەی مانەوەی ئەواندا، هەر، ماوەوە دەبن و، قەت لەبیرناچن. دوای ئەوە. دەستم، دا قەڵەمی زمان و، بەخوێنی قەڵەمدانی دڵ. بەر پێی پێنوسم، بەڕەشاوی جەرگ و، هەناو، خوساندو، ئەم چەن هەلبەستەم، لەژێر، سەر، دێڕی (هەر خودایە نامرێ) دا خستە، سەر کاغەذ. بۆ ئەوەی، بتوانم. دلۆ پێک، ئاوی حەیات و، مان، بەکێوی ئاگر پڕژێنی دڵ، دا کەم و، ماوەیەک بەوەوە، خۆم، بخا فلێنم و، کەسەری، بێ ووچان و، بێ دەرەتان، دور کەمەوەو، بەواتەی خوا، خۆم. پلا و ێنمەوەو، بلێم.

### هەر، خودایە، نامرێ
### كُلُّ نفسٍ ذائِقَةُ آلموتِ (صَدَقَ اللّٰهُ العَظيمُ)

### (نامرێ، ئەوەی، حەق، دەربڕە)

پێنووس، بەر، پێی، لەخوێن، پڕە
زمان، لاڵە، خوستە، بڕە
رەشەمە، بۆچ، کفن بڕە؟
سپی پۆشە، کپە، پڕە
ئەستێرە، سیس، بێ زریوەیە
ئاسمان، پەرۆشە، کەف چڕە
کرێوە، تێکەوە، داوێ
هەناسەی، ئاگرە، گڕە
سوروشت، شێواوە سەر، بەتەم
ڕو، گرژو، تاڵ، کش و، کڕە
زریان، سۆزەی، بڵێسەو، گڕ
شەماڵ، گڕی، ساردو، سڕە

بای باڵی، مەل. بێ هازەیە
سەقرو، هەڵۆ، کەوتە [1]، فڕە
ڕۆژە، دڵی پڕ ئاگرە
هەیفیش، لەوی، پترە [2]، گڕە
سووهای [3]، سەما، سۆمای، نەما
تەرازوو، کۆ، حاڵیان شڕە
گەلاوێژو، کاروان، کووژە
کزە، یەخەی، خۆ، دا، دڕە
هەور، ڕەشپۆش، بە، ماتەمە
ئاو هەڵدێر، مات و، بێ، خوڕە
ئاوی ڕووبارو، چاوی مەن
قەتیس، ماوە، گەرمی، گڕە
گیان، لەژین، زیزو، زوێر
خۆشی فرۆش، مەینەت، کڕە
بەفر، ویشکە، واقی، ووڕ ماو
کێوی، کەوی، گێژە، ووڕە
مژی [4]، مژی، کردۆتە، بەر
ووزە، لە، ئاوەز، مانگرە
چیا، کەژو، کۆ، دۆڵ و، دەر
ئەویان، لە، ئەم، بە، تەم تەرە
کڵی، پردی، ژیان، ڕما
چێوی ئاوات، گردە، بڕە
گەڵای فرمێسک، هەمووی، وەری
داری، لەشە، قەڵت و، بڕە

---

١ـ واتە: لەفڕەو، هەڵفڕین کەوتوو
٢ـ واتە: مانگیش لە ڕۆژ گڕو، بڵێسەی زیادترە
٣ـ واتە: ئەستێرەی سوها، لەوەندە نورە کەمەشی بووە
٤ـ واتە: میشک، تەمی کردۆتە بەرو، بڕناکا:

ئەلبورز، دەماوەندو، ئەلوەند
بانگ دێڵنە، جودیو، ئاگڕە!
جگەر، سووتاو، دڵ، پڕزوخاو
بێستون، پەڕاو، دەنگ هەڵبڕە
زەرد کۆی، لوڕو، لەکو، زەندم
قەدەم خێرو، فاتە[1]، لڕە
بێدەنگو، مات، ئەبارێن
قڵپەی، هەنیسک، سەر، هەڵگرە
(شاهۆی) ماچۆ،(قەڵای، دزڵی)
کۆڵەو، گریان، ئەوک[2]. بڕە
(هەڵگۆرت) پێرس صەلاحەدین
جەرگ، بڕاو، لەش، وونجڕە
(چیای مەغلووب) گەڵی،(لا،لەشی)
یەزیدیو، داسنی، کڕە
(سپی ڕێز) قەندیلو (ئاکۆ)
(ئاراراتو،) داڵان[3] پڕە
(سوور، داش ئەزمەڕ، پیرمەگرون)
سوتان، چۆقان، کوتو، پڕە
(سوڵتان ماڵۆک وەقاص میرقاص)
(تەرەغە)م، جەرگی، بڕ، بڕە
هەمووی چەماوو، سەر، بەهەش
هەوالێکی، گور چوو، بڕە
دەبێ، چی بێ، چی، رابڕێ
هەستو، ئاوەز، ڕێ، نەبڕە
لە، پڕ، دەنگی، (عەلی سینا)
کڕێو، کشیی، لێک، دا، بڕە

---

١ـ نۆگرەکەی بابا طاهیری عوریانە:
٢ـ نەوک، گەرو، قوڕگ:
٣ـ مەبەست چیای سێ سنورە:

(خانی) (خەیام) (میری بەدلیس):

(شێخ ئەحمەد) کۆوە،بن،کوورە!
سەرنج، دەنە، بەهەشتی خوا
بڕوا، ریگەش، تەژی و، پڕە
بۆ، پێشوازی، ویستاو، بەڕێز
(قاضی و) (بارزانی) چی، کوورە
شەهیدی، ڕای خوداو، گەل
شێخی، شەمزین،(باوک و،کوورە)
(شێخ سەعیدە)(مەحمود )(سمکۆ)
(بداغ سوڵتان)، تێ را، خوورە
میوان، ڕێزی لە، سەرچاوە
(هەزار) ئەمڕۆ، قوناغ، بڕە
کوڕێنە، زوو، هەواڵ، بدەن
دونیا، لە، هۆزی، مە، پڕە
(لۆکمر)(قووچان)تاران،(کەرەج)
(بێڕووت) (میصر) تا، (ئەنقەرە)
(عیشق ئاباد) باکۆ، (ئێرەوان)
بێنە، پیشواز، کوورە، کوورە
(درسیم) (خەرپووت)(دیار بەکر)
(ئامید) (بدلیس) (ئاغجەلرە)
(زاخۆ) (دهۆک) بارزان (شلێر)
شین، گێرە، پیبیر[1]، دا، دڕە
هەموو، کوردی سۆران، گۆران
سۆرانی، شین، پەلکە، بڕە
(جزیر) (بۆتان) لە (دێرە زوور)
لە سوریای، کورد، لێ، کڕە
(بادینی) (موکری) (ئەردەلان)
(فەیلی) دەگەڵ، هەرچی، لوڕە

---

١- بەخەو، بەرۆک.

جوانڕۆ، هەوشار، شاری شیرین
ئەوەی پیاوە، ناوی کوورە
کیژو، دایکانی، شێرەژن
زۆر، هان و، پیر، چی، بەگوڕە
مامۆستاو، شاعیرو، هۆنەر
کێ، کڕ، کەوتۆوە، کێ، دەربڕە
(خاڵەو) (حەقیقی) (ئەفخەمی)
(ئاوات) (هێدی) خۆ، هەڵبڕە!
(صەلاح، سۆران) نەبیرەی خۆم
(پەشێو) (بێکەس) شێرە،کوورە
(گلیمُ اللّەی) خۆراسانی
شاعیری دیش، خڕو، پڕە
بێن، کۆوە، بن، کۆڕێ بگرن
لەو جێگایەی، ناو، (سەرخڕە[1])
بەدەستی، جەم، بەڕێزی، دەم
بلێن، (هەژار)، سەر، هەڵ بڕە
بڕوانە، هۆزو، خێڵە کەت
نەیار، نەما، بنە، بڕە
دیاری، هەر، مانت، وەرگرە
(نامرێ ئەوەی حەق، دەر بڕە)
لە، حاستی، هەستە، بەرزە، کەت
ئازارات، نزمە، بێ، چڕە
کێ، بێ، بۆ، تۆ، کڕ نووش، نەبا
تەنانەت، وەی، لە، کورد، پڕە

١ـ مامۆستا خۆی دەفەرموی: سەرخڕێ زیاتری هەموان بەشی تۆم ـ کورپەیەکی، خڕە کەی باوەشی تۆم یەکەمین جێیەکی، لێم، دانا، پێم ـ کوڕی خۆتم، بتەویم، یان، نەتەویم (ئەم شۆێنە گەڕەکێکی شاری مهابادەو، ماوەستا لەوێ هاتوتە و دنیاوەو، پاشان چۆتە تەرغەی بۆکان:

تاجی، سەری، هەموو، گەلە
کەسێ، بۆ، حەق، کەوتە، چڕە
بەر، لەو، ڕۆژەی لە (چوار چرا)
ئالاّی، دژ، بوو، شڕو، ووڕە
بە، پێنووس و، زمان و، لەش
تێکو شەر، بووی، بەڵگەی، پڕە
لێرەو، لەوێ، ڕۆم و، عەرەب
شاهید، چیای، (دالاّن پڕە)
لە، وولاّتی، خۆ، نزیک و، دوور
چۆڵ و، چیا، جێی، قاقڕە
دوای، وەش، ئالاّ، کەوتە، زەوی
هەڵۆی، بیرت، کەوتە، فڕە
بەرەو، ئەو، دیور، میصر، سۆڤێت
وولاّتی، کەش، بڕە، بڕە
تا کوو، (بارزانی [1]) هاتەوە
ئاگری، خەبات، گرتی، گڕە
پشکۆی، ئاوات، گەشایەوە
تیشکی، دایە، کەژو، چڕە
شانەو، شانی، ڕۆڵەی گەل بووی
تا دژ، کەوتە، گزی و، گڕە
ساڵی، حەفتاو [2]، پێنج، هاتە، گەڕ
ئاشی، شۆڕش بەر بۆوە، کڕە
وەرەق، گۆڕا، زۆر، کەس، دۆڕا
بەلاّم، (هەژار) هەر، ئەو، کوڕە

---

١ـ دوای شۆڕشی عبدالكريم قاسم لە ساڵی ١٩٥٨ زایەنیدا، واتە دوای ١٤ ی مانگی تەموز، کە لە، سو فیێتەوە، گەراوە عیراق و، پاش ماوەیەک دیسان، شەڕیان بەزور، بە، سرر، دا، سەپاندن.
٢ـ مەبەست پەیمانی ساڵی ١٩٧٥ م دیە. کەلە نێوان شای ئێران و بەعثی عێراقدا، بەستراو، شۆڕش کەوتە، تەواو، بونەوە

هەر، کەس، بۆ، حەق، هەولێ، نەدا
ژینی، گەمەی، خیچو، سوورە
ناوی، بەرزت، ووشەی، دەمە
تا، خاک، هەوا، ئاوە، گڕە
پاش وەی، کۆمەڵ، درشتو، وورد
ئۆغر، بەخێر، پێشەنگ، بڕە
(هێمن) ئامێز، دەکاتەوە،
پێک، شاد، دە، بن، ئەم، دوو، کوڕە
مەلی، ئەوینی، زیندو، گەل
بولبول، لە حاندی، وان، کڕە
بەلام (ڕۆژ)ی، ژیانی، من
کزو، بێ تین، لە، مان، پڕە
کۆ چت، زوو، بوو، وەک زۆری، دی
(تۆ لەستین)ت، کاسو، کڕە
سوێندو، پەیمان، بەپەیمانت،
هەتا، ماوە، ژێی، تۆ، بڕە
پێنووس، شکێ، زمان، بڕێ
دیسانەوە، حەق، دەر، بڕە
ئاواتی، حەق، هەر، دیتە، دی
واتەی، خوایە، قورئان، پڕە
خەڵفێ، ئەوسا، تۆ، ناتەوە
زوو، دیتە بەر، لە، گوڵ، پڕە
داری، ڕزیوی، مێشک، مژ
ووردە، خاشە، قەڵتە، بڕە
خواستی خودا، کە، بیتە، دی
ئاگر، ئاوە، ئاویش، گڕە
ڕۆژی هیوا، سەر، کەل، گرە
تیشکی، پەردەی، ڕەش، دا، دڕە

ڎلی، تەزیوی، ترس و، لەرز
بە یادی، وی، گەرم و، گوڕە
ئۆغر، بە، خێر، (ڕۆژا) کوردی
ئەستێرەی، گەل، لە، دوت، هوڕە
هەوری، نگبەت، تەمی، مەینەت
گەروو، گرە، قرخە، بڕە
تا ڕۆژی، خۆی دێنە، گڵکۆ
تێلی ووتەم، پس و، بڕە

بە بۆنەی، کوچی دوایی، مامۆستای هەمیشە، زیندوم، مامۆستای گەل، مامۆستا هەژارەوە کە، لە ڕۆژی پێنج شەمۆی مانگی ڕەشەمەی ٢ر١٢ر١٣٦٩ دا، ئێمەو، گەلەکەیان جێ هێشت و، رویان کردە ماڵی هەمیشەیی گوتراوە، مەلا - عەزیز، محمد پور، داشبەندی - تاران، ١٣٦٩ هەتاوی:

(روژ) بە حیسابی ئەبجەد. واتە (هەژار)

# پێشه‌کی

به‌ ناوی خودا وه‌ به‌ ناوی ئه‌و که‌سه‌ی هه‌ربوۆه‌و، هه‌ر ئه‌بێ

هه‌ر، هێند ئه‌زانم ذاتی بێ چوونه
کرده‌و، فه‌رمانی (كُنْ فَیَكُونَ)

ئه‌گه‌ر ئێمه‌، به‌چاوی ژونی سه‌رنجه‌وه‌، بڕوانینه‌ ئاوێنه‌ی مێژوی رابودومان و به‌تیشکی چۆ لّه‌ چرای هه‌وڵ و تیکۆشان، که‌ لێن و، قوژبنی تاریک و تنووکی به‌ سه‌رهات و، بارو، دوخی، ڕابراوی گه‌له‌که‌مان بگه‌ڕێن، به‌یت و بالّوره‌ی کۆن و سه‌ر گوریشته‌و، نه‌ریتی تیّه‌ که‌ونارا کان بده‌ینه‌ به‌ر تۆژینه‌وه‌و لێ کۆلێنه‌وه‌، گردۆ لّه‌و ته‌پۆلکه‌ گلێنه‌ده‌ سکردو، تۆربه‌ژێژه‌ کانی، زێده‌ که‌مان هه‌لکۆ لێن، نوسراوه‌و نه‌خشه‌ کانیان ساغ که‌ینه‌وه‌، نه‌ک ته‌نانه‌ت، هێزو تواناو، ده‌سه‌لاّتی شان و باهۆ شیرو خه‌نجه‌رو نێزه‌ وه‌شاندن، گورزو، مه‌تاڵ. هه‌لسوڕاندن، زێی که‌وان کێشان و، که‌مه‌ندو، تیر، هاویشتن، له‌به‌ر، نه‌یار وێستان و، خۆ، ڕاگرتن، دژه‌ وه‌ته‌نگ هه‌لێنان و، له‌مه‌یدان، ده‌ر کرنی باب و باپیره‌ گه‌وره‌ کانمان، هه‌ر له‌ماده‌وه‌، تائێستا بۆ هه‌مو سۆره‌و تۆره‌و خوێی و نامۆیه‌ک به‌باشی رون ده‌بێته‌وه‌، به‌لکو، که‌له‌پوری چه‌ن هه‌زار ساڵه‌ی شارستانێه‌تی و زانست و خوێندن و نوسینی تایه‌به‌تی و ئه‌لف و، بێتکه‌ی پاراوو، ته‌واوو، سه‌ر له‌نۆی خواز، راوه‌و،

را گویزراو،بۆ زمانە بنە ڕەتیکەی ئارامی، نوسەرو، هۆنەرو، هونەرمەند، وەستاو، مامۆستای چازانی هەمو چەشنە کەل و، پەل و، کەرەسەی ژیان،چەک و جوبەخانەی دەسکردی خۆماڵی،ڕێ و، شوێنی تایەبەت بۆ بەڕێوە بردنی ژیانی ئاسایی و، درێژەدانی میری، بەهەزاران ساڵ بەر، لەئاشورو زەردوشت، مانی و مەزدەک دێتەروو،ئەوەشمان بو دەر دەکەوێ چلۆن، جێگرە خاوەن فێل و گزیکارەکانی. را بوردو، هەموشتێکی ئێمەمان بن لیچ داوە،یان بەناوی خۆیانەوە، داویانەتە قەڵەم وەلەبنی کوولەکەی تەڕیشا شتێکیان بۆ، خاوەن ماڵ، نەهێشتۆ تەوە، ئەمە، بەر لەهاتنی ئایینی، پیرۆزی، ئیسلامدا، دیارە، لەسەرەتای دامەزرانی، ئەم ئایینەشا کە زۆربەی خەلکی ولاتی کوروستان لەسەر ئاینی زەردوشت، موساو، عیسا، بون، دیسانەوە ئەم هۆزە، خاوەن هەست و، بیرە، سەرە، ڕای ئەوەی پەڕتوک و کتێبی وەک ئاویستا، زەندو، پازەند، دین کورد، کلیلەو، دیمنەی هەبوۆە، بەدەیان هۆنەرو بلیمەتی وەک پیرشالیاری یە کەم هەڵبەست و هونراوەی وەک: هۆرمزگان ڕمان ئاتران کوژان: ویشان شاردەوە، گەورەی گەورەکانیان ئەم: هەڵبەستانەی حمدُاللّه موستوفی لە کتێبی گوزیدەدا، هێناویتی، نە موسوڵمان بیم نە گزیەت دیم: بشین وە مەگە، ئەیمە بژەهیم: بووە دەگەڵ وەرگرتنی ئایینی ئیسلامیش بەدڵ یان لارە مل، شان بە شانی هەموو هۆزەکانی تریویشکانی ئاسیا لەهەموو، بابەتێک و، زمانەوانیدا، بەرەوپیش چوون، بۆوێنە، جابان، کەیەکێک بوۆەلە فەرماندەرانی ئیران، دەچێتە خزمەت حەضرەتی رەسول و تازەمانی خەلیفەی دوهەمیش فەرماندەی قۆڵێکی سوپای ئیسلام بۆوە.

مەمیمونی کوڕیشی، یەکێک بوۆە، لەهەرە حەدیث گێڕەوەناو، دێرەکانی حەضرەتی رەسول، دیارە ئەم ڕچەیە تائەمڕۆ

بەرنەدراوەو، لە هەرچەرخێکا، بەدەیان خواناس و، پیاو، ما قوڵ و، بلیمەتی ئایینی و، چازان و شارەزا، بەهەموو، زانستە ئیسلامیێکانمان، هەبوۆەو، ئەم کاروانە. ئائێستا، نەپسا وەتەوەو، هەردرێژەی هەیە، هەرکاتێ، ڕواندرابێتە ئاسمانی فەرهەنگ و، هەڵبەستیش، بەصەدان ئەستیرەی پرشنگدارو، پڕتەوژمی، هۆنەری. هونەروەرو، خاوەن دەسەلاّت و هەڵکەوتوی، تێدا، بینراوە، کەبۆ، هەمیشە ناوی بەرزیان لە سەر، لاپەرە زێرینەکانی پەڕاوەی میژوی، ژیانی نەتەوەکەیان و جیهانی بەربلاّوی ئیسلامەتیدا، تۆمارکراوە، لەسەر، تەتەڵەو، بەردی لوس و، بێ خەوش و خاڵی، سینگی هەستیارانی گەل، بەپێنووسی زمان و دوپاتە کردنەوە،نووسراو، نەوە، دە گەڵ ئەوەشدا هێندێک، لەوئە ستیرە وورشەدارانە، خۆیان، لەڕوناکایی و سۆمایی، چاو، بێ بەش بون و، لەتیشکی هەتاوو، خۆری، خوێندنی، لای ماموستاو، فەقێ،فێرگەو بەچوکا، هاتنی سەرحەصیرو بەڕەشڕەو، دەقنەی حوجرەو، ڕاتبەش، دورەبەش و بێ زەواد بون، بەلاّم، بەتیشکی هەستی خواناسی، دڵیان بۆتە ئاوینەی بالاّنوێنی، گەلناسی و، ڕێچکەیان بەرەو، سەرکەوتنی، سەرترۆپکی خوا پەرستی راستەقانی، بۆ ڕێبوارانی ئەم ڕێگەپڕ کەندو کوسب و پڕلە کلۆیە، شکاندۆە، بەهەلبەستی پاقژو، بێ داڵدەو، زڕو زیزانەی درۆو، پڕ لەمەرایی و،بەشان و شکۆی ئەم و ئەودا هەڵگوتن، سەرنجی گوێچکەی تینوی، بیستنی پەندو، ئامۆژی. زوربەی خەڵکیان بۆلای خۆیان، ڕاکێشاوە، جارێکیتریش جێگایان لەناخی دڵی هەموو، خواناس و خۆویست و بێگانە، نەویستیکا، کردۆتەوە بۆ ئەوەی داری ئاواتیان بێتەبەر، بەچاوی بەستراو، بەپای پەتی و لە کاڵەنە پیچراو، بەسەر درک و داڵ و پێکۆلی. ویشکی، بیری کۆن و، نەزانی کومەڵی زۆردارو، مل

هوڕدا، تیٚ پەڕیون هەڵوەدای باژێڕو وڵاتی هەندەران بون، ماڵ و منداڵ و خۆشەویستي مەڵبەندو، ناوچەیەک نەیتوا نیوە ببێتە داوو، لە گەرەی هەوڵ نەدان و تێکوشان، هەستی ئەوین و بڵێسەی دەرون، ڕۆژبەرۆژ، زۆرتر، هانی داون، بۆزووتربڕینی ئەم قوٚناغانەو نزێک بوونەوە، لە گراوی راستەقانی:بێ گومان یەکێک لەم کۆمەڵە ئەستێرە بەتەوژم و پرشنگدارانە، کە هەروەکوو، کوٚو، تەرازوو، لە هەموو لایەکی وڵاتا. خوێیان. بۆگشت بینەرێکی پڕهەست و، خوستی خودا پەراستی و، گەل ویستی، نوواندووٚە

**شێخ ئەحمەدی کوٚرە.**

ئەم ذاتە، پاش ئەوەی هاتە، سەر ڕێگای خواناسی ڕاستەو، خوٚو بێ کەندو، لەندی ناراستی و، درۆ، ماڵ و خێزان، داهات و، سامان، مەڵبەندو، نیشتمان، بەجێ دێڵی و،بەرەو شاری سولەیمانی و مزگەوت و بارەگای پیری، ئۆگریی واتە مەولانا، خالیدی شارەزوری دەکەوێتەڕێ بەڵکو، بتوانێ بڵێسەی ئاگری، لەش تاوێنی، ئەوین بەئاوی، دەربڕینی، هەستی خواناسی خوٚی، دامەرکێنێ، ئەوهەستەی لێی ببۆە خوو خدەی دانە مەزرا وو نەهەندراو،لەدڵدا، قاراوی نەدەگرت و، دەهاتە سەر، زارو، بەهەڵبەست، دەقوٚزرایەوە ودوپاتە نەکرایەوە، ئەو، ئاگرەی لەش سوتین و دل تەزین بوو، بیری وێشکی هێندێک، لە مەلاو، صوٚفی و دەروێشی رواڵەتی و، نەخوێندەوار، دەرەبەگی مێشک مژو، لەڕێ، لادراو، ببونە بەرهەڵست و ژیانی ئاساییشیان لەم کویرەڕۆشنبیرە تاڵ کردبوو، دیارە ڕای دوهەم کاتێ گەڕایەوە سولەیمانی، واتە شارە مەزن و هەستیارو زانست پەروەرەکەی شێخ مەعروف، مەلاعەولای

ڕه ش، موفتی زه هاوی ،نالّی ،،کاک ئه حمه دی شێخ، پیره مێرد ، مه لیک مه حمود و،پاش ماوه یه ک ئه ویشی جێ هێشت و، ڕوی کرده شاری کۆی حاجی مه لائه سعه د ،باوکی جه لیزاده و، ماموستای شێخ عه لی که رکوک و کاک ئه حمه دی سوله یمانی، جه لیزاده ی ئه ویندارو، ئۆگری مه ولاناو، هاواڵ فه قێی، خۆری پڕته وژمی نه ته وه ی کورد ، حاجی قادر،و باوکی زاناو، بلیمه تی هه ره نێودێری گه لی کوردو موسولمان واته جه نابی مه لا ، دوای چه ن مانگێک لەوێشه وه، ڕوئه کاته خانه دان و بنه ماڵه ی به ناوبانگی گه ل، سه ید طه های شه مزینی، که ئه ویش یه کێک بوو، له جێ نیشنه کانی هه ره ناوداری مه ولانا خالیدی نه قشنه ندی پاش ئه وه ی ڕێگه ی طه ریقه تی نه قشی ئه بڕێ و ئه گاته سه ر قۆناغی یه کێک له ئا واته کانی و، ئاڵۆزانی باری باره گای شێخ عوبه ید یلاوه،ڕاپه ڕینی ساڵی ١٨٨١ ، به رامه ی خۆشی، سه رله مه لّبه ندو، زێد هه لّینانه وه، به ده س په یکی خه وو، خه یاڵ که لّکه لّه ئه خاته دلێوه و، به ره وشاری شنۆو، سابلاغ و، عه مبار ئه یخاته وه ڕێ و،بۆهه میشه ئاوایی عه مبارئه کاته قۆناغی مانه وه و، هه رله ویش، سه رئه نێته وه، مه لی به رزه فڕی گیانی، ماڵی له شی به جێ دێلێ و، به ره و، باغی به هه شتی خوایی، له شه قه ی شاباڵ ئه داو، ئه که وێته ڕێ: بۆ ئه وه ی باری ژیان و، به سه رهاتی ئه وذاته، هه روه ها ، تۆره مه و، بنه چه کی شێخ،به باشی ڕون بێته وه، له پیش دا ئه وه ی ده رباره ی ئه وان تائێستا نوسراوه، یان بیسترا وه و، من ده ستم پێیان ڕاگه یشتۆ وه، ئه خه مه ڕوو، دوای لێک دانه وه و هه لّ سه نگاندنیان به پێی به لّگه و توانا راسته قانێیه کان دێنینه گوڕێ،تاوه کوو، باشتر، له به سه رهات و ئاڵ و، گوڕی بیروباوه ڕی ئه م ذاته حالّی بن و، که لک وه ر گرن بزانن مه لی تیژباڵی هه ستی خواناسی ئه وان، چۆن و له کوێوه و

بۆ کۆی فڕێوه پاشان به چدارێکه وه نیشتۆ ته وه، یان کام لوتکه ی به رزی کردۆته هێلانه و، مه کۆی هه میشه یی خۆی جاوا، له به را، یه ک یه ک نوسراوه کان و پاشان بیستراوه کانتان بۆ، ده خه ینه ڕوو.

الف: مامۆستای پایه به رزو، بێ وێنه ی کورد، عه لائه دّین سه جّادی له، لاپه ڕه ی ٥٤١ی کتێبی مێژوی ئه ده بیی کوردا، ئه فه رموێ ئه حمه دی کۆری موکریانی له سه ره تای چه رخی هه ژده هه می زایینی و سێزده هه می کۆچی مانگیدا ژیاوه.

ب: دکتور موحه مّه د مه جدی (کوڕی مامۆستای چازان و، بێ وێنه م حاجی مه لا حوسین مه جدی مهاباد) له لاپه ڕه ی ١٥٨ ی سالّنامه ی[1] مهابادا، ده گه لّ هێنانی نمونه یه ک له هه لّبه سته کانی ئه حمه دی کۆردا، ده لّێ ئه م ذاته یه کێکه له هۆنه رانی چه رخی سێزده هه می کۆچی مانگی ئه مه ش: هه لّبه ستی هه وه لّ و، ئاخره:

یا ره سولَ اللّه ذه لیل و، دلّ حه زینم ڕه حمه تێ

موسنه مه ندو، بێ قه رارو، بێ قه رینم ڕه حمه تێ

تۆ، خودا غافلّ له، ئه حمه د، قه ط مه به ڕۆژی جه زا

ڕوسیاهم، ئه ی شَفیعَ المُذنبینْ م، ڕه حمه تێ

ج: کاک قادر، فه تاحی قاضی له کتێبی میهرو وه فا[2] لاپه ڕه ی ٢٦ دا، ده لّێ، ئه حمه دی کۆر، ده گه لّ ئه وه شا زۆربه ی هۆنراوه کانی له سه ر بیچم و کێشی قه صیده و، غه زه لن، (واته دور و درێژن) له ناو تاقمی نه خوێنده وارو، زۆرتری صۆفی و به یت بێژی کوردا، بره وی سه ندۆه، هۆنراوه ی (به هاره) له دیوانی شێخ ئه حمه دا، که له لایه ن کتێب فرۆشی سه یدیانه وه چاپ کراوه، به رچاو، نا که وێ، ئه م کوێره روشن دّله، له سه ره تاوه خه ریکی کاری کشت و، کالّ بۆوه

---

١ و ٢ . ئه م دوو، کتیبه هه رکیان به فارسی نووسراون.

دە گێڕنەوە لەمانگی ڕەمەضاندا، لەناو، دەخڵ و، دانە کەیا بژاری دەکرد، تونیایەتی زۆری بۆهێناوە، بەلام، ژوژۆکەی نەشکاندوە، ئێوارە کاتی بەربانگ کردنەوە هەستی کردوە تارمایی بەسەرچاوێدا، هاتوەو، چاوی دڵی، لەبری ئەوڕۆشن بۆ تەوە لەوساوە، ئیتر ئا هەنگی پڕ لەسۆزی دڵی، دەسی پێ کردوە، ماموستا ساویلکەو، رواڵە تێکان، لێی دەبنە بەرهەلستو، تومەتی کافربوونیان وەپال داوە، شێخ بەیارمەتی وەکازەکەی چۆتە زیارەتی (غەوثی بەغدا) کاتێ سەرکونەی دڕکی موغیلان وهەورازو، نشێوی ڕێگاو، کەندو، کۆسبی طەریقەت، ئەویان لە چۆڵ و قاقڕی بیاباندا، بەبیکەسی بە جێی هێشت، لەنێو دڕوو، داڵ و خیز کەلانی سورەوەبوودا، دەسوڕاوە، توشی (خدری زیندە) هات و، فوی بەدەمیا کردو، گوتی کۆیرە ئەوەی پێویست بوو، پێمان دای ئیتر کارێکت بەئێمە نەماوە، خدری زیندە دەڕواو، ئەحمەدی کوێر، دەس دەکا، بە گریان و فرمێسک هەڵ وەراندن: دەڵێن هەلبەستەکانی ئەوەندەیان کار کردبوە، سەردڵی خەلک ماموستاکانی ئایینی وەتەنگ هەلاتبون و، خوێندنەوەی، هونراوەی شێخیان حەرام کرد، ئەوەی وەدەستیشیان کەوت خستیانە ناوڕوباری (دەجلە). وە.

د: سەروان (ئەحمەد کاویانپور) لەلاپەڕەی ١١ ی کتێبی بوزورگان و[١] سەخون سەرایانی ئاذەربایجانی غەربی، دا، ئەڵێ ئەحمەدی کوێری مەشور بە شێخ ئەحمەد، نەخوێندەوارو ،بەکوێری لە دایک بوو، بوە،بەلام دڵی پڕ سۆزو، رۆشنی، دنیای تاریکی، بۆ، ڕون کردبوە،خوا لێ خوشبوو، دەگەڵ ئەوەشا خوێندەوار، نەبوو، هەلبەستی زۆر دلگری دا ،دەنا ،بەیارمەتی بیرو، لێ هاتویی خۆی

١. بزرگان و، سخن سرایان آذربایجانغربی (فارسی)

واتای قورئان و حەدیثی دەخستە ناو، هەڵبەستەکا نێوە، کە بەڕاستی لەم کارەشا بەباشی سەرکەوتو، بوو، ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی، ئەو، ئەویندارە چاو، تاریک و دڵ ڕوونا کە یە کەزۆر لێ زانانەو، مامۆستایانە سورەی پیرۆزی فاتیحا، واتە أَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمينِ ی، تێدا ،جێی، کردۆتەوە:

یا [1] رەسولَ اللّە دەلیل و، دڵ حەزنیم ڕەحمەتێ

موستەمەندو، بێ قەرارو، بێ قەرینم ڕەحمەتێ

راحەتی قەلب و، وجودو، عیزّەتی نەفسەم نەما

وەقتی مەرگم، حافیظی ئیمان و، دینم، ڕەحمەتێ

شێخی، ڕۆشن دڵ و، زانا بە زمانی هەڵبەست و، برین سارێژ کە رەوەی خۆی،دڵی، دڵ سووتاوانی، ڕێگەی راستەقانی، ئایینی موحەمەدی خۆش دەکردەوە، بە، شنەبای هەستی دەرون، چزیلک و، پشکۆی، کوژاوەوەی. وەبن خۆ لە میشی سەرلێ شێواوی کەوتوی، هەڵ دە گیرساندەوە، بەووتاری، سحراوی خۆی کە، لەسەرچاوەی ڕون و، زولاڵی، ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو، فەرمایشی پیغەمبەری مەزن و، ووتەی گەورە پیاوان هەڵی ئێنجابون، تارای نەزانی و، ڕوبەندی دو دڵی،لەسەر گۆنای دڵبەرو، گراوی ڕاستەقانی لا، دەدا، سەرنجی هەموو، کەسی بۆلای بن چینە یەک واتە خودا ناسی بێ فەندو، فێڵ،را دەکێشا، ئاگری، ئەوینی، دەسپاردە دەس شنەبای بەرەبەیانی تێگەیشتن و، خوداناسێوە، سەرچاوەی ئەوینی دەبردەوە، سەرچاوگە، بنەڕەتێکە،یانی خوداوەندی میری مەزن و، ئەیگوت خۆ ناس بن تا خوداتان ناسی بێ:

هـ: گوفاری [2] هووخت، لەلاپەڕەی ٥٨ ـ ٥٩ دا، ئەڵێ، ئەحمەدی

١. دوو، هەلبەستی ١ و ٢ یە.

٢. ئەم گۆڤارە هی زەردەشتیکان بووو، پووردادیش زۆرشتی تێدا، دەنووسی

کۆڕی موکریانی، هۆنەری چەرخی هەژدە هەمی زایەنی، لە ئاوایی حەمامیانی بۆکاناهاتۆتە دیناوە، پاش ڕابواردنی ١١٥ ساڵ جیهانی کاول بووی جێی هیشتوو، لە گۆڕستانی عەمبارە دا، نێژراوە.

و: دۆستی بە ڕێزو، لەمێژینەم کاک صەدیق بۆرەکەیی لە کتێبی (طەلای[1] دەستەوشار)دا، کە لەسالی ١٩٦٧ زایینیدانوسیوێتی، ئەڵێ، ئەحمەدی کوڕ، هۆنەرو، نەوا، خوێنی چەرخی هەژدەهەم کەلەئاوایی حەمامیانا، هاتۆتە دیناوە، لەسەرەتای لاویدا هەرلەمزگەوتی ئاوایی دەس بە خوێندن ئەکا، پاشان، دەچێتە شاری سولەیمانی ئەوبەری سنورو، بەلای زانایانی ئەوێوە، زانست کۆئەکاتەوە، پاش چوارساڵ، ئەگەڕێتەوە حەمامیان، زۆری پێ ناچێ روناکی چاوی لەدەس ئەدا بەلاّم لەجیاتی ئەو، چاوی دڵی رۆشن ئەبێتەوە، دوای ئەم بەسەرهاتە، نەوای دڵی لێی ئەداو، بە ئەحمەدی کوڕ، ناو، دەرئەکا، لەوەدوا، خەریکی ڕێنوێنی خەڵک ئەبێ، ئەلێن دوای کوێر بون بەرەو، بەغدائە ئەکەوێتە ڕێ، لە بیاباندا، ماوەیەک، بەسەرلێ شێواوی ئەخولێتەوە، لەناکاو (خدری زیندەی) لێ پەیا ئەبێ و، فوونەکا بەدەمیاو، دەڵێ بڕۆ، کوێرە ئیتر کارێکت نەماوە، وەک گوتراوە، خەڵک ئەوەندە، ئۆگری هەڵبەستەکانی شێخ ببوون. وازیان لەخوێندنەوەی قورئانی پیرۆز هێنابوو، لەسالی ١٨٣٣ زایەنیدا لە تەمەنی ١١٥ ساڵیا، سەری ناوەتەوە، بەپێی ئەسپاردەی خۆی لە گۆڕستانی (عەمبارە) کە لەنزیک بۆکانە، بەخاک ئەسپێردرێ، ئەحمەدی کوڕ لەدانانی هەڵبەستی کوردی و، فارسی وەعەرەبیا، دەستێکی بەرزی هەبۆوە، خودی هەڵبەستەکان باشترین بەڵگەن بۆئەم ووتەیە، نوسراوەیەکی تریش هەرلە شێخ ئەحمەدەوە هەیە، بەناوی (بەهارە) کەهێمان چاپ

[1]. کاتی من چاوم پیی کەوت، هیشتا چاپ نەکرا بوو

نه کراوه، ئه م پارچه هه ڵبه سته ی خواره وه یه کێکه له هه ره هه ڵبه سته دڵگیره کانی ئه حمه دی کۆر:

یـا رَه سـولَ اللّـه ذه لیـل و، دڵ حـه زینـم ره حـمـه تـی
موسته مه ندو، بێ قه رارو، بێ قه رینم ره حمه تی...

ز: برای به ڕێزو، دۆستی ئازیزم کاک میرزا ئیبراهیمی ئه فخه می، هۆ نه ری خۆش مرخ و، به هه ست له نوسراوه یه کیدا، به ناوی (دودمانی عه شایه ری دێبو کری)[1] که به تێ هه ڵه نگووتن، باسی ئه حمه دی کۆری کردۆوه، ئه ڵێ شێخ ئه حمه دی کۆر، له چه رخی سێزده هه می کۆچی مانگی و، هه ژده ی زایه نیدا، له ئاوایی (عه مبار) له سه رده می باوکی برایم ئاغای عه بّاسی مه شوور، به مه لانه صره دینی دێبو کریٰ (که پیاوێکی به رواڵه ت ساویلکه و، به نهێنی خێره و، مه ندو، خواناس و، جوان ڕه وشت و، زانست دۆست بووه، پیاوی زاناو، مامۆستای وه ک (حاجی مه لاشه فیعی) باو کی، زانای به ناوبانگ (مه لا عیصامه دینی عه مباریی) بۆکان و، ماموستای پیره مێردی موکریان واته (سیف القضاتی قاضی) له زه مانی ئه ودا، له ئاوایی عه مباردا، خه ریکی ده رس دانه وه و، فێر کردن و، فێربون، بوون) هه ڵبه سته پڕ له سۆزو، به تینه کانی، هۆندۆ ته وه پاشان له ته مه نی ۹۹، ساڵیدا به هوی پیرێتیوه، بۆهه میشه، سه ری ناوه ته وه، باوکی شێخ ئه حمه د ناوی که ریم. و، به رنۆیژی ئاوایی عه مبار بۆوه، گڵکۆی ئه حمه دی کۆرله گردی قه بران دا (که هه ربه ناوی ئه وانه وه، نیۆده برێ، دیاره پیاو، ماقوڵی وه ک حاجی مه لاشه فیع، خه لیفه مه لا ره حمان، مه لا حه مه ده مینی ئه شعه ری وه لزی، خودی حاجی برایم ئاغاو، که سانی تر، هه رله و گۆرستانه دا، نێژراون)

---

١. واته بنه چه که ی هوزی، دیبو کری: (فارسی)

بەخاک ئەسپێراوە:

ح : کاک خالیدخاکی، لەلاپەڕەی ١٣٨ ـ ١٣٩ ی کتێبی (نەظەری بە کوردستان و، دیداری با شوعەڕایی کورد ) دا، سەبارەت بە شێخ ئەحمەد، ئەنوسێ شێخ ئەحمەدنێو دێر، بەئەحمەدی کوێر، یەکێکە لەهەرەشاعیروخوا، ناسە گەورەکانی کورد، هەڵبەستی یەکجا زۆرە،بەلام، بەدا خەوە، چەن هەڵبەستێک نەبێ، کەئەویش، سین بۆسینگ و، زمان بۆ زمان، گێڕدراوەتەوە، شتێکی تریان، لێ بەجێ نەماوە، بەبروایەک خەڵکی گوندۆ لەیەکی لای شاری شنو، بەناوی (شیوەسماک)، بەهێندێ بڕواش، خەڵکی (عەمباری) لای بۆکان بوۆە، وەک ئەگێڕنەوە، کوێری لەدایک بوو، نەبوۆە، بەلکوو، بە هۆی چاو، ئێشەوە کوێر بوۆە، لەماوەی ژیانیدا چۆتە زۆرشارو گوندی دەورو، بەرو، تەنانەت عیراق و، عەڕەبستان، یەکێک لە کەراماتی ئەحمەدی کوێر ئەوە بوۆە، کاتێ ویستۆویەتی بچێتە عیراق، لەرێدا تەنیاو، بێ کەس دەمێنێتەوە، خدری زیندە، دەهانای دێ و، پاش ووتووێژێکی زۆر، بۆشێخ دەردە، کەوێ ئەم پیاوە خدری زیندەیە، دەستی توندەدە گرێ و، دەلێ تاهێزو، هەستی هۆنەریم نەخەیەد لەوە، بەرت نادەم دەمەوێ بەکەیفی خۆم پەسندی حەضرەتی رەسوڵ بدەم، دیارەئەویش فوی بەزارا، دەکاو، لەوساوە شێخ دەبێتە بولبولی باغی پەسندیی حەضرەت، ڕون نییە ئەم خواناسە گەورەیە چەن ساڵ ژیاوە، بەلام یەکی لەنەوەکانی بەناوی میمکە (زوبەیدە) ئێستا لەئاوایی (نەبی کەندی) ناوچەی هەوشارا لە تەمەنی ٧٠ ساڵیدا ئەژی، ئەم هۆنەرە،شەوو، ڕۆژهەڵبەستی داناوە، تەنانەت ئەڵێن، ووتو، وێژیشی هەر، بەڵبەست بوۆە، گۆڕی ئەم ذاتە لەئاوایی (عەمبار)ی لای بۆکانەو، زیارەتگای خەڵکی ناوچەیە، ئەمەش پارچە هەڵبەستێکە،

من دەستم کەوتوۆە (چونکە لەدیوانە کەدا، دێتەوە هەر هێنانی ئەم هەڵبەستەییم بە پێوست زانی)

دڵـبـەرا، دایـم، دەنـاڵـم دەم بـە دەم شـام و سـەحـەر
جـارێ نـاپـرسـی لـەحـاڵـم چـاوعـوفـابـی خـۆش خـەبـەر

ط : بابا مەردوخ کوردستانی: مامۆستای پیرو، کو ڵنەدەرو، شەکەتی نەناسی کورد، لەلاپەڕەی ٢٦٨ ـ ٢٦٩ ی بەرگی دوهەمی کتێبی (مەشا[1] هیری کورد)دا، بەراگوێزراوی لەلاپەڕەی ٣٤٠ ـ ٣٤١ ـ ی ژمیرە ١٦ ی گۆڤاری «دەنگی گیتی تازە» سالی ٣٠، سەبارەت بە، ئەحمەدی کۆر، ئەنووسێ، ئەم ذاتە، هۆنەرێکی خوا ناس و صۆفی ڕەوشت و، خاوەن، کەشف و، کەرامات بوۆە، بەواتەیەک خەڵکی ئاوایەکی، لای (شنۆ)و، بە راوێژێکی تر، خەڵکی (عەمباری) لای بۆکانە، هێندێکیش لایان وایە، زایینگەی ئەوان ناوچەی «دهۆک»و. (زاخۆ)ی کوردستانی عێراقە، بەلام لە ئاخرو، ئۆخری ژیانیدا، هاتۆتە موکریان و، هەرلەوێش، مردوە، گڵکۆکەشی لە ئاوایی عەمبارە: کۆر، بەواوی بلاوو گەورەوە، بەواتا کوێرە ئەم هۆنەرەش چونکو، نابینا بۆوە، بەناوی ئەحمەدی کۆر، نێوی دەرکردۆە، لەماوەی ژیانیازۆرجار، چۆتەشارەکانی، کوردستانی عێراق و شام و، عەرەبستان، لە کۆتایی چەرخی دوازدەهەم و، سەرەتای سێزدەهەمی کۆچی مانگیداژیاوە، دەگەڵ ئەوەشا، سەبارەت،بە خواناسی و، موبارەکی ئەم ذاتە، زۆرشت ئەگێڕنەوە، بەلام بەداخەوە چونکو لەپەراوە بیرەوەری و، نوسراوەکانی ئێمەدا. ناوێک لەشێخ ئەحمەدی کۆر، نەبراوە، باری ژیانی زۆر، ڕون نینیە ئەحمەدی کور، هەڵبەستی کوردی

---

١. تائیستا دوو، بەرگی بە چاپ گەیشتوە (فارسی)

تێبڵەی زۆرە بەلاّن، تەنیا پارچە هەڵبەستێکی وەدەس من کەوتۆوە، کەلێرەدا، دەیخەمە بەرچاو:

دیــم لـــە خـــەودا، شـــادو، خـــورّەم یـــاری مـــن بـــادەی دەوێ
دەس لەناودەس، دەم لەناودەم وەی لەخۆشی وێ شەوێ
ئەوشەوە، عەیش و، نیشاط بوو، کەیف و ئاهەنگ و، بیساط بوو
بۆ کزەی دڵ، ئەو، نەجات بوو، ناگەهان، ڕابووم لەوێ
وەختێ بێدار بووم، نەکەس بوو، تەن، سەراسیمەی هەوەس بوو
ڕوح هەراسانی قەفەس بوو، لاڵ و، کەڕ کەوتم لەوێ
لاڵ و، کەڕ وەک (ذوالعُیُوبان) کەشفی ئەبصارو، قُلوبان
بم دەنێ، بێ ڕوی حەبیبان (حاشَ لِلّهْ) نامەوێ
خاکی نەعلی، ئەسپی طاها(طه) سورمە یە، بۆچاوی، ئەعما
ئاخ لەئەم دونیا ،لەمەکری کەس بەڕاحەت ناخەوێ
ئەحمەدی کۆر ،دڵ ویفاق دە،مەیلی وەصلی، یار ،طەلاّق دە
یەک دە خوازی یەک طەلاّق دە، تێکرا نابن دوهەوێ

ی: حاجی قادری کۆیی، هۆنەری نیۆدێری چەرخی سێزدەهەمی کۆچی و، نۆزدەی زایەنی، لە دیوانەکەی خۆیا. لە یەکێک لە هەڵبەستەکاندا لەژێر سەردێڕی «شاهسەواری بەلاغەتی کوردان» دا، کەنزیکەی ٤٠ شاعیری ناو بەدەرەوەی کوردی تێدا هێناوە، باسی ئەحمەدی کۆریش دەکا، دیارەلەسەرە تاوە ئەڵێ، ئەوەی خۆم دیومە یانەخۆ ئەثەری: ئەمەیە، بۆت دەڵێم، بە موختەصەری: پاشان یەک، بەیەک ناوی هەمویان دێنێ، ئەوسا، خەلاّتی شاسواریی مەیدانی بەلاغەت و، دمەوەری، لە ناو، گشتیانا. بەبەژنی شۆڕە سوَاری کورد، موصطەفا بەگی کوردی دەبڕێ هەروەها بەخەلاّت دا بە شکردن دەڕوا، تالەکۆتایی مەیدانەکەدا، کەدەگاتە باغی زەنوێرو، خۆش ئاوو، هەوای ئەدەب و، وێژەو،

ویژه وانی کورد، باغه وانیکه ده داته ده س باغه وانی گوڵ بژێری گوڵ په روه ر، کوێری روشن دڵ و، له خوێنه چۆه دەر، واته ئه حمه دی کوێرو، له هه ڵبه ستی ٥٦ دا ئه ڵێ.

ئه حمه دی کوێر له سابڵاغه: به یته کی داغه، به یته کی باغه: ئه م، ڕا، لێ هاتویی و خاوه ن ده سه ڵاتیتی ئه م هۆنه رانه به م هه ڵبه سته ی دوایی دوپاته ده کاته وه و، هه ڵبه سته کانیان، ده گه ڵ هه ڵبه ستی مه ولانای ڕۆم، دا پیک هه ڵ ده کیشی و، ده یانباته لوتکه ی هه ره به رزی وێژه ی زمانی کوردی یه وه:

ئه مه، مه جموعی شاعیری غه ڕان: هه روه کوومه ثنه وین له نێو کوردان.

ک: **قاضی خضری،** مامۆستای زانای کورد، له به رگی یه که می کتێبه ده س نوسه که یدا (بوزورگان و، مه شاهیری کورد) ئه ڵێ، ئه حمه دی کوێر، له ئاوایی شیوه سماق، سێ کیلۆمیتری شاری شنۆ که ئیستا پێ ده ڵێن شێخ وه سمان هاتۆته دنیاوه، ئه م ذاته له ته صوفدا مریدی مه ولانا خالیدی نه قشبه ندی بوه، له قوڕئان و، فه رمایشی حه ضره تی ڕه سول که لکی وه رگرتوه، له ساڵی ١٢٧٠ ی کوچی مانگیدا زیندوو، بوه، وه ک خوی ده ڵێ:

گه ر، که سێ کا، پرسیاره: بابێ مه علووم، ئه وشوومار: چوه له هیجره ت یه ک هه زاره: دوصه دو، شه صت، به داج: وه ک ده گیرنه وه، ده گه ل شێخ مه لایوسفی بوڕهان نیودێر به شه مسه دین، دا هاتوو، چوی هه بوه[1]

---

١. ئه وه شمان له بیرنه چێ هه رچه ند خودی ئه حمه دی کوێر له پارچه هه ڵبه ستیکا، ده گه ل باس وه په سندی غه وثی گیلانی باسی مه ولانا خالید ده کا، که ده ڵێ: ده ستگیری کون مه را نوفتاده ام ده ر به حری غه م: ئه ی موله قه ب نه زدی حه ق ناوت به غه ین و، واو ثێ: ده ر صه فی روتبه ی ویلایه ت حه ق تورا که رده امام: سه رنیهاده زیری پایه ت جه معی قاف و طی وبێ: یاری توشود غه وثی به غدا، شاهی شامات و، حه له ب: به ڵام من بونه وه ی باشترلێم ڕون بێته وه که

ل : خەلیفە سەیدیانی مهاباد، لە پشت بەرگی کۆمەڵێک ئەهەڵبەستەکانی ئەحمەدی کۆر،دا، کەچاپی[1] کردون، سەبارەت بەشێخ ئەحمەد. ئەڵێ، کۆری مەزن لەپیاوە بەهەستەکان و، هۆنەرە بەهێزەکانی پێشوو حیساب دەکرێ، ئەگەرتێ بفکرین، ئەم کابرایە بۆ خوێ بلیمەت و شێعرەکانیشی وەکو، مۆجیزە وایە، کە لەنێوجەرگەی کوردو، کوردستانی ئێرانی خۆشەویستا، لەناوچەی شنۆ یان محاڵی موکریان لەصەدەی نوزدەهە، ما پەیدا، بوۆە، ئەم مەجنونە کوردە. غەزەلخوێنی حەضرەتی پیغەمبەری ئیسلام و، سەرگەورەی عالەمی بەشەریەت بوۆە، داخەکەم لەبەر ئەوەی صۆفی مەسلەک بوۆە، سەرۆکە دینێیەکان و، مێژوو نوسەکانی دڵ پڕ لەغەرەض و، مەرض و، بەخیل، نەنیۆی دایک وەباوکی و، نەبێرە وەری یان ڕۆژی لەدونیا دەرچون و، مەوتەنیان بۆ، نووسیوە، هەتا بۆشیان کرابێ شێعرەکانیان لێ سوتاندوۆە، قصەی خەراپیان بۆرێک خستوۆە، بەلاّم ئەوەندە، مەعلومە گوڕخانەکەی لە ئاوایی لای عەمباری بۆکانەو، خەڵکی ئەچن بۆرازو، نیاز، لەقصەو، ڕێک خستنی کەلیمەکانی، وا، دەرئەکەوێ خەڵکی لای شاری شنۆبێت، یان زۆر لە گەڵیان دانیشتبێ: تائیرە ئەوەی لەبارەی ئەحمەدی

→

ئەحمەدی کور، لەخواناسیدا پێرەوی مەولانا خالید بۆوەلەسەرەتای سالی ١٣٦٤ هەتاویدا، پاش زیارەتی خاڵەمین لەشاری نەغەدەرا دەگەڵ میرزا برایم و، میرزا موحەمەدی ئەفخەمی بۆکان چۆینە گورگ ناوی و، ماڵی خوشکم، پاشان چوینەشنۆ ماڵی قاضی، پرسی شەوێ لە کوێ بوون؟ گوتمان لەماڵی هەمزەلێتان گوتی منیش هەرلێتانم، دوای ئەوەی هێندێکم باسی خانی لەپزیرین کردو، تاوانی لیێتانی ئەوسا کەم بۆگێراوە، کوتی موستەعید بوم ڕۆژێک ماموّستاکەم گوتی مەلا دەزانی لێتان یانی چی؟ عەرضم کرد خێر، فەرموی ئەوقاموسەی بێنە، کاتی ماکەی لێتانم دۆزیوە نوسی بووی اللیتان کا الشیطان لفظا ومعنی واتە ووشەو، واتای لێتان وەک شەیطان وایە، منیش عەرضی قاضیم کرد، کاتێ قاضی خوێ شایەدە، مونکیربێ بەڵگەو، سەنەدە، گوتی وەشاندت مەلا هەڵبەت بەپیکەنینەوە، بەڕافیکە کۆتایی هات:

١. دیارە بەخەطی مەلا رەحیمی هەوشاری بۆوەو، ئوفسیت کراوە (١٣٤٤)

کۆره‌وه نوسرابوو من ده‌ستم که‌و تبوو، دوپاته‌م کردنه‌وه، ئیستاش ووته‌ی ئه‌و که‌سانه‌ی سه‌باره‌ت به‌وذاته خۆم شتێکم لێ بیستون، یان بۆیان گێرا و مه‌ته‌وه، ده‌یان گێڕمه‌وه، پاشان وه‌ک، له‌به‌را، ڕابرا، به‌پێی به‌ڵگه، بیرو، بۆچونی خۆم را ده‌گه‌یه‌نم، هیوایه توانی بم گۆشه‌یه‌ک له‌ژیان و، ئاڵ و گۆڕی بیرو، باوه‌ڕی ئه‌م ذاته‌م، تاراده‌یه‌ک ڕون کرد بێته‌وه:

م: مامۆستای زاناو، پایه‌به‌رزم، خوالێ خوشبو (مه‌لاعه‌لی وه‌ڵزی)[1]

له‌وڵامی پرسیارێکی منا، سه‌باره‌ت به‌ئه‌حمه‌دی کۆرفه‌رموی، ئه‌وه‌ی له‌حاجی مه‌لاعه[2] وڵای وه‌ڵزی باوکم بیستومه، بۆت

---

١ . ماموستاوه‌لزی، که‌مامۆستاو، ده‌رس ویژه‌وه‌ی هه‌موزانسته ئیسلامیکان بوو، به‌راستی وه‌ک مه‌له‌وانی چاک له‌زرێ و، ده‌ریای، زانینه کۆنه‌کانا، به‌تابه‌ت فه‌له‌کیات، زیج، اوسطوڕلاب و، ئه‌ستێره ناسبی دا، پێ مه‌له‌ی ده‌کرد، بۆخویندنی ئه‌وزانستانه فه‌قێ و، خویند کار، له‌ناوچه دوره‌کانی کوردستانی ئێران و، عێراق و، تورکیاوه، بارو، بنه‌یان، لێک ده‌ناو، ده‌هاتنه ئاوایی حه‌ماميانی بۆکان و، ماوه‌یه‌کی زۆر، له‌سه‌رحه‌صیرو، به‌ڕه‌شرە، به‌نانی ویشک و، بێ پێخۆر، له‌حوجره‌ی تاریک و، تنوک و، ساردو، سڕی ئاوایی دا له‌سه‌ر چۆک دا ده‌نیشتن، هه‌ڵبه‌ت منیش به‌تایبه‌ت پاش گه‌ڕانه‌وه‌ی عیراق و، مه‌ریوان له‌ساڵه‌کانی ٤١ و ٤٢ واته‌سه‌ره‌تای ٤٢ ی کۆچی هه‌تاویدا تا که‌وتمه به‌ندیخانه‌کانی ڕه‌شی شا (قزڵ قلعهٔ تاران) له‌خزمه‌ت ئه‌وذاته پیرۆزه‌دا ده‌رسی فه‌لسه‌فه‌و، فه‌له‌کیانم ده‌خوێند، پاشان له‌ساڵی ١٣٤٦ دا. له‌لایه‌ن ئه‌وانیشه‌وه، ئیزنی مامۆستایه‌تی و، ده‌رس گوتنه‌وه‌م، وه‌رگرت، که‌نمونه‌که‌ی له‌پێشه‌کی چاپی دوهه‌می فیقهی شافیعی دا چاپ کراوه، ده‌گه‌ڵ به‌رکولێک له‌پێناسی منا، ده‌ویدا، وه‌ربه‌رچاو، ده‌که‌وێ دیاره ئه‌و اجازه‌نامه‌یه به‌زمانی عه‌ره‌بیەو، مامۆستا مه‌لا حوسینی مه‌جدی مهابادو، مامۆستای ناوبراو (وه‌ڵزی و، هی تر)نوسیویانه‌و، امضایان کردوۆه:

٢ .حاجی مه‌لاعه‌وڵا، به‌فه‌قێیه‌تی له‌ئاوایی وه‌ڵزی لای گه‌لاڵه‌ی باڵه‌کایه‌تیوه، دوای تێپه‌ڕاندنی پله‌و، قۆناغی سوخته‌یه‌تی، له‌به‌را، ده‌چێته هه‌ورامان و، پاشان دێته ناوچه‌ی موکریان و، سابلاغ، دوای وه‌رگرتنی ئیذنی مه‌لایه‌تی له‌ئاوایه‌کانی په‌سوێ لاجان و، کانێ ڕه‌شی لای سه‌ردار ئابادی بۆکان و، تورجان دا، ده‌س ده‌کا به‌ده‌رس گوتنه‌وه‌وبه‌ڕێوه بردنی فه‌رمانه‌کانی ئیسلام و ڕه‌وشتی خواناسی نه‌قشبه‌ندی، ئه‌م ذاته‌ش پیاوێکی زۆرخواناس و چاژان و، له‌دنیا ته‌ره‌که‌مه‌و، که‌تره‌خه‌م بوۆه، له‌ساڵی ١٢٧٥ ی کۆچی مانگیدا له‌ئاوایی وه‌ڵز، هاتۆته دنیایه‌وه، له‌ساڵی ١٣٦٠ شاله ئاوایی تورجان کۆچی دوایی کردوەو، گڵکۆیه‌که‌شی هه‌ر ئه‌وێ یه، دیاره‌له‌پاشا نیش هێندێکی دی، له‌سه‌ر ئه‌م باسه‌ده‌ڕۆین

دەگیڕمەوە، ڕۆژێک حاجی مەلا، دەگەڵ حاجی[1] بایزاغای ئێلخانی زادەی دێبۆکری لە ئاوایی کانی ڕەش سەبارەت بە ئەحمەدی کۆر پێکەوە ئاخوان و، دەیان گوت ئەحمەدی کۆر، کۆری مەلا موحەممەدی بابە باوکی لەلای شنوۆوە هاتۆتە داشبەندی سەیفە[2] دینی خانی موکری، پاشان هاتۆ تەعەمبارو، بۆتە بەر نۆیژو، ماموستای ئەوێ، ئەحمەدی کۆرلە عەمبارلەدایک بوۆە، لە تەمەنی پێنج شەش سالّی دا، بە، نەخۆشی خورێلکە، سۆمای چاوی لەدەستدەدا، لەلای باوکی خۆیندنی قورئان و، تەجوید، دەس

١. حاجی بایزئاغا، باوکی حاجی رەحمان ئاغای موهتەدی (ماموستای زانستگەی ئیلاهیات و، مەعاریفی ئیسلامی تاران) یەکێک بوۆە لە هەرە پیاوە خێرەومەندو، نێوبەدەرەوە کانی ناوچەی بۆکان، دەگەڵ ئەوەشا، دەرە بەکایەتی ئەوساکە زۆر باو بوۆەو یاسای چەوسێنەرەوەش بە واتای تەواوی ووشە، بەسەر هەمو، ولاتاسە پێندراوە، ئاووڕ دانەوە، بۆ سەرزانست و، لەش ساغی و، باری کۆمەلایەتی و پاک و، خاوێن ڕاگوتنی، ئاوایی، بەدەگمەن، هەڵ کەوتوۆە، زۆرسەرنجیش نەدراوەتە بەڕیوە بردنی ڕیّو، شوێنی ئایینی. ئەم شەخصە، ناکۆکی و، کێشەی ناوهۆزەکان و ناڕێکی نێوان خەلکی لەلایەکەوە، دادەمرکاند، ڕێزی ماموستاو، زاناو، فەقیێ زۆر لە بەر بوو ڕۆژانی سێ شەمەو، هەینی، ماموستاو، فەقیێ کۆ، دەکردەوە باسی زانستی وێژەو، ئەدەبی دە هێنا گوڕێ وە، پیلەیان لەسەردە کرد. بۆ ئەوەی فەقێ ڕابێن و، ماموستاکارا مەو، دەمەوەربن خۆشی کەلەزانستی وێژەو، ئەدەبی فارسی وعەرەبیدا، دەسەلات داربوۆە، جاروبار، قەراغی بۆتێکردونەوە، هەرئاوایەکی دەیکری فێرگەو، مزگەوت و، حەوض و، جیێ نۆیژی تێدا، بنیات دەنا، وا، هەڵ کەوتوۆە پاش ئەوەی نیازی جێیەکی دا بین کردۆوە حیێی اهێشتوۆە، جێیەکی کەی کڕیوەو، ئەویشی ئاوەدان کردووتەوە بەم پێیە، دە توانین بلێن، لەو کاتەدا، کەزانستگەیەکمان نەبوۆە حاجی بایزاغا بە پێک هێنانی ئەم فێرگە ئایینیانە، چەن زانکۆوی لە ناوچەی بۆکاندا، دامەزراندۆوە ئەو کارە، تائێستاش بۆتە هۆلی بە باش نێوبردنی ئەوان، دیارە هەرخودا شەپاداشتی هەموو، کردەوەیەکی باشی پیاوی خێرەو مەندنەداتەوە:

٢. سەیفەدین خان، کوڕی سەردار عەزیز خانی موکری، فەرماندەری گشتی قشونی ناصرەدین شای قاجارە، بەواتەی دۆموڕگان، لەسەردەمی ژیانی خوێدا (سەیفەدین خان) کەسێکی زاناترو، لێ زانتر، نەبوۆ بەر بەرە کانی بکا، ئەمیرنیظامی گەروسیش زۆری جامین وێستوۆە، بەلام بەداخەوە، تەمەنێکی زۆری، رانەبواردۆەو، بەدەس خیزانی وە، دەرمان داو کراوە، دیارە دەسیەی سەرەک هۆزی دەرەبەگایەتی ئەوساکەش لە کارا بوۆە ئەوەش بیژین، حەمە حوسین خانی کوڕیشی هەر بەدهۆی، دەرەبەگە کانی ناوچە، لەشاری مەراغەدا، لەقەنارە دراوە بڕوانە پیشەکی، ئاداب و، روسومی کوردان، نوو سراوەی محمد پور



**ماموستا مه لاعه لی وه لزی   ت : ۱۳۱۰ه –ق : م ، ۱۲۶۸ه – ش**

ف : شه وی جومعه ، مانگی رد مه ضانی ۱۳۵۲ه– حه مامیانی بوکان خوا، لی خوشبوو گه وره ماموستای چازان و ، هه ل که وتوم ، له ماوه ی ژیانی پرپیتیدا ، ده یان ماموستای ، ود ک دوکورد ناودیره کانی خوی واته : حاجی مه لا موحه مه د ( ۱۳۵۴–۱۲۹۶ش ) و ، حاجی مه لا نه حمه دی ( ۱۳۶۸–۱۳۰۵ش ) پی گه یاند . دیاره منیش له خزمه ت ئه م داته دا ، دد رس خوینی بوم و ، ئیدنی ماموستا یه تیشم لی وه رگرتون .



ماموّستا مه لاحه مه ده مین ئه حمه دیان ( قاجری )

پێ دە کا، لەماوەیەکی کەمدا، تەواویان، دەخوێنێ و لە بەریان دەکا، پاش ئەوەی بڕێک بەخۆیادیو، پەلی ئەستووردەبێ، زۆر جوابی باوکی، کەپیاوێکی زۆر خووایی بووە ناداتەوە، لەجیاتی خوێندن و، ڕولەچاکەکردن، دەکەوێتە شوێن گەمەوکایەی منالان و، گۆرانی گوتن و، گێرانی چۆپی و زەماوەندو، ڕەش بەڵەک و، شەوداوەت، تاوای لێ دێ، دێ بەدێ بۆ گۆرانی هەڵپەڕکی و، گۆوەند، لێی دەگێڕنەوەو دەی بەن، بەپێ هۆش و لێ هاتویی خودا، پێداو، لەم هەمووە، هات و چوو، هەڵ سورانەدا، زۆر کەم، بەڵکوو، بەدەگمەن نیازی بە چاو ساغیش پەیدا کردووە، لەشەڕە فڕهاوێژیشدا (واتە موشێعرین و، پیلەو، دەمەلاسکا کردنەوەی بە هەڵبەستی کوتووپڕو، خۆ کردی خاوەن کێش یان بەیتی ها وپیتی پڕ لە جوێن و، قصەی سووک و ناخۆش کە، بو بووڕدان و، بەزاندنی یەکتر، وەک شەڕەبالۆرەی کیژولانی ئەوساکە، لەنێوان بوێژو، خۆشخوێن و، شەیارە کوردە کانا بلوە بووە) زۆر، دەمەوەرو، تەڕدەست و، شەیار بەزێن بووە، بۆ وینەجارێک بۆ بوزوو، نانەوەو جاجم تەنین، دەچێتەلای جۆلا، لە ئاوایی بۆگەبەسی، وا، هەڵ کەوتووە، جولە کەیەکی، زور، سەیرو، سەمەرەو، فڕهاوێژی لێ دەبێ کاتێ هەوالی هاتنی ئەحمەدی کۆر، بەدەرەبەگی ئاوایی دەگا بانگیان، دەکاتە، دیوەخان و، حەوتەیەک نایەلێ ئەحمەدی کۆر، بگەڕێتەوەو، شەڕە فڕیان پێ دەکا، تالەئاکاما، کابرای جولەکە، لەفڕ دەکەوێ و، بوڕ دەخوا، ئەم کوێرە هەروەها، ئەسپی هەواو، مرخی خۆی لەمێرگ و مێرگوڵەی خۆشی و، ڕابواردن و سەرەڕۆیی کاتی لاویدا بەتایبەت پاش مردنی باوکی لە سالی ١٢٣٩ هـ ق دا کەتەمەنی ئەحمەدی کۆر نزیکەی بیست و پێنج شەش ساڵ

بۆوە، و،ئیدی کەسێک نابێ سەرکۆنەی بکا ) بەرکێفی ئارەزو، لــینگ داوە، تا ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان، تیشکی، بیرو، باوەڕو، بریسکەی پڕ تەوژمی خوداپەرستی، کە، لەماکەو، سورشتی هەمو، چەشنە ئادەمیزادێک دا، شێردراوە تەوەو، خوداوەند، ئاوێتەی لەشی و گیانی، گشت گیانداریکی کردۆە، دەهانای دێو، ئەو کوێرە لەدنیای تاریک و سەرلێ شێواوی و، بلەوەزی، ڕزگار، دەکا، سەرنجی بۆ بیر کردنەوەو پەندوەرە گرتن، لە ڕابردوو، ڕادە کێشی، ئاوێنەی دڵی بێ گەردو، خەوشی خۆی، بە ئاوی زوڵاڵی تۆبەو، گەرانەوەو، پاش گەزبونەوە، لە هەموئاکاری کۆن و ڕابراوی مشت و، ماڵ دەدا، گیانی خواپەرستی و، خواناسی راستەقانی بێ فڕو فێڵ و، تەڵەکەو، داونانەوە،بۆگرتنی خەڵکی بێ تاوان و، نەخوێندەوارو، کۆکرنەوەی مەڕو، ماڵ و سامان، نیۆدەر کردنی بی ناوەرۆک ونیشان، بە، بەرلەش و، گیان و فام و، هۆش و ئاکاری خۆی، دا دەکا،بۆ هەتاهەتایە دەبێتە، سەرعێلی خێڵی خواناسانی کوڕی ڕۆشن دڵ و بیرروناک و زێدخۆشەویستی گەل، لە هەموو، ناوچەکانی کوردستانا.

## کارەساتە کەش بەوجۆرە بوۆە

ئەحمەدی کوڕ لەساڵەکانی ١٢٤٠ ـ ١٢٤١ دا، پاش ئەوەی زەماوەندیکی زۆر قورسی چەن شەوو، چەن ڕۆژە لە ئاوایی (قورمیش) دەیازدە کیلومیتری باکوری بۆکان، بەدەنگ و، هەلبەستە خۆ کردەکانی، بەرێوە دەباو بەرەو، (عەمبار) دەکەوێتە رێ. دیارەوەک گوترا، بەتەنیایی و، بێ چاو، ساغ بووە، پاش ماوەیەک ڕێگە رۆیشتن. لەناکاو، دەکەوێتە ناو،

گیژاوی بیرو، خەیاڵاتەوە، ئاگری پیلەو، خۆ، سەرکۆنە کردن، بڵێسە لەدەرونی پاکی هەڵدەستێنێ بەتیری توانج و، پلاری ڕەخنە، ڕابوردوی خۆی دەکاتە نیشانەو، یەک بەیەک دەیان ئەنگێوێ. زمانی حاڵ، لێی، دێتە قصەو، دە گوێ، دەسرتێنێ و، دەڵێ:تاکەی گوناحی خەڵک وە ئەستو دە گری، تێکەڵ بونی، نێرو، مێی:ژووانی شەوان، دەس گوشین و، ڕێک خشان، بەڵێنی کیژو کوڕان کەلێن و، کولێن. کردنی، لاوو، گەورە کچان، پێک دێنی، سبەینێ لەمەیدانی خێرو، شەڕا ولامی ئەحمەدی موختارو، خوداوەندی میری مەزن چۆن، دەدەیەوە، ئاخر توش ناوت ئەحمەدە، چۆنت لەرو هەڵدێ بڵێی منیش ئەحمەدم و، ئۆمەتی ئەحمەدیشم، بەکورتی ئەوەندە بەوبیرو خەیاڵاتەوە، دەڕوا، هەست ئەکا، ئەوە ڕۆژی قیامەت ڕابوەو لەخزمەت حەضرەتی ڕەسولدا، ڕاگیراوە، پرسیاری لێ دەکرێ هاواردەکاو، بەرودا، دەکەوێ و، لەسەرە خۆدەچێ.ماوەیەک نایەتەوە هۆش پاش ئەغیاربونەوەو، وەخۆهاتنەوە، هەست ئەکا، ئەوە لەنێوانی دۆڵ و، دەرەی نێوان قورمیش و، ئەشکە[1] وتان دایە، دیسان دەس دەکاتەوە گریان، بەکوڵی هەنیسکدا ئەوە لەهەموڕا بوردوی پاشگەز دەبێتەوە، تۆبەدەکا، بەدڵ بەڵێن ئەدا تازە نەگەڕێتەوە سەرگۆرانی و، شەو دا وەت و گ مەو، گاڵتەی باوی لاوێ و، عومری بەفیڕۆ بردو. پەیمان دەبەستێ لەمەودوا، دەس لەپێی هەڵگوتنی نۆ ئەمام وشەنگەبێری خەزیم شۆڕو، گەردن زراو، کەڵەگەت و، لاو، بۆنەماو، هەڵ گرێ و ببێتە بولبولی دڵ سوتاوو، ئەوا خوێنی ذاتی وەحدەت نافەرین و،

شفیع المذنبین. دیارە مەرجەکەی وەک پیاوان دەبا تەسەر

[1]. ئەشکەوتان گوندێکە لەنێوان قورمیش و، داشبەندی لای بۆکان

کاتێ بەو حاڵ شێواو ێیەو، بەم جەغتو، تۆبەوە دە گەڕێتەوە ئاوایی عەمبار خۆی.دە خزێنێتە. قوژبنی حوجرەیەکی کۆنو، تاریکەوە، دەس دەکا بە ڕازو، نیازو، نزاو، پاڕانەوە لەبەردەرگانە کەی خودادەندی خاوەن بەزەیی و، دڵۆڤان.لاوو، گەنج و، پیرو، زۆرهان، بەپێی باوی هەمیشەیی، بەتەپڵ، و، توزەلەو، ثمشاڵ گوڕەو، چڕە. دێنە گۆڕکی، گۆرین، بۆچۆپیو، دیلانو، هەڵپەرین، دەکەونەشوێن ئەحمەدی کوێر، بونە وەی وەک جاری جاران، کوڕی زەماوەندە کەیان بۆ گەرم کاو، گەڕی هەڵپەرکیان بۆ بمەیوێنێ، دوای دۆ زینەوە، هەرچی، تکای لێ دەکەنو، لەبەری دە پاڕێنەوە ولامو، بەرسفیان ناداتەوە، پاشان هەواڵە کە بەدەرەبەگی ئاوایی رادەگەیەنن. ئەویش بە هەڕەشەو، گوڕەشەوە فەرمانی پێ دەدا. بەلام نازانێ ئیتر ئەحمەدی کوێر ئەو ئەحمەدی جاران نییە، شەبەقی ڕۆژی خودا. پەرستیو، هەستی ئەوینی پیغەمبەر خۆشەویستی، دڵی، لەهەموو، ژەنگو، تاریکیێکی ڕا بوردو، خوو، خدەی دزیوی هەوا، پەرستی، بۆ هەمیشە شتۆ تەوەو، ئیدی بە هەڕوو، گیفو، گەفی ئەمو، ئەو، تازەڕچەی خۆی بەرنادا، تادە گاتە لوتکەی بەرزی ئاوات، ئەشی ئەم ڕێگا پڕ چڕو، هەڵدێرە ببڕێ ئاغادێ نای ئاوزێ بزانێ، تیشکی خواناسیو، دۆزینەوەیڕێگای ڕاستەقانی ئەم ذاتەلەبڕۆ چنەی بیرەوە،هەستو، مێشکیوا، ڕوناک کردۆ تەوە، بە گێژەڵوکەو، گەردەلولی ترسوە بەرنانی، لەتەوژم ناکەوێ. چرای ئیمانو، بڕوای بە فوی لێ تورەبون، وە،پرتەپرت ناکەوێ،لەولاما گوتی ئەوەی تائێستالەمنەوە دیوتانە نای بیننەوە، جائەوەبوو، لیرەڕا، وەگ دەیان هۆنەرو، رۆشن بیرو، بەهەستی کورد توشی دەربەدەریو، هەڵوەدایی هەندەران، بوو، پاش ماوەیەک سەرگەردانیو، مەینەتو،

سه ر کۆ نه کردن، له لایه ن ویشکه موسوڵمانه کانی ناوچه وه، زۆرده کاته سوله یمانی و، ماوه یه ک له مزگه وت و، ته کیه ی مه ولانا خالیدی شاره زوریدا، خه ریکی خودا، په رستی ده بێ. به ڵام له وێش، وێــی، هه ڵ نــا کــه ن و، ناچار، ڕۆ ده کــاتــه شــاری کـــۆ، پــاش ماوه یه کی که م، ئه وێش جێ دێڵێ و، به ره و، نه هری ده که وێته ڕێ، له ئاخرو، ئۆخری عومریدا، کوڕه گه وره که ی به ناوی[1] عه بدولا ده که وێته شوێنی و، ده ی هێنێته وه بۆ عه مبار، دوای چه ن ساڵێک له ته مه نی نزیکه ی صه دو، ده ساڵیدا وه فات ده کا، له پاشان مامۆستا ڕووی تێ کردم و، فه رموی (عه بدولعه زیز) ئه وه شت پێ بڵێم هه ر ئه و کاته ی ئه حمه دی کوێر، له سه ره خۆ چو بووو، ته واو هۆشی نه هات بوۆه، به ر،خدری زینده ی لێ په یدا، ده بێ و، ده ڵێ، کوێره، به ئاوات و، مرادی خۆت گه یشتی،ئیدی،نه چی بچیه وه،سه ر، کاری ڕابوردوت، ئه حمه دی کوێر خوینده وار نه بۆوه، ته نیا قورئانی له به ربۆوه، به ڵام دوای ئه وه ی ڕێگه ی خواناسی ده گرێته پێش تائه وجێگا یه ی بۆی کراوه کۆڕۆ، ئاڵقه ی ده رس و، وتوو، ویژی ما مۆستـا و، فه قیـێ، به ر نه داوه، بـه و هـۆشـه خـودا پـێداوه ی خـۆ ی له ده ریای زانستی ئه وان دا، پاش ماوه یه ک بۆته مه لو وا نێکی باش به تایه به ت له واتای قورئان و، حه دیث که ڵکی وه ر گر تۆوه، له ئا کاما، ده سه ڵاتێکی باشی به سه ر ته فسیرو، لێکدا نه وه ی قورئانی پیروز و، فه رماییشه کانی حه ضره تی ڕه سول و، وێژه و، ئه ده بی فارسی و، عه ره بیشدا. په یدا کردوۆه. وه ک باوکم و حاجی بایزئا غاباسیان ده کرد شێعری تور کیشی بۆوه، به و جوره ی ده ڵێن، له طایه فه ی سه ره گایه که میرزاحه مه ده مینی ئیڕه ش واته حه ماميان هه رله و طایه فه یه، ئه وه بوونه وه ی له جستانی ساڵی ١٣٤٢ دا،

[1] . دو کوری دیکه ی به ناوی قادر و موحه مه دو کچیـشی بوۆه به ناوی له یلی:

لەدەمما مۆستای خودالێ خۆشبوم مامۆستا لاعەلی وەڵزیم بیست، هەڵبەت، دیسان کەمێک لەسەرباسی مامۆستا مەلاعەلی دەڕۆین:

ن: وەستا کەریم خەڵکی ئاوایی هەباس ئاوا، ڕاوچی بەناوبانگی ناوچە کە بە پێ ووتەی خۆی زاینگەو، پەروە رشتگەیان ئاوایی عەمبار بوۆوە لەتەمەنی نزیکەی ٩٧ ساڵیدا، لەساڵی ١٣٣٧ ی کۆچی، هەتاویدا، کۆچی یەکجاری کرد.

س: کەریم خدرباغەوان خەڵکی عەمبار، لەتەمەنی نزێک بە ٨٥ ساڵیدا لەساڵی ١٣٣٧ دا، بۆ هەمیشەسەری نایەوە

ع: صاڵحی مەشۆشی: دانیشتوی ئاوایی داژبەند، لەتەمەنی نزێک ٧٠ ساڵیدا لەساڵی ١٣٣٦ دا، کۆچی دواییان کرد.

ف: حەمەموسای قازانلی: وەک خۆی دەیگوت زاێنگەی ئاوایی حەما میان بوۆوە، لە.ساڵەکانی ـ ١٣٤٦ ـ ١٣٤٧ دا، لەتەمەنی نزێکەی ٨٠ ساڵیدا، بۆهەتا هەتایە کۆچ دەکا، دەیان گوت با پیرەمان، هاو چەرخی شێخ، ئەحمەد بوۆەو، زۆرجارچونەتە خزمەتی، ئەوجورەی ئەوان بوباوکمانیان گێراوەتەوە،بەم چەشنەش ئێمە، بۆ، ئێوەی، دەگێرینەوە شێخ ئەحمەد. هەربە منداڵی کوێر بوۆە، بەلای باوکیۆە، لەحەوت ساڵیۆە دەستی کردوۆە، بە خوێندن و، لەبەر کردنی قورئان و، زۆر زوو، تەواوی دەکا، هەر لە منداڵی یەوە خواناس و، خووباش و، پاک ڕەوشت دەبێ تا دەگاتە هەژدە نۆزدە ساڵانە، ئەوسا، دەگەڵ هێندێک حجێڵ و، دەم ڕۆت دەبێتە هاواڵ و، لەرێگەی لادەدەن، ئیدی جوابی بابیشی ناداتەوە، بەتایەبەت پاش ئەوەی باوکی وەفات دەکا، ئەوجار، دەس بەکاری دزێوو، ناحەظ، گۆرانی گوتن و، شەو، داوت و، شتی وا، دەکا، تائەوەی ڕۆژێک خودا، دەدڵی دەنێ و، دەگەڵ، هێندێک کاروانی، بە نیازی زیارەتی

مه رقه دی غه وثی گه یلانی به ره و سوله یمانی عیڕاق ده که وێته ڕێ، له لای سوله یمانی، خه وی به سه ردا، دێ و له کاروان به جێ ده مێنی و، ڕێگای لێ هه ڵه ده بێ، کاروان چییه کانیش بۆی ناگه ڕێنه وه و، ده لێن، هه ر. جۆرێک بێ خۆی ده گه یه نێته سوله یمانی و، که سێک ده بێ ڕێ نوێنی بکا. له م شاخ و، چڕو، لێڕه واره دا، له کاتێکا نه ده نگی، وه که س، ڕاده گاو، نه ده ستی ده گاته هیچ قۆناغ و، شوینێک و، هه رچی ها وارده کاو، کومه ک ده خوازێ، هه ر گوێی که له ده نگدانه وه ی ده نگی خۆی ده بێ و، به س، له لایه کی تریشه وه، برسیایه تی برستی لێ ده بڕێ، شه که تی و، شه لاڵی هه ڵسوران و، بانگ ئاواز کردنیش، خوستی لێ ده ستێنێ، به ناهومیدی و، هه ناسه ساردێوه ده س ده کا به پاڕانه وه و، لالانه وه، له به ر قاپیه ی حه ضره تی باری ته عالا، پاش ماوه یه ک گریان و، نزا کردن، خدری زینده لێ په یدا، ده بێ، دڵێ کوێره چت ده وێ، ده لێ، ڕێگام لێ وون بۆوه، ده ستی ده گرێ و، ده ی خاته وه سه ر، ڕێ، دیسان به ئه مری خودا. ڕێگه که گوم ده کا سه ر له نوێ، خدری زینده دێ و، دستی ده گرێ و، ده یباته وه سه ر، ڕێگا که و، ده لێ کوێره بڕۆ، ئیدی ریگات لێ بزر نابێ، ئه حمه دی کۆر، نه ختێک ده ڕواو، به خۆی ده لێ، بێ و، نه بێ ئه وه حه ضره تی خدری زینده بوو، ده ستی وه ک هوڕه ی لۆکه یه، هیچ ئێسکی تێدا نیه هه ر ئه وه و، که سی دی، ئه م چه ل، به ئان قه صت، خۆی له ڕێگا، هه ڵه ئه کاو، ده لێ بۆ، خاطری خودا، ده فه ریام که و ن، خدری زینده دێ و، ده گه ڵ، ده ستی ده گرێ، ئه حمه دی کور به ده ستیدا، ده نووسێ و، ده لێ، تا به مرادم نه گه یه نی به رت ناده م، ئه تۆ خدری زینده ی، کوێر بێ و، به شتێکه وه بنووسێ، ئه ویش به ناچارده لێ چیت لێم، گه ره که، ده لێ، ده مه وێ له مه و ولاوه هه ربه خودا و

پیغه مبه ر هه ڵ بلێیم ده ڵێ زارت بکه وه، فووی به زاری دا، ده کاو، ده ڕوا، جا هه ر له وێوه، تیشکی ڕۆژی خودا په رستی راسته قانی له ده لاقه و، که لێن و، قوژبنی دڵی، ده گه ڕێ و، به نوری خودایی، ئه حمه دی کوڕ، ده بێته، بولبولی، ئه ناخوانی گوڵی ئه وینی خودانا سی و، په سندی حه ضره تی ره سوڵی موختار.

ص: میرزا حه مه ده مینی میرزا با ییز، خه ڵکی حه ماميان، ده یگوت شێخ ئه حمه د له طایه فه ی ئێمه یه، دیاره پێمان ده ڵێن، سه ره گا چه ن بنه ماڵه یه کمان له ئاوایی شۆڕیجه ش هه یه، باوکی شێخ ئه حمه د ناوی شیخ مه لا موحه مه د بوو، به ڵام چونکو له وتوو، ویژدا، زۆره و وشه ی با بۆی ده کارهێنا وه، نێوی بابۆی لێ نراوه مه لا موحه مه د به فه قێیه تی له زێو که و، ماشکان (دوئاوایین له لای سیلوی، ناوچه ی به ربنه ی لاجانی سه ربه خانێ پیران شاره وه) ده چێته شنۆو، سابلاغ، پاش له خۆو، بونه وه ی ده رس خوێندن له دێ یه [1] کی شنۆ، ده بیته مه لاو، هه رله وێ ژن [2] دێنێ، شێخ ئه حمه دی له وێ له دایک ده بێ، دوای ماوه یه ک، به هۆی نا کۆ کیوه دیته داشبه ندو، عه مبار: مه لا موحه مه د، خۆی مریدی مه ولانا خالید بووه و، چه ن جار ده چێته خزمه تی و، له م ڕێگایه شدا، گۆیا، تا، راده یه ک سه ر که و توو، بووه.

ق: مام حه مه، وه ک دۆستی به ڕێزم، میرزا برایمی ئه فخه می بۆی گێڕا و مه وه گۆیا نه بیره ی شێخ ئه حمه ده، گۆتویه تی کاتێ شێخ ئه حمه د، له نزیکه ی صه دو، سی، چل ساڵ له وه پێش ده یه وێ ئه مری خودا، به جێی بێنێ ماڵ و، منداڵ و، که س و کاری خۆی کۆده کاته وه و، ده ڵێ: من شه وی جومعه ی ئایه نده، گیان به گیان

١. ئه و ئاوایی و گونده ش وه ک له پاشان باسی ده که ین شیوه سماکه، که نیستا پاڵی وه شاری شنۆداوه
٢. گۆیا نیوی شه مزین بووه:

نافه رین ده سپێرم، ئێوه شیوه نم بۆ مه که ن و، له خۆتان مه ده ن، زۆر ساده بم نێژن، گۆزه که شم له لای باو کم، له سه رئه و ته پوڵکه ی ڕو کاری موچه که هه ڵ که نن و، له وێ به خا کم بسپێرن، هه رمام حه مه سه باره ت به که ڕامات و، گه وره یی شێخ ئه حمه دگوتویه، کاتێ ژن، ژانیان هاتۆ تێ و، به ژانه وه بون و، دره نگ لێ بونه ته وه، چون کڵاوه لبادینه که ی شێخیان هێناوه، ئاویان پێ خواردۆته وه خودا، ده فریایان هاتوۆه، (به ڵام من مه لا عه زیز) سه باره ت به گه وره یی شێخ ئه حمه دو، خۆبه که م زانی ئه وذاته، ده گه ڵ ئه وه شا به گوڵێک به هارنایه و، به پیلێک ده ریا، ده تاریف نایه، ده ڵێم ئه وه نده به سه، له ماوه ی ژیانیدا، ناوی ئه حمه دو، کوڕ، که نێوێکی ناحه ظ و، دڵ بێزه له خۆی نه کردۆ ته وه و، به ناز ناوی دورو، درێژ خوو، خه صڵه تی ڕا بوردوی له خه ڵک نه شاردوته وه، له هه ر پارچه هه ڵبه ستیکا به سه ر خۆی دا هاتۆوه و، وه بیرخه ڵکی هێناوه ته وه که من هه ر ئه و، ئه حمه ده کوێره ی سه رده می لاویم و، ئێستاش نه که وتومه ته سه ر ڕێگای خودا ناسان، ته نانه ت کاتێ ده بیسێته وه ناوی شێخیان به سه ر، دا،بڕیره، ئه ویش له کاتێکا ئه ونێوه زۆر، به ڕمین بۆوه بووێنه شا کانی قاجاریش، وه ک خه ڵاتێکی فره به نرخ، به به رهێندێک که سیان، دا، ده کرد، بێ ئه وه ی خۆی شلۆی بکا، ئه م ناوه ش، له سه ره خۆی لاده باو، ده لێ، ئه حمه دی شێخ باب پده ر، مه دحی نه بی خیرالبشر: گه ربوۆت، ته واو، بێ بێ به صه ر، ئه یمه ن له خۆفی مورته عیب:

لێره دا، ئه وه ی له باره ی شێخ ئه حمه ده وه نوسرا بو، یان بیسترا بوو، کۆتایی هات و، ئێستا، ده گه ڕێنه وه، سه رنو سراوه کان و، لێ تۆژینه وه یان بۆنه وه ی، وه ک له به را، ڕامان گه یاند بوو، راسته قانی ژیان و، به سه رهاتی ئه حمه دی کوڕمان باشتر بۆڕون بێته وه.

دەگەڵ ئەوەی زۆر بەی ئەو کە سانەی باسمان کردن و، سەبارەت بە ئەحمەدی کۆر شتێکمان لێ گێرا نەوە. دیاردەوئا ماژەیان بوۆ، چەرخی سەردەمی ژیانی شێخ ئەحمەد کردوەو نووسیویانە. لە چەرخی سێزدەهەمی کۆچی مانگیدا، ژیاوە بەلام هیچکام بەڵگەیەکیان لەو بابەتەوە، نەهێناوەتەوە، تەنیا مامۆستا قاضی شنۆ نەبێ، ئەویش بەهەلبەستێک بەنێوی نمونە قنیاتی کردوەو، بەکەلک وەرگرتن لەم هەلبەستەکە، بەحیسابی ئەبجەد، ئەکاتە ۱۲۷۰ دەڵێ، ئەحمەدی کۆر لەساڵی ۱۲۷۰ دا، هێشتا هەر زیندو بوەوە، دیارە ئەم شێوە نوسینە، لەروانگەی ڕاقەو، توێژینەوەی زانستیدا، زۆر لەبەر، دڵ، نی یە.

۱: **مامۆستاعەلاعەدینی سەجادی، تەنانەت بۆ نمونەش هەلبەستێکی. لە هۆنراوەکانی ئەحمەدی کۆر نەهێنا وەتەوە، هەرئەوەندەیێ راگەیاندوە، ئەم ذاتە لەچەرخی سێزدەهەما ژیاوە،**

۲: دوکتور مەجدیش، هەربەوەی لەباوکی پایەبەرزو، چازانی خۆی و مامۆستای ئێمەخوالێ خوشبوو، حاجی مەلاحوسینی مەجدی بیستوە، کە ئەحمەدی کۆرلەچەرخی سێزدەدا، ژیاوە، وازی لەبەڵگەهێنانەوە هێناوە

۳: کاک (قادری قاضی) بێ ئەوەی قامک بۆ سەردەمی ژیان و، بەسەرهاتی ڕاستەقانی ئەحمەدی کۆر، ڕادێری. دێتە سەر چیرۆکی خدری زیندەو، فوو، بەزاراکردن و، بون بەشاعیر، پاشان دەڵێ، هەلبەستەکانی ئەحمەدی کۆریان خستە ناو چومی (دەجلە) وە. وەک دەزانین ئەم زێیە، بەناوە راستی بەغدا دا، ئەڕوا، خەڵکی بەغداش زۆر بەیان عەرەبن و، لەکوردی ئەویش شێعری ئەحمەدی کۆر نەگە پشتون تابیان بەن، دەچومی. دەجلەیان باوێن، دیارە زۆریش دورە مامۆستاو، مەلاو، صۆفیوە دەروێشی سولەیمانی ئەم

هۆنراوانەیان بردبێتە، بە غداو، لەوێ بە ئاویان دا، دا بن ڕەنگە مەبەستی کاک قاضی چو می تانجەڕۆی خاک و، خۆڵی مامۆستا ناڵی بێ. بەڵام چونکو دەجلە زۆر، نێو بەدەرەوەیەو، تانجەڕۆ، بێ ناوە، توشی هەڵە بوۆە.

٤: برای بەڕێزو، دیوناسی لەمێژینەم کاک (صدیق بۆرەکەیی) چەن مەبەستێکی نووسیوە، لەتەک ڕاستەقانی و، ئەوەی بەچاو، ئەبینرێ نایەتەوە، بۆوینە،(١)رایان گەیاندووە ئەحمەدی کوڕ لە ئاوایی حەمامیانا، هاتۆتە دیناوە، وەک باسکرا، نەلەوێ لەدایک بوۆەو، نەقەتیش، ماڵیان چۆتە ئەوێ، دیارە ئەم هەڵەیەش لەوەوە، سەرچاوەی گرتوۆە، ئاوایی حەما میان لەسەرەتای چەرخی نۆزدەهەمی زایە نێوە تائەم چەن ساڵەی دوایی:هەمیشەجێگەی مامۆستاو، فەقێ و، خوێند کاری ئایینی بوۆە، لەهەموو، لایەکی وڵاتەوە فەقێ بۆ خوێندن ڕویان تێ کردۆە بەم هۆیەوەلەهە موناوچە کانا، نێودێر بۆوە، ئەمەلەلایەکەوەوله، لایەکی تریشەوە مەزن نشینی ناوچەو، سەرعێلی دێبوکریش بوۆە، جام بەم پێیە مامۆستا بۆرەکەیی لای وا بوۆە ئەشێ ئەحمەدی کوڕ خەڵکی حەمامیان بێ(٢) ئەلی ئەحمەدی کوڕ، هەرلە حەمامیان چوۆتە بەر خوێندن، ئەگەر ئێمە خویندەواری و، چونەناو فەقێیەتی ئەوانیش بەسەلمێنین، دەڵێن ئەوسا کەحەمامیان مەدرەسەو، فێرگەی لێ نەبوۆە. تا، ئەو، لەوێ بچێتە بەر خوێندن (٣) ئەنوسن پاش چوار ساڵ خوێندن تەواو، ئەکاو، لەسولەیمانێ وە، دەگەڕێتەوە حەمامیان، وەک دەزانین خوێندنی سەردەمی ئەحمەدی کوڕو، تەنانەت هێ ئێمەش لانی کەم ١٢، تا ١٥ ـ ٢٠ ساڵی ئەخایاند کە

١. واتە تا ساڵی ١٣٥٢ کوێچی هەتاوی کە مامۆستامە لاعەلی وەڵزی وەفات دەفەرموێ، حوجرەی حەمامیان هەرئا وەدان بوو، فەقێ، دەرسیان لێ دە خوێند :

واتەنا کرێ ئەحمەدی کۆر لەم ماوە کەمەدا، خوێند نی مەلایەتی تەواو کردبێ و، بو بێتە مامۆستای ئاوایی(٤) نوسیویانە لە گۆرستانی عەمبارەی حەمامیان نێژراوە، وەکو دیتراوەو، بیستراوە لە ناوچەی بۆ کانا گۆرستا نێک بەناوی عەمبارە نەبووەو، نێیە، تا شێخ ئەحمەد لەوێندەرێ بە خاک ئەسپێرا بێ.

٥: برای بەرێزو، تێکو شەرم، (میرزابرایمی ئەفخەمی) تەنیا ڕای گەیاندوە ئەحمەدی کۆر لە تەمەنی ٩٩ ساڵیدا وەفاتی کردوەو، ناوی باوکیشی کەریم بووە، ئیدی خۆی لەبەسەرهاتو، سەردەمی ژیانی بواردوە.

٦: کاک (خالید خاکی) بێی ئەوەی ناوی چەرخو، صەدەی ژیانی ئەحمەدی کۆر بێنێ ئەلێ، ئەم ذاتە چۆتە عەرەبستان. ئەگەر مەبەستیان لە عەرەبستان مەکەو، مەدینەیە. تائێستا نەبینراوەو، نە بیستراوە ئەحمەدی کۆر چو بێتە ماڵی خوداو، پیان گوتبێ حاجی شێخ ئەحمەدی کۆر، خۆشی لە هیچکام لەهەلبەستە کانیدا، ناوی چونە مەکەئادر کێنێ و، نامازە بۆنە و مەبەستە ناکا، پاشان ئەنوسێ نەوەیەکی ئەحمەدی کۆر ماوەو، لەهەوشارە، بەلام هیچی لێ ناگێرێتەوە، لام وایە حەجی ئەحمەدی کوری لەتەک کاک ئەحمە[1] دی سولەیمانیدا، لێ گۆرابێ و، لەوە وەتوشی ئەم هەلەیە هاتبێ، دیارە هەرخوداشە بەهەلە ناچێ و، سەرەنگرێ نابێ.

٧: مامۆستای پیرو، کۆلنەدەرو، بەرێز یشم (بابا مەردوخی روحانی) ڕا، دەگەیەنێ هێندێک لایان وایە زاینگەی ئەحمەدی کۆر ناوچەی دهۆک و، زاخۆی کوردستانی عێراقە، ئەم بۆ چوونە،

١. کەلە سالی (١٣٠٥) دا کوچی دوایی پاش ٩٧ یان ٩٨ سال کردووە، واتە لە سالی ١٢٠٧ـ یان ١٢٠٨، دا، هاتوتە دیناوە، وەک لێکی دەدەینەوە ٥ سال بەر شێخ ئەحمەدی کۆر، وەفاتی کردوە:



شێخ معروفی نۆدێ (۱۱۶۶- ۱۲۵۴ھ -ق )

زاناوشاعێروپیاوچاکی به ناوبانگی کورده باوکی کاک احمدی
شیخه وباپیری شێخ سعیده وباپیره گه وره ی شێخ محمودی نه مره ناوی سید
محمدناسراوه به معروف (له سالی ۱۱۶۶ )ێ کۆچی داهاتوته جیهانه وه وه(۱۲۵۴ له سالی )
داکۆچی دوایی کردووه .پترله ۵۰ په راوی ئایینی وئه ده بی وزانیاری بوبه جێ هێشتۆین



**مه ولاناخالدنه قشبندی (۱۱۹۳- ۱۲۴۲ه -ق )**

ناوی (ضیاالدین کوڕی احمدی کوزی حسین )ه له عه شیرتی جافه وله سالێ ۱۱۹۳ی کۆچی داله
قه ره داغ هاتوه ته جیهانه وه (له شه وی هه ینی ۱۴ی دوالقعده ۱۲۴۲ی کۆچی دا،
کۆچی دوایی کردوه ) وه له شاری شام له صالیحیه نێژراوه ناوبراوده یان کتیبی
ئایینی جۆراوجۆری له شوین به جیٚ ماوه .



## کورته یه ک، له ژیاننامه ی کاک ئه حمه دی سوله یمانی

وه ک، ده زانیـن، دامه زرێنه ری ڕێ وشتی قادری عه بدولقادری گیـلانی سه ربه هه ریمی کرماشانه وه (۱۷۰۷ ـ ۱۱٦٦) بوّوه، پاشان له لایه ن شیخ مارفی نوّدیی، به رزنجه یی (۱۸۳۸ ـ ۱۷۵۳) که به بنه چه ک ده چیـته وه سه رشا عه بدولعه ظیمی شاری ڕێی لای تاران و، شیخ عبدالعزیزی شاری شنۆ. دیاره ئه و دوانه بران و، له توره مه ی حه ضره تی حه سه نن: بره وی سه ندووه، ڕه وشتی نه قشبه ندیش که ده چیته وه سه ر به هائه دینی بووخارایی (۱۳۸۹ ـ ۱۳۱۷) له لایه ن مه ولانا خالیدی شاره زوری یه وه (۱۸۲٦ ـ ۱۷۷۹) وه بره و، که و توّوه و، ڕمینی ساندووه، دیاره لایه نگرانی گیلانی پیان گوتراوه ده رویش و، هی مه ولانا خالیدیش. صوفی کاک ئه حمه دیش که، تاقانه ی شیخ مارفه و، له سالی ۱۲۰۷ یان ۱۲۰۸ دا، له شاری سوله یمانی داهاتوّته دیناوه، وه ک ده گیرنه وه، گوایا، باوکی، به ر له هاتنه دنیای کاک ئه حمه دا، خه ونی دیوه، که کوری ده بی، دیاره زوّر به وخه وه، خوّشحال ده بی چونکو، له چاخی پیری و، زوّرهانی دا بوّوه، ئه وسا، دیّنی کتیبی ئه حمه دی (فه رهه نگوّ که ی عه ره بی کوردی) بوّ، دا ده نیّ، کاک ئه حمه د، هه ربه لاویتی له سه ر فه رمانمی باوکی، ده چیته حه ج و، له وێ چاوی به پیاویکی مه راکشی ده که وێ و، له م پیاوه، فیری زانستی (عِلْمُ الْحُروف) ونرخی ژمیره (قِیَمُ الأعداد) وجه فرناسی بوّوه، دوای ئه وه ده ستی کردووه به دروست کردنی (گوله به ند) وه ک ده گیرنه وه و، جیمی ادموندیش، نووسیویتی و، من چیرو که که یم له کتیبی ئاداب و ڕسومی کوردان) دا هیناوه کاتی سولطان عبدالحمیدی دووهه م (۱۹۰۹ ـ ۱۸۷٦) ده یه وێ بچیته نویژی هه ینی. هه رمه نیٰ یه کان له ڕوّژی ۲۱ر۷ر۱۹۰۵ دا، بومبا، ده خه ناو کالیسکه کانی، سولطانه وه، بوّ ئه وه ی بیکوژن، به لام، عبدالحمید، چی لیٰ نایه و، ده لیّ، ئیوه ناتوانن من بکوژن، چونکه، گوله به ندی کاک ئه حمه دم پیوه یه.[1] *

---

* ص ۱۰۱ زمانی یه ک گرتوی ئه ده بی ـ جمال ئه به ز روژنامه جهاد ئابی ۱۹۹۰ ـ ئاداب و رسومی کردوان چاپ ۱۳۷۰.

۱. کاک ئه حمه د پتر له ۱۲۰ کتیبی ئاینیی به زمانی عه ره بی و فارسی نووسیوه و، خه لک، که لکیان، لیٰ، وه ر، ده گرن.

ڕەنگە، لەڕوانگە یەکی پێشوی مامۆستا هەژارەوە ر گیرابێ، چونکو، وەک لە دوایيدا، بۆتان باس دەکەین لایان وابوو، ئەحمەدێکی کوێری ترلە کوردستانی باکوردا هەبوە، کەهەڵبەستەکانی قەوارەو، تام و، چێژیان دە گەڵ هەڵبەستەکانی ئەحمەدی کۆری موکریانی دا زۆر لێک نزیک بوون. هەڵبەت هی ئەو، بە زاراوەی کۆرمانجی ژورو بون بەلام، مامۆستا ڕۆژ بەیانی دەیان فەرموو، ئێمە هەرئەحمەدێکی شاعیری کوێرمان بوە ئەویش ئەحمەدی کوێری موکریانی یە، دیارە منیش مەبەستەکەم ڕون کردوتەوە، کە هەرکیان هەریەکن، جا بەم هۆیەوە بابا مەردوخ فەرمویەتی. لەئاخرو، ئۆخری عومریدا هاتۆتە موکریان و، هەرلەوێش کۆچی دوایی کردوە.

٨: (حاجی قادری کۆیی) بە درکاندنی ناوی ئەحمەدی کۆرو، هاویشتنە، لیزگەو، ملوێنکەی پڕ لە دوڕو، مەرجانی ڕیزی ناوی هۆنەران و شاسواری بە لاغەتی کوردانەوە، پلەو، پایەی شێخ و، هاوچەرخ بوونی ئەوانی دە گەڵ خۆی و، حاجی مەلاعەولای جەلیزادەو زورشتی تری بۆ ڕون کردوینەوە، کە بەخواستی خودا. لە، لاپەڕەکانی دیدا بە دڕێژی دەیان خەینە بەرچاوی خوێنەرەوە ئازیزەکانمان.

٩: مامۆستا (قاضی خضری) بە ڕاگەیاندنیئەمەبەستە کە، گۆیا. ئەحمەدی کۆر دە گەڵ شێخ مەلا یوسفی خانەقای برهان نێودیربە، شەمەدین. دا هاتوو، چۆی بوە، ئەوەمان بۆڕون دەکاتەوە، ئەحمەدی کور، لەدەورو، بەری ١٣٠٠ ی کۆچی مانگیدا، هیشتاهەر زیندو، بوە چونکو شیخی برهان لەسالەکانی ١٢٤٤ و ١٢٤٥ دا، هاتۆتە دیناوە نزێکەی ٢٥ تا ٣٠ ساڵێکیش خەریکی خوێندن و، چەوسانەوەی طەریقەت بوە پاشان واتە لەنزێکەی

١٢٧٠ و ١٢٧٥ دا، هاتۆته برهان و، شەڕەفکەندو، لەساڵی ١٣٢٨ کۆچیشا. وەفاتی کردۆە.

١٠: خەلیفە سەیدیانی مهاباد. دە گەل ئەوەشا قاضی خضری دەیگوت ئەو هەڵبەستانەی ئەحمەدی کۆر، کە خەلیفە بە خەطی مەلارەحیمی هەوشاری لەچاپی داون هی منن، وەری گرتن و، نەی دامەوە لەلایەکی کەشەوە زۆر. کەس گازندە لەخەلیفەدە کەن و، دەڵێن، هەرچێکی چاپیان دە کابە هۆی دەس تێوەردانەوە لە، کەلکیان دەخاو، رەنگە راستیش بکەن، من دەڵێم، ماڵم حەقە، ئەگەر خەلیفە نەهاتباو، ئەوشتانەی ئەویش ئەوساکە لەچاپی نەدابان، کەئێستاش خەڵک کەلکیان لێوەردەگرن ڕژیمی دژی نەتەوەی کوردی شاەئەوانیشی لەناو، دەبردو، ئەمڕۆ بە تیتوش ناویان نەدەماو، بە تەواوی لەبیردەچونەوە، جا بەم پێیە من بەبەشی خۆم ئە، لەوەندەی دا سوپاسی لێ دەکەم، چونکوو، لام وایە شتێک لە هیچ شتێ باشترەو. دە کرێ ببێتە بن چینەی زۆرشت

## چەن سوکە باسێک

بەرلەوەی بێمە سەرباسی ژیان و. هاوچەرخی ئەحمەدی کۆرو، حاجی قادری کۆیی. بە پێویستی ئەزانم ە ئەم چەن بابەتەی خوارەوە، بدەمە، بەر، سەرنج و. باس و، لێ تۆژینەوە.

١: چیرۆکی خدری زیندە ٢: چەن ئەحمەدی کورمان بون٣: ئاخۆ: ئەحمەدی کور خویندەوار بوّوە ٤: ئایا پارچە هەڵبەستی یارەسول اللّه ذەلیل و، دڵ حەزنیم رەحمەتێ هی ئەحمەدی کۆر. یان ئەحمەد موختاربەگی جاف ٥: هەڵبەستی بە هارە هی ئەحمەدی کۆرە یان ناکرێ ئی ئەوان بێ ٦: ئەحمەدی کۆر خەڵکی ناوچەی موکری بوّوەو، لەشیوە

**سماقی شنۆ. یان لەعەمباری بۆ کان هاتۆتە دونیاوە، یان خەڵکی ناوچەی زاخۆو، دهۆکی عێراق بۆوە.**

**خدری زیندە:** ڕاستە چیرۆکی خدری زیندە. لەلایەن زۆر کەسەوە، باسکراوەو، زۆر شاعیری وەکوو، خواجە حافیظی شیرازیش[1] ناویان خستۆتە نێو لیزگەی هەڵبەستەوەوەک ئەلی: قطع این مرحله بی همرهی خضر مکن: ظلمات است بترس از خطر گمراهی: لەگەلێک کتیب و، نووسراوەشا، هاتوۆە. هەرکەسەی جۆرێکی لێ دواوەو ڕایان گەیاندووە، ئەم ذاتەتا ئاخری زەمان هەر ئەمێنیتەوە، چونکو لەوئاوە حەیاتەی خواردۆتەوە، کە بە صەدان کەسی وەک ئەسکەندەری ڕۆمی وەشوێینی کەوتن و، لەڕێگەی وەدەس هێنانیدا، گیانیان لەدەس داوەو،دڵیان تۆقیوە، بۆوینە چەن کتێبکتان بۆدینینەوە (١) ئەبوحاتەم کوڕی موحەمەد، کوڕی عوثمان خەڵکی سەجستان لە، کتێبی المُعَمَّرین، دادمڵێ بە تەمەنترین مروڤی بەرەی ئادەمیزاد. خضری کوڕی قابیلی باوەئادەمە. (٢) سیبطی کوڕی جەوزی لە کتێبی (تذکرةُ الخواصّ) دا، ئەڵێ، تاقمێك لە ئادەمیزاد، تەمەنیان زۆر، درێژە، وەک خدری زیندەو، مام ئەلیاس. ئەم دوذاتە هەموساڵێ جارێک، پێکەوە، کۆ دەبنەوەو، چەن تا لە موی سەر، ئاڵو گۆر دەکەن. بۆئەوەی هەرکاتێ‌یە کێکیان تا سەی ئەوی تری کرد. تاڵە مویەك هەڵ پرو زێنێ و، لەلای یەک سەرهەڵێنن. (٣) قەرەخەلیل. لە پەراویزی خۆیا، لەسەر راڤەو، شەرحی عومەرسەعدی تەفتازانی. لەسەرعەقایدی نەسەفی، ئێژێ. هێندێک لەگەورە، گەورەکانی ئایینی لایان وایە،چۆن کەس لەراسپاردەکانی خوداوەندی میری مەزن. بۆهەتایەهەتایە

[1]. یان ماموستا نالی کەدەڵێ: هەرچەندە کە عومری خضرو، حامی جەمت بوو چونکە ... زورە چەومرێکی کەمت بوو

(تائاخری زەمان) هەربەزیندویی ئەمێننەوە خدری زیندە لەسەرعەردو، ویشکانیا. مام ئەلیاس، لەناو، ئاوا، عیس وئیدر[1] یسیش لەئا سمانا. (٤) شێخ موحیە دینی عەرەبی، لەبابی ٧٣ ی کتێبی (الفتوحات المکیە) دا دە بێژێ، خوداوەند چوارکەسی لەراسپاردەکانی خوی. کەسیانیان خاوەن کتێب و، یاسا بون وەک ئیدریس و عیسی و، ئەلیاس و، یەکێشیان بێ کتێب بووە، وەک خدر، هەربە، هەیکەل و، قەوارەوە، هێشتوتەوە (٥) حافظ، کوری حەجەری عەسقەلانی لە کتێبی، (ألاصابة فی تمیز الصحابە) دا ئێژێ، من کەسیکم نەدیوە، خدری لەڕیزی یارانی حەضرەتی پیغەمبەردا، دانا بێ واتە کەس نەیگوتوە ئەم شەخصە بەخزمەت حەضرەتی رەسوڵ گەییشتوەوە، دەگەڵ ئەوەشا زور کەس لەزانایانی ئسلام، سەبارەت بەتەمەنی درێژی خدر دووان (٦) إمام موحەمەد، جەریری طەبەری لەعەبدولای کوری شەوذەب ئەگێرێتەوە، خدر، ئێرانی بووە و، ئەلیاسیش بنەچەک جوولەکەیەو، ئەم دو ذاتە هەموساڵێ جارێک بەیەکەوە، کوئە بنەوە. دیارە زور کەسی تریش باسی ئەم مەبەستەیان کردووە، بەڵام لەوە زیاتر. هێنا نیان بە پێویست نازانم.

بەڵام دەگەڵ تەواوی ئەو، لێدوان و باس کردنانەشا، ئەم مەبەستە. ناتوانێ یە نەپالەو، پشتی زانستی بێ، نەپاڵ بدا بە، بە لگەی ئایینێ وە..

پالەو، پشتی زانستی نێ یە، چونکو زانستی ژیان ناسیی ئەمرو، دەری خستوەوە رای، گەیاندووە، کە سێکی وەک خدری زیندەو، مام ئەلیاس، کەوەکوو، هەموو گیان لەبەرێکی تر. پێداویستی سوروشتیان بە خواردن و، خواردنەوەو دابین کردنی

1. هەروەک عیسایی لایان وایە حەضرەتی عیسا ماوە. موسایش لایان وایە حەضرەتی ئیدریس ماوەو، بەیەکەوە لە ئاسمانە کاندان:

گشت نیازه کان هه یه. تا کرێ پاش چه ن هه زار ساڵ هه ر بمێنێته وه و، که سێکیش نه یان بینێ یه، لانی ئاییینیشی نی یه. چونکو له هیچکام له فه رماییشته راست و، ره وانه کانی حه ضره تی ره سولاّ. وه ک عه سقه لانیش ده گێریته و، ده ڵێ که سێکم نه دیوه خدری زینده ی به صه حابه ی پیغه مبه ردا نابێ، ئه ها تۆوه ئه م شه خصه چو بێته خزمه ت رسولّ یان خۆ حه ضره ت باسیان لێوه کردبێ و، فه رمه ووبێتی، دیومه، دیاره ئه گه ر خدر زیندوو، بوایه له ماوه ی ٦٣ ساڵ، دا، لانی که م، وه ک وه یسولقه ره نی، یه ک دو، جار، هه وڵی ئه دا، بۆ ئه وه ی به خزمه ت حه ضره تی ره سولّ بگا، سه ره ڕای ئه وه ش ئه گه ر بڵێن خدر پیغه مبه ریش بوبێ، که هێندێک لایان وابۆوه، دیسان به واته ی بێ گرێ و، پێچی فه رمایشی قوڕئانی پیرۆز (که له سوره ی زومه را ،ئه فه رمۆی: اِنَّکَ مَیِّتٌ وَ اِنَّهُمْ مَیِّتُونَ، ئایه ی ٣٠ واته ئه ی موحه مّه ئیوه ش ئه مرن هه روه کۆچون راسپارده کانی به رله تـوش مردون) مردۆه و، چۆته وه باره گای به رزی خوداوند. یان ئه وئایه ته که ده فه رموی وَ مٰا مُحَمَّدٌ اِلاّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ من قبله الرُسل سوره ی ئالی عِمران ئایه تی (١٤٣) واته، موحه مّه دیش پیغه مبه رێکه و، وه فات، ده کا، هه روه کو، هه موو، پیغه مبه ره کانی به ر، له وان، وه فاتیان کردوۆه بێجگه له وه ش، هه روه ک له چیرۆکی حه ضره تی موسی له قوڕئانا. ها تۆوه خدر، یه کێک بۆوه له هه ره خواناسه گه وره کانی بنه چه ک جوله که، که واته ئه توانین بڵێن، چیرۆکی هه رمانی ئه وانیش ته ون و، کری بیری جوله که یه و، له ڕۆم و، یونانی به روشدا باو بۆوه، پاشان له چه رخی دوهه م و، سێهه می کۆچی مانگیدا هاتۆ ته ناو ئیسلام و، ره نگ و، روویه کی تری به خۆیه وه گرتوۆه، ئه وه ش ده زانین، دوای ئه وه ی خدرو، موسٰی سلاّوی خودایان له سه ربێ، لێک جیا بوونه وه، ئیتر باسێک له، خدره وه نه

کراوه، که‌وا بوو، خدری به‌ناو زینده هیچ جۆره پێوه‌ندێکی له‌، ته‌ک ئاینی پیرۆزی ئسلاما، نه‌بۆوه‌ئه‌ویش به‌م جوره‌ی باسی ئه‌که‌ن، دیاره ئاینی به‌رزی ئسلام. ده‌گه‌ڵ ئه‌و چه‌شنه بیرو، باوه ڕانه‌دا، نایه‌ته‌وه، به‌م پێ‌یه، له‌ئا کامی باسه‌که‌دا، ئه‌ڵێن شێخ ئه‌حمه‌دی ئێیمه‌ش نه، خدری دیوه‌و، نه ئه‌وانیش فوویان به‌ده‌می ئه‌حمه‌دی کۆرا، کردووە، تا به‌م فوویه هه‌ستی هۆنه‌ری و، خواناسی، له‌و کۆیره‌دا، هه‌ڵ جووی بێ‌و، ده‌ستی کرد بێ‌به هه‌ڵبه‌ست و، شێعر گوتن، هه‌ست و، هێزی هه‌ڵبه‌ست شتێکی سورشتێ یه، به فێر کردن و، فوو، به‌ده‌ما، کردنی ئه‌م و، ئه‌و. به‌دی نایه‌و، هه‌رگیز او، هه‌رگیزیش که‌س نه‌ی دیوه‌و، ناشی بینێ.

**چه‌ن ئه‌حمه‌دی کۆر هه بوون**

هه‌روه‌ک خوالێ خوشبوو، حاجی قادری کۆیی له‌پارچه‌هه ڵبه‌ستی شاسواری به‌لاغه‌تی کوردانا، ناوی هێندێک شاعیری ناوئه‌حمه‌دی. وه‌ک ئه‌ستێره‌یه‌کی وورشه‌داری ئاسمانی وێژه‌و، ئه‌ده‌بی کوردی، نیشان داوین و، من خۆشم تاه‌ئێستا بوم دۆزراونه‌وه ئه‌مانه‌ن

(١) مامۆستا ئه‌حمه‌دی خانی (٢) ئه‌حمه‌دموختار به‌گی جاف (٣) شێخ ئه‌حمه‌دی بستی خوژ خوّره (٤) شێخ ئه‌حمه‌دی سریلاوای موکری (٥) ئه‌حمه‌د، حه‌ڵوای ڕه‌حیم خان (٦) ئه‌حمه‌د مه‌هجوری کرماشانی (٧) ئه‌حمه‌دهه‌ردی (٨) ئه‌حمه‌د بامه‌ڕنی، وه‌ک ده‌بێژێ: ئاه‌و، فه‌غان ئه‌ڤرۆ که‌نه: ئیرۆ، ئه‌له‌م، پشکا مه‌نه: عومری مه، بووری ته شقه‌لا: دایـــم به عشقی موتبه‌لا: گه‌رده‌ن ژقه ندیلێ ڤه‌دا شوو علی شه‌فه‌ق‌دا، سه‌رحه‌دا: دیمی شیرین و بۆروزه‌ر: بسک و،

کەزی بەردانە سەر: ئیرۆ، هەڵات فەجرا، سەحەر بولبول دەکەن، بانگ و، صە: لا بەردا، مە، ناگر، هاتەرەخ؛گوت وەرنە پێش وان مە شعەلا (٩) ئەحمەد، کۆ ماسی، (١٠) ئەحمەد، دەربەندی. (١١) شێخ ئەحمەد جزیری، دیارە حاجی قادر. ناوی ئەم سێ ذاتەی دووایی ئەباو، ئەڵێ.

دوو، وەحیدەن، موحەمەد، دوو، ئەحمەد
یەکێ کوماسێیە، یەکێ، دەربەند

لە جزیری یەکێکە شێخ ئەحمەد: صاحبی ناوو، مورشیدی ئەرشەد: ئەوەی جامی گوتوتی ئەمەیە: لەو قصەو، مەدحە، مەقصەدی ئەمەیە.

پیرمردی‌بدیدم‌بەجزیر=نیک‌مردی بدیده‌ام زحریر

کە وابوئەحمەد ناوی شاعیر، جگەلە ئەحمەدی **کۆر.** هەرئەوانە بوون ناوبر[١]ان. بەڵام ماموٚستای پایە بەرزی کوردو، بەواتەی دوکتۆر کە ماڵ مەظهەر ئەحمەد (کتێبی میژوو) شاسواری وێژەو، ئەدەبی کوردی و، فارسی (ماموستاهەژار) هەروەک لەبەرا، دەبەندی ٧، بابا (مەردوخ) باسمان کرد، لایان وابوو، لەناوچەی جزیرو، بۆتان، ئەحمەدێکی کۆری تر، هەبوۆە بە زاراوەی کوردی کورمانجی ژورو، هەڵبەستی خواناسی و، صوفیانەی گوتووە، صۆفی و، خواپەرستە کانی ناوچەش، وەک هەڵبەستە کانی ئەحمەدی کۆری موکریانی کردویاننە، بەرو، بەدەنگ و، سووزەوە. لە کاتی خۆی دا، دەیان خوێننەوە، دیارە ئەوەی سەبارەت بە ئەحمەدی کۆر لەمو کریاندا، لەمەڕ، چاو پێکەو تنی خدری زیندەو، فوو، بەدەما کردنی دا، دەبیسرێ، لەبارەی ئەویشاهەر،

---

١. هەڵبەت وەک لە پێشەوە شدا ٚرام، گەیاند، مە بەستم ئەوانە یە کە تائێستامن زانیو من:

دەم بیست، مامۆستا باسەکەی دەگەڵ مامۆستا ڕۆژ بەیانی و، مندا، دڕێژە پێ داو، فەرموی، نازانم، کامیان. لە کامەیان هەڵبەست وەرگرتۆوە، چونکوو، تام و، چیژیان زۆر، وەک یەک دەچێ، بۆم، رون نەبۆتەوە کام کۆیر. بۆتە مامۆستاو، چاوساغی هەڵبەست گوتنی ئەوی کەیان ئەوەش ڕونە. ئەوەی کەوتۆتە شوێن ئەوی تریان، دەبێ هەر وەک زاراوەی، خۆی زانیوەلە، زاراوەی ئەوی دیش. زۆر باش، زانا بووبێ. واتە هەردوک شێوەی کوڕمانجی ژورو، ناوەندی زانی، بێ بەلام پاش ئەوەی مامۆستا ڕۆژبەیانی مامۆستای بەناو بانگ و، میژوو، زانی کورد فەرموی، لە میژووی هۆنەرانی کوردی کوڕمانجی، ژورودا هیچ ئەحمەدی کو یرێکمان نەبوە. کەوا بوو، دوو، ئەحمەدی کوێری شاعیریش نەبوون. عەرضم کردن بەم جۆرەی من لە خەڵکی ناوچەی بۆکان بە تایەبەت مامۆستا مەلاعەلی حەمامیانم بیستۆوە کەئەوانیش، لەزمان حاجی مەلاعەبدوڵای وەڵزی باوکێوە کەلە، سەردەمی ژیانی ئەحمەدی کۆری ئێمەدا. ژیاوەو، بۆی گێڕاومەتەوە، گوتی، ئەحمەدی کوێر. ماوەی چەن ساڵ لەخانەقای شێخانی شەمزین لە ناوایی نهریدا. دەمێنیتەوە. پاشان دەگەڕێتەوە عەمبارو، لەوێ وەفات دەکا، دەکرێ، ئەو ئەحمەدە کۆرەی جزیرو، بۆتان. هەر ئەو، ئەحمەدە کوڕەی مکری بووبێ.

چونکو سەرەڕای ئەوەی ئەحمەدی کۆر پیاوێکی زیت و، وریاو، لێ هاتوو، بە ذەین بوە، لەماوەی ئەم چەن ساڵ مانەوەشی لە نهری دا، توانیوێ دەسەڵا تیکی تەواو، بەسەر، زاراوەی کوڕمانجی ژورودا، پەیدا، بکا. ئەمە، لەلایەکەوە، لەلایەکی دیشەوە، ئەگەر، ئەحمەدی کۆر. لەوێش هەر، بەزاراوەی موکری (،کوڕمانجی ناوەندی) هەڵبەستی گوتبایە، بێ سوو، گومان،

صۆفی و، خەڵکی ناوچەلێی حاڵی نەدەبوون و، گوێیان بەهەڵبەستەکانی نە، ئەدا ،جانەوە بوێوە، لە وێنە دەرێ، شێعرە پڕ لە هەست و، بەسوزەکانی خوێ، بەزاراوەی کورمانجی ژوورو، داناوە، هەرلە و خانەقاو، مزگەوتەی نهریشەوە، کە هەمیشە، مەکۆی گەورە پیاو، زاناو، خواناسەکانی، ناوچەوو، هەندەرانی کوردستان بوێوە بە زمان و، قەڵەم و، نووسینەوەی ئەوان بڵاو بۆتەوەو، چۆتە جزیرو، بۆتان و، شوێنەکانی تریش، پاش ماوەیەک و، تێپەڕبونی چەن ساڵێک، بەتایبەت کە خودی شێخ ئەحمەد لەناوچەی شەمزین دا، نە ماوەو، فاتی کردوە خەڵکی مەڵبەندی جزیرو، بۆتان. پێیانوا بوێوە، هەرخەڵکی ئەوێ بوێوە. ڕەنگە حەقیشیان بووبێ، ئەگینا چۆن دەکرێ کوێرێکی موکری خوداو، خولا بیژو، وا دەبێ، ببێتە، هۆنەی زاراوەی خودێ بیژو، ووسادبی، ئەوسا، هەرتک، مامۆستا فەرمویان، باشی بۆ چوی.و، ڕەنگە هەرواش بێ. جانەوە بوو، بۆ چونی من پێکابم، یان گلابوو بم و، توزیشم لێ هەڵ نەستاند بێ

**خوێندەواری ئەحمەدی کۆر:**

بەر لەوەی وڵامی ئەم پرسیارە ڕون کەینەوە، پێویستە بڵێین ئەم هۆزە لە مێژینە کوردە ئاریایە، بەصەدان بەیت بێژو. هۆنەرو، مامۆستاو، چازانی نە خویندەواری بوێوەو، ئیستاش ئەم بنە ماڵە مەزنە وەجاخی کوێرنەبۆتەوە. بو وینە(١) عەلی حەریری هۆنەری نەخوێندەواری چەرخی پازدە هەمی زایەنی وهاو، زەمانی، مەلای جزیری کە شێخ ئاورەحمانی جامی لە سەفەرەکەی[١] خۆیالە ساڵی

١. جامی لە ساڵی ٨٧٨ دا چۆتە سەفەری حەج کردنەکەی ئەحمەدی جەزیری وەک لە ←

١٤٧٢ زايندا كاتێ لەڕێگەی توور كیاوە دە،چێتە ماڵی خودا، ئەیان بینێ و، پاشان لەسەفەر نامە كەیدا، پەسندیان ئەڵێ، پیرمردی بدیدم بە جزیر = نیم مردی بدیدەام ز حریر، دیارە مەبەستی جامی لەم پیرە مێردە كامل و، خوداناسە، وەک حاجی قادریش دەری بڕیوە و، ئێمە ئاماژەمان بۆ كرد مەلای جزیری یە، نیوە پیاوە كەیان پیاوە چاكە، كەشی وەک لە هیندێک نوسراوەدا لە جێی ووشەی (نیم) نیک، هاتووە، مەبەستی جامی شاعیری نەخویندەواری كورد، عەلی حریری بووە، دیارە شێخی جامی لەبەرامبەر ذاتێكی وەک مەلای جزیری دا، كەلەخواناسی و، هەڵبەست و، زانستەكانی ئایینی و، وێژە و، ئەدەبی فارسی و، عەرەبیشابێ وێنە بووە، عەلی حەریری. بە نیوە پیاو، داناوە و، دەڵێ، هێشتا پێ نەگەیشتووە و، نەخویندەوارە، ئەگینا، عەلی حەریری لەناو مەلانی خۆش خوێنی باغی هۆنەرانی كوردەواریدا، بە بولبولی سەر، گڵۆوكی وێژەوانی ناسراوە، دوكتور عیزەدین موصطەفا رەسوڵ لە ساڵی ١٩٦٥ ی زایەنیدا. لەرادیو بەغدا، ڕای گەیاند. خوێندكار بووم لە ئووڕوپا. چوومە عەنتیكەخانە یەک، سەیرم كرد، نووسراوە یەكی خەط ناخۆش، خراوەتەناو، قەفەسێكەوە، لیێ وە نزیێک كەوتم، دیم، لەسەری نوسراوە، بەنرخترین نووسراوەی دەسنووس. سەرنجم دایە بۆم ڕۆن بۆوە، كومەڵە هەڵبەستەكانی عەلی حەریری یەو، بەدەس مامۆستایەكی خەطناخوشی سەردەمی حەریری نووسراوەتەوە، پرسیارم لەكار بەدەستەكە كرد، نرخی ئەو دەسنووسە چێیە؟ گوتی ئەمە هۆنراوە یەكی یەكجار بەبایەخی نەخۆیندەوارێكی كوردە

شەرەفنامە دەردەكەوی لە ساڵی پاش ١٠٠٥ دا ژیاوە. عەقڵ نایبری جامی پێش ١٦٠ ساڵ بە خزمەت جزیری گەیشتبێ و ناویشی بە پیرمەردیان نێک مەرد بردبێ. داخوا كام نەحمەدی مەبەست بووە: هەژار:

ئه‌وه‌شم له‌بیر نه‌چێ. کاتێ من ئه‌م مه‌به‌سته‌م، له‌رادیۆ به‌غدا، وه‌رگرت. مامۆستای منالآنی ئاوایی که‌هلای ئاوچه‌ی خه‌مسه‌ی نێوان شاری هه‌مه‌دان و زه‌نگان و، بیجاری گه‌روس بوم ۱۳٤۸ - ۱۳٤۹ کۆچی هه‌تاوی (۲) عه‌لی به‌رده‌شانی، ئه‌م هۆنه‌ره، نه‌خوێنده‌وارو، به‌یت و، هه‌ڵبه‌ست بێژه‌ ره‌زمێ یه‌، هاوده‌می ئاوره‌حمان پاشای بابان بۆوه‌، ئاوره‌حمان پاشا پیاوێکی زۆر بـــه‌وه‌ج و، زاکون و، ئازاو، خوداناس بوۆه‌، له‌زۆربه‌ی شاره‌کانی کێو، هه‌ولێرو، سوله‌یمانی، فێرگه‌و، مزگه‌وتی بنیات ناوه‌، ماوه‌یه‌کی زۆر، ده‌گه‌ڵ تورکانی عوثمانی دا، شه‌ڕی کردوۆه‌، ڕاوی ناوه‌، تێ شکاوه‌، به‌ڵام دوای ئه‌وه‌ی هاته‌ چیمه‌نی سوڵتا نییه‌ی زه‌نجان و، فه‌تحه‌لی شا. به‌ڵێنی یارمه‌تی پیداو، ئه‌مانه‌الله خانی ئه‌رده‌لآن والی کوردستان یاریده‌ی دا، تورکی ڕامالی، به‌ڵام، پاشان، شای ئێران وه‌ک هه‌میشه‌ قصه‌ی خوی خوارده‌وه‌و، له‌ته‌ک عوثمانیه‌کانا. رێک که‌وت و، پشتی له‌ئاوره‌حمان پاشا کرد، ده‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شا، به‌شایه‌دی مێژوو، ئه‌و ئازایه‌تی و بوێریه‌ی ئه‌وان و، برازاکانی، له‌خویان نیشان داوه‌، مه‌گه‌ر، لوطفعه‌لی خانی زه‌ند[1] له‌ خوی نیشان دابێ. ئه‌گینا نه‌بینراوه‌، تێ شکاو، ئیترخوی نه‌گرته‌وه‌و، له‌ئاکاما. له‌ سالی ۱۲۲۸ ی کۆچی مانگیدا، بۆ هه‌تا هه‌تایه‌ سه‌ری نایه‌وه‌، جائه‌وسا که‌عه‌لی به‌رده‌شانی به‌یتی ئاوره‌حمان پاشای سه‌باره‌ت به‌دلێری کورده‌کان و، تالآن و، برۆو، سوتاندنی تورکانی عوثمانی و، بێ بڕوایی و، په‌یمان شکێنی شای ئێران، هۆنده‌وه‌، ئه‌وبه‌یته‌ باشترین نوێنگه‌ی ده‌سه‌لآت و، مامۆستایه‌تی به‌رده‌شانێ یه‌، له‌هۆنراوه‌ی ڕه‌زمی داو، به‌نرخترین تاپۆیه‌کی

۱. دیاره‌ ئه‌ویش هه‌رزۆله‌ کورد بۆوه‌، چونکو که‌ریم خان کوردی له‌ک بۆوه‌:

مێژوو ییشە، بۆ پشت نەبەستن، بەشاو، بێگانە. پیویستە لێرەدا ئەوەش بێژین، بەیت لەوێژەو، ئەدەبی کوردیدا، نەخشێکی یەکجار، بەر، بلاووگرینگی. تائێستا. گێراوە زۆربەی بابەتە. ئایینی و مێژوو یی و، ئەدەبێکانی هەر لەزوۆوە. تا ئەمرۆ، بۆ پاراستوێن، هەر بۆیەش، حاجی قادری کوێی نرخی بۆو، بەیتی کوردی داناوەو، ناوی هیندێکیان دەدرکێنێ و، دەلێ:بەسیە، بێ عاری ئەی گەلی خزمان = لەم هەمو، بەیتی میلەتی خۆمان ئەگەر ئیمەو، سنەو، سولەیمانین = ناوی یەکیان بەچاکی نازانین، وەک (موحەممەد حەنیفە) بەیتی بەتین = نییە، ئیلا حەصاری قوسطەنطین بەیتی (دمدم) کە قەدری نازانن - پاکی سیحری حەلاڵی کوردانن:وەکوو (شانامە) گەر بنووسرایە = لیت، موعەیەن دەبوو، چ وەستایە (ئەسپی رەش) بەیتی تابلێی چاکە = چاکە نەظمی، یەکجار سوارو، چالاکە بەرەوانی میثالی ئاوی ڕەوان = ئیرتیجالین، هەموو، بێ دامان دیارە پرۆفسور ئۆسکارمانی ئەلمانی ڕۆژ هەلات و کوردناسی چەرخی بیستەم و، سەر بەرێوەبەری کتێبخانەی کۆشکی کۆمارو، پیشەوای کاتی ئەلمان و، هاوالی نزێکی پروفسور مینۆ. روسکی ڕۆسیش هەستی بە گرینگی بەیتەکانی کوردی کرد بوو، بۆیە پاشی ئەوەی لە ساڵەکانی ١٩٠٢ - ١٩٠٣ دا، هاتە کوردستانی موکری و، فێری زمانی کوردی بوو، دەستی کرد، بە کۆو کردنەوەی بەیتەکان و، ئەم چەن بەیتەی خوارەوەی خستەناو لیزگەی میلیۆنە کەبەنرخە کەی. کۆ کراوە کانیوەو، جارێکی تریش بابەخی ڕاستەقانی دایەوە بەیت و، ئەوی لەمێژودا، تۆمار کردەوە بەیتی خانی لەپ زێرین (دمدم) (مەم و، زین) (خەج و، سیامەند) (مەحمودو، مەرزینگان) (لاسە شۆری بالەکان و، خەزالی

مەلانە بیان) (برایمۆوک) (ناصرو، ماڵ ماڵ) (شێخ فەخـرو، خاتون ئەستی) (برایمی دەشتیان) (قۆوچ، وەسمان) (کاکە میرو، کاکە شێخ) (با پیرە ئاغای مەنگور) (ئاوڕە حمـان پاشای بەبە) کە باسمان کرد (لەشکری) (شـێخ مەندو، شیخ ڕەش) (۲) (پێـنج سوارەی مەریوان) (کەڵو، شێر) و چەن بەیتێکی دیکە. کە لەماوەی دو ساڵو، نیوگەڕان بە ناوچەکانی کوردستاندا، بەتایبەت کرماشان، خورەم ئابادو، سنە، بیجاڕ، سابلاغ، وورمێو، شوێنەکانی ترا، کۆی کرد بوونەوە دەگەڵ زۆرشتی بەنرخی دیدا، وەبەهۆی ئەوە کە لەزەمانی موظەفەدین شادا بۆوە ناوی نـاون (توحفەی موظەفەریە) واتە دیاری شا. موظەفەر، وەک دەڵێن لەم ساڵانەی دوایـیدا خوالی خوش بوو، مامۆستا هیمن بە فارسی هەلی گیراوەتەوە بەلام بە داخەوە تا ئێستا چاوم[1] پێی ڕون نەبوۆتەوە، ئەم کتیبە بۆتە، سەرچاوەیەکی پڕ بایەخی کورد ناسی لەولاتەکانی هەندەراندا:

(۳) ئەحمەد حەڵوا، یەکێکە لە هۆنەرە نەخوێندەوارەکانی چەرخی سێزدەهەمو، لە ئاوایی ڕەحیم خانی بۆکان هاتۆتە دیناوەو، لە ئاوایی سەر ئاودا، کۆچی دوایی کردۆوە، ناو براو، بە دانانو، هوندنەوەی بەیتی (کەڵو، شێر) کۆشکی پتەوو، ڕازاوەی بەیتو، باوی نەتەوە کەی پتەو ترو، ڕازاوەتر کردو، بۆ هەمیشە ش ناوی خۆیو، گەلی کوردی لەمێژووی کۆمەڵانی ترا، تۆمار کرد، کەڵو، شێر، دوبەردی دا تاشراون، کە لەسەر هەیکەلی کەڵو، شیر هەڵخراونو، دەچنەوە، سەردەمی مادەکان، ئەم هەیکەلانە لەسەر چۆمی (جەغەتوو) نزیک ئاوایی قەلای

---

۱. ئەوەی تائێستا من دیومە هەرنەوەیە کە ماموستا هێمن ساغی کردوتەوەو، هێناوێتە سەرشێوەی نوسینی کوردی ئەمرۆو، کوریزانیاریش لە چاپی داوە (۱۹۷۵).

هۆلاکو (خانی مەغول) هەڵ کەوتون، ژێر، کێوەکە، وەک تاق بۆستانی کرماشان کۆ ڵدراوە، بۆ ئەوەی ئاوی چۆمەکە، بچێتە ناو قەڵاو، لەو، دیویشەوە ناو دێری لای شاری مەراغە، (مادڕاگە)ی پی بکرێ، کاتی هۆلاکۆ ئەوەی چەنگیزخان لەسالی ۱۲۵۱ ی زاینیدا، مەراغەی کردە پێتەختی خۆی، ئەم کۆنە قەڵایە کە بەرژەوەندو، ڕوانگەیەکی دڵگری هەیە، تازەدە کاتەوە لەو ساوە تائێستا بە ناوی قەڵای هەلاکۆ نێو دیر بوۆوە، هێندێک نووسەریش هەرلێرەوە، توشی هەڵە بوونو، گوتویانە ئەم کەڵو، شێرە بە فەرمانی هۆلاکو دا تاشراوە، ئەحمەد هەڵوا، پاشی پەسندی خوداو، پیغەمبەرو ناردنی سلاو، بۆ حەضرەتی موحەمەدو، ماڵ و منداڵو، هاوالانی، ئەخویندە واری خۆی بەو هەڵبەستە، دەردەبڕێو، دەڵێ:

سەوادم نەبوو، بەحوکمی کەماڵ = سەنەم خوێندەوە صەدو سێزدە ساڵ دیارە لە هەڵبەستا، بەتایەبەتیو، لەپەخشانیشا، بەگشتی، لەهێنانو، خویندنەوەی مێژوو، ژمێرەدا، کەمتر، ناوی هەزار، دەر، دەبڕێو، بەسەر زارو، قەڵەمدا، دێ. کەوا بوو، مەبەستی ئەحمەد هەڵواش هەزارو، صەدو، سیزدەیە، واتە لە سالی (۱۱۱۳)ی کۆچی مانگیدا، ئاهەنگی شەڕو، بەزمی بەربەرەکانی کەڵو، شێر ڕوی، داوە، ئەوە بزوای ئەوان بوۆوە، ئەگینا، ئەم بڕوارە، نەدەگەڵ زەمانی مادو، نەلەتەک سەردەمی هۆلاکو دا، دێتەوە:

(٤) وەلی دیوانەی شارەزووری: هۆنەری نەخوێندەوارو، دڵ سووتاوی چەرخی چاردە هەمی کۆچی مانگی، نێو دێر، بەمەجنونی دووجەیل، وەک دەڵێن هۆنراوەکانی دێوانە، هێندەیان سەرنجی هۆنەرو، بلیمەتو، خواناسی گەورەی کورد، مەلەوی تاوە گۆزی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە، لەچەن شوێنا، خستو نێیە ناو، هەڵبەستە

به‌رزه‌ کانی خۆیه‌وه‌، که‌من له‌ناو دیوانه‌ چاپ کراوه‌ که‌یدا، نه‌م دیوه‌[1]

(٥) مه‌لا ئه‌فووری حافظ: به‌ راستی تاڵ و، شیرینه‌ که‌ی، هه‌رچه‌ن له‌ فارسیێوه‌ وه‌ری گرتووه‌، هه‌نگوێنی شه‌مه‌ تورو که‌ی دووای پێوه‌ دانی هه‌نگه‌ ژاڵه‌و، ژه‌نگه‌ سووره‌ی چزوو، داره‌و،بۆ ده‌سه‌ڵاتی حافظێکی. روشندڵ و، نیوه‌ خوێنده‌واری کورد، له‌ مه‌یدانی جلیتبازی هه‌ڵبه‌ستا به‌به‌رزترین به‌ڵگه‌و، تاپۆ، دا، ده‌نرێ.

(٦) شامی کرماشانی: خاوه‌نی کۆمه‌ڵه‌ هه‌ڵبه‌ستی (چه‌پکه‌ گوڵ) که‌ ماموٚستا هه‌ژار، په‌سندنامه‌یه‌کی له‌سه‌ر نووسیوه‌، وه‌ک خۆی ڕا، ده‌گه‌یه‌نێ نه‌خوێنده‌وار بووه‌، ئه‌م روناک بیره‌ روشن دڵه‌ له‌ ساڵی ١٣٠٠ هه‌تاویدا، له‌ کرماشان هاتۆته‌ دیناوه‌، سێ، چوارساڵ له‌مه‌به‌ر، دووسێ رۆژ، پێش ئه‌وه‌ی چاوی دڵی، به‌ چاپکرنی هه‌ڵبه‌سته‌ کانی رۆشنتر بێته‌وه‌ بۆ هه‌میشه‌ ماڵ ئاوایی له‌ گه‌ل و، هۆزو، نیشتمانه‌ که‌ی کرد، دیاره‌ هه‌ر، وه‌ک ماموٚستا هه‌ژار ده‌فه‌رموێ. ئه‌گه‌ر شامی هه‌ر پارچه‌ هه‌ڵبه‌ستی (کرا نیشنی) دانا باو،به‌س. بۆ پایه‌و، پله‌ی به‌رزی شاعیری ئه‌وان به‌س بوو،

(٧) مه‌لا موصطه‌فای که‌لبی ره‌ضاخان، (سه‌رچنار) ناوچه‌ی چۆمی مه‌جید خان، ئه‌م ذاته‌، ده‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی ڕۆشن دڵ بووه‌، ماوه‌ی چه‌ن ساڵ له‌ ئاوایی گۆلی مه‌رزینگان و، سه‌رچنار، هاوژێ له‌ته‌ک، به‌ڕیوه‌ بردنی، رێ و شوێنی به‌ر نوێژی و، ماموٚستایه‌تی، ده‌رسی زۆربه‌ی زانست و، کتێبه‌ئایینێ‌یه‌کانی کوتۆ ته‌وه‌.

(٨) مه‌لا عه‌بدولای بانه‌یی، برازای ماموٚستا مه‌لایه‌حیای مه‌شووری بانه‌[2] ئه‌م ذاتــه‌ش پیاوێکی زاناو، هۆنه‌رێکی به‌ده‌سه‌ڵات بوه‌،

---

١. به‌لام ره‌نگه‌ له‌ دیوانه‌ی که‌ی ماموٚستای خوالێ خۆشبوو، ماموٚستا موفتی‌زاده‌ دا، «بێ».

٢. به‌و جوره‌ بویان گیراو مه‌.ته‌وه‌ ٦٠٠ شێعری له‌سه‌رسبوطی له‌ صه‌رف و نحودا، زیاد کردۆه‌ ←

هەموو زانستە ئیسلامیێکانی بەدەرس، گوتوّ تەوە هەڵبەستی عەرەبی و، کوردیش زوّر هەبوّوە، بەڵام، وەک زوّر بەی شاعیرانی ولات هەڵبەستەکانی بلاّو، نە کراوەتەوە.

(۹) خالە قە کوێری خانەقای برهان، وەک دەگێڕ نەوە بێ چاو ساغ بە سواری و، بە پێیان. هاتووچوّی سابلاّغ و شار ویّران، میراویّ مەلا خەلیل، دیوی نەڵین و، شوێنەکانی تری کردوّوە.

(۱۰) بێ‌ڕەنگی کرماشانی، میرزا کەریم، کەلەماوەی ۱۲۸۰ هەتاوی تا ۱۳۳۲دا ژیاوە، وەک عەلی ئەکبر، میر سەلیمی لە کتیبی[1] شاعیرانی کوێردِا، دەڵێ میرزا کەریم، هەر بەمناڵی کوێر بوّو، نەیتوا نیوە، درێژە بە خوێندن بدا، بەلاّم بەهوّی هەستان و، دانیشتن، دەگەڵ ماموّستاو، زاناکانی کرماشاندا، خوّی گەیاندوتە. پلەی یەکێک لە هوّنەرە گەورەو، نێو دێرەکانی ولاّت.

(۱۱) مەهجوری کرماشانی، ئەحمەد، کوڕی ئاغاخانی گوّران کەلە سالی ۱۲۸۹ کوّچی هەتاویدا. کوّچی دوایی کردوّوە، بەووتەی میرسەلیمی لەتەمەنی دەساڵیدا، کوێر دەبێ، بەلاّن بەهوّی پیوەندی گرتن و، تێکەلاوی لەتەک، ماموّستاو، زانایانی ولاّتا. بەتایبەت، برا گەورەکەی واتە فەرەجی جەلالی، لەئاکاما، هاتوّتە، ناو کوّڕی هوّنەرو، هونەروەرانی کرماشان و، لەڕێزی. ساز لێدەرە، بەناو بانگەکانی ولاّتا، جێگای بوّ. دیاری کراوە، ناوبراو، لەویّژەو، ئەدەبی فارسی و، کوردی زاراوەی کرماشانیشا، دەسەلاتێکی، باشی بوّوە، بەلاسایی کردنەوە لەئەبوونەصری فەراهی. فەرهەنگوّ کەیەکی فارسی و، کوردی هەرلە

---

نە وچەشنەی تشریح الافلاکی بەلای ماموستا پیرە بابەوە خوێندوە بەدەرس گوتویەتەوە دەرسی تهذیب الکلامی بە موفتی (سفتی) مەشهوری سەقز ملاعبدالعزیز گوتوّ، حاشیشی بەسەر هەمو عیلمەکانەوە هەبوە:

۱. شاعران کور (فارسی).

سەرکێشی (نِصابُ آلصبیان) داناوە، کە ئەمەش نموونەیەتی

کـە پـوولـەک (سُـن)اسـت و، لـم (شـکـم)
دیـە «دیـدە» دان و، «دەهـان» اسـت دەم
پـت و، لـویـت «بینی» بـود. «پـا» قـول اسـت
بـەلـەمووک «ئـارنـج» «گـردن» مـل اسـت.
چـەنـە (چـانـە) مـیـدان و «دنـدان» دیـان
بـود لـیـوو، لـچ «لـب» زبـان، دان زوان)

دیارە، ئەم جۆرە هەڵ کەو توانەمان زۆربوون و، ئێستاش هەر، هەمانن بۆوێنە، وەستای کوچک ئۆطەمیش وەستارەحیم، ئەگەر مـاوەی پـێ بـدرێ و، بـتـوانـێ، لـە هـەمـوو، بـارێـکـەوە وەک، ئەستێرەیەکی ڕوناک، ئاسمانی تاریک و، ئەنگوستە چاوی ئەخوێندەوارانی ئەمرۆی وڵاتەکەمان بەهەڵبەستە، بڕ گەدارو، خۆ ماڵێکانی ڕون دە کاتەوەو، زۆرشتمان. بۆ، داهاتوو، بۆ، تۆمار، دە کاو، ناوی خۆشی لەڕێزی هەڵکەو تۆوەکان و، ناودارەکانی کوردا جێ دەکاتەوە

کە وابوو، هەروەک زۆربەی ئەوانەی سەبارەت بەئەحمەدی کۆریش شتێکمان لێ گێرانەوە، هەرلەسەر، ئەو بارەن، دەکرێ، ئەحمەدی کۆر ئەخوێندەوار بووبێ و، بەم جۆرەی مامۆستا مەلا عەلی وەلزیش فەرمویان، قورئان و، تەجویدی خوێند دبێ بەڵام پاش گۆرانی، باری بیرو، باوەرو، چوونەسەر، ڕچەی جواناسان تاکۆ تایی ژیانی، لای مزگەوت و، فێرگەو، فەقێ و، مامۆستاکانی ئاینی و، ڕێگەی ئەقشبەندی بەرنەدابێ و، لەم ڕێگایەوەنە خوێندە وارێکەی، خۆی پڕ کرد بێتەوە، بەتایەبەت واتاو، لێک دانەوەی مانای قورئانی پیرۆز و، فەرمایشەکانی حەضەرەتی ڕەسوڵ و، هەر

وه‌ها ، مێژوو، وێژه‌ی فارسی و، عه‌ره‌بی و، تورکیش فێر بوو بێ که‌وا ، به‌م جۆره ڕسته‌و، ووشه‌و، واتای قورئان و، حه‌دیث بخاته ناو، چوار چێوه‌ی هه‌ڵبه‌ست و، تێک هه‌ڵ کێشانێ‌وه به‌لاّم (ماموّستا هه‌ژار) به پێچه‌وانه‌وه، لایان وایه، ئه‌حمه‌دی کۆر وه‌ک زۆربه‌ی دڵ ڕۆشنه‌کانی تری کورده‌واری، دوای خوێندن.و، له‌به‌ر کردنی قورئان و، فێربونی وێژه‌و، ئه‌ده‌بی فارسی و سه‌ره‌تایی، هیندێک کتێبی وه‌ک گولستان و، بۆستانیشی خوێندۆو به‌م چه‌شنه کوێره سیوادێکی هه‌بوۆه، پاش ئه‌وه‌ی که‌وتوّته سه‌ر، هه‌ستی صوٚفیایه‌تی و، خواناسی تایه‌به ته‌وه به‌هوٚی هه‌ستان و، دانیشتن و، ئاموو، شوٚی هێندێک ماموٚستاو، فه‌قیه‌ی هاو بیرو، تیگه یشتووه خوێنده‌وارێکه‌.ی تیرو، ته‌سه‌لتر کردوٚوه، دیاره ئه‌م ، مه‌به‌سته‌ش، له‌ناو کوٚمه‌ڵی کوردا ، زوٚر باو، بوٚوه‌و، تائه‌و سالاّنه‌ی دوایش له‌بره‌و، نه که‌وتبوو، ده گه‌ڵ، منداڵێکی کوێرله خوێندنی قورئان و، ته‌جوید ده بوٚوه، ده‌یان نارده حوجره‌و، ده‌ستیان پێ‌ده کرد، به خوێند نی زانسته سه‌ره‌تایێ یه‌کانی زمانی عه‌ره‌ب و، هێندێک، نامیلکه‌و، کتیبوٚ که‌ی فارسی، ته‌نانه‌ت ماموٚستای چاز انیشیان لێ هه‌ڵ که‌و توٚ وه، کاکلّی باسه که ئه‌وه‌یه، هێندێک لایان. وایه، سیوادو، زانستی شێخ ئه‌حمه‌د مه‌وهوب و، خودا پێداوه بوٚوه واته بێ هه‌وڵ و، تێکوشان و، ده‌رس خوێندن، خودا . زانستی وه‌به‌ر ناوه، تاقمێکیش، پێیان وایه، مه کسوب و، وه‌ده‌س خراوه یانی به هوٚی هه‌وڵ و، تێکوٚشان و، فێر بوونه‌وه، وه‌ده‌ستی خستوٚه، دیاره خوٚشی نه باسی خوێندن و، نه، نه خوێنده‌واری خوٚی، له هه‌ڵبه‌سته کانا ناکا، به هه‌رچه‌شنێک بێ پیاوێکی بیلمه‌ت و، خواناس و، چازان و، خاوه‌ن هه‌ست و، بیرێکی به‌رزی، ڕوٚشن دلاّنه بوٚوه، که‌م کومه‌لّی تر، پیاوی وایان لیێ هه‌ڵ که‌وتوٚوه

هەڵبەستی یا رەسول‌اللّە هی کێیە؟
ئەحمەدی کۆر، یان ئەحمەد موختار بەگی جاف؟

ئەوەی راست بێ. لەڕۆژی هەشتەمی مانگی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٥٥ ی کۆچی هەتاویدا، چوومە کتێبخانەی زانستگای تاران بۆ موتالاو، لێ تۆژینەوە سەبارەت بە ئەحمەدی کۆرو، چەند مەبەستێکی تر، خەریکی، خوێند ئەوەی، کتێبی، (بزرگانو، سخن سرایان آذربایجانغربی) واتە، پیاو، گەورەو، هۆنەرانی ئاذربایجانی ڕۆژئاوا، کۆ کراوە، وەی ئەحمەد، کاویان پوور، بوم، دیم مامۆستا موحەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی لەسوچێکی کتێبەکەوە، لەسەر ئەم پارچە هەڵبەستە. نووسیویانە.

این قصیده از احمد مختار بیگ حاف است، اشعار أحمد کور صوفیانه و عارفانه است م ـ ج ـ ڕۆژبیانی منیش ئەمەم نووسیێەوە، پاشی دوسێ ڕۆژ چومە رادیۆو، کارەساتە کەم، عەرض کرد، فەرموی، سەرەڕای ئەوەش ئەم پارچە هەڵبەستەم، لەناو کۆمەڵە هەڵبەستی ئەحمەد بەگا دیوە، ووتم، بەم بەڵگا نە، ئەمانە هی ئەحمەدی کۆرن، (١) هەرصۆفی و، خوانا سێکی پیری موکریان کەئەم پارچە هەڵبەستەشیان لەبەرەو، دەم بە دەمو، سینگ بە سینگ، لەزەمانی، شێخ، ئەحمەدەوە، تائێستا، داویانە، بەیەکتر، هەربەناوی ئەوەوە ناسیویانەو، خوێندوو یانەتەوە، (٢) دوکتور مەجدی لەساڵنامە کەیا، کە بێ گومان لەباوکی پایە بەرزو، زانای خۆی، مامۆستا مەلاحوسین (با پیرئاغای کوڕی حەسەن ئاغای قا لوێ گەورک، کە پاش هاتنەناو فەقیێان نیوە کەی دە گوڕن و، دەیکەنە حوسین) بیستوۆە، ئەم هەڵبەستەی بە ناوی ئەحمەدی کۆرەوە، داوەتە قەڵەم دیارە مامۆستا مەجدیش کە لەزەمانی فەقیێایەتیوە، تا کۆچی دوایی

هه ر له مهاباد ، بوۆه، له مامۆستاو، صۆفی و، پیره پیاوانی شارو، ناوچه، ئه م مه به سته ی وه ر گر توۆه، و، جیێی باوه ڕه (٣) له چه ن نو سراوه ی ده س نوس و، کۆنا ، که ده چنه وه سه رسالّه کانی ١٣١١ و، ١٣٢١ ی کۆچی مانگی و، له، که رکو کی عێراق نوسراو، نه ته وه و، به لای منه وه هه ن، ئه م پارچه یه ش به ناوی ئه حمه دی کوّر، ده گه ڵ ئه وانی تردا ، به ناوی ئه وان، له قه ڵه م دراوه (٤) شیّوه ی کیّش و، داڕژتن و، قه واره و، بیچمی ئه م هه ڵبه ستانه، ده گه ڵ هه رامه کانی ئه حمه د به گا ، نایه ته وه چونکو، هه ڵبه ستی ئه حمه د به گ، پتریان سوارو، گشتن، به پیّچه وانه ی ئه حمه دی کوّر، که زۆربه یان، پیاده و، خاویلکه و، شلن.

نمونه ی هه ڵبه ستی ئه حمه د به گ ئه مه یه:

نه رگسی، شه هلا، غولامی دیده یی مه خمور نه
دڵ، وه کوو، بولبول هه میشه عاشقی مه جبور، نه
مه نعی تۆ نا که م، که بێ باکانه خۆینریژی ئه که ی
موفته ضای ئه حواڵی طه بعی سه رکه ش و، مه غرور، نه
به سیه نی نا که ی، له حه ق ئه م به نده بێ لوطفی ئه که ی
ئه حمه دی بیچاره نه نها عاشقی مه غرور، نه

(٥) ڕه نگه نوسینه وه ی ئه م پارچه هه ڵبه سته، له ناو، کومه ڵه شێعره کانی ئه حمه د ، به گاهه ڵه ی هاو نیّوی بیّی، من خۆم له ساڵی ١٣٣٩ ی کۆچی هه تاوی دا ، کاتێ ده رسم له خزمه ت حاجی مه لاعه لی حه سه نزاده ی حه مامیانی بن ئاموزام له ئا وایی بیڵوێ مه ریوان ده خوێند ، له مه لاعه بدولاّی کوڕی کاکه حه مه ی ناریم، پرسی بۆچی کاکه حه مه، هه ڵبه سته کانی به یارمه تی شێخ بابه عه لی شێخ مه حمود به چاپ نه گه یاند (ئه وه ش بڵێن کاکه حه مه ناری که



# ناری

زو، له ره وضه ی موصطه فا ، که بیژه ، یا خیر البشر
نیمه ، تویشه ی زیگه ، جوز ئیخلاصی ئالی ( طاهرین )
ناری ( ۱۸۷۴-۱۹۴۴ )

ئه ی خاکی وه ته ن بۆچی چه مه ن ، چۆڵه ، له بولبول ؟!
وه جهی چی یه ، به م زه نگه ، نه ما جیلوه گه ری گوڵ ؟!
ئه ی خاکی وه ته ن بۆچی نه ما ،سه یر وصه فاکه ت ؟!
بۆ زیرو ، زه به ربوو، به ده می قه صری وه فاکه ت ؟!

نووسه‌ری شێخ مه‌حمود بوۆه. له‌وێژه‌ی فارسی و، نویسنی په‌خشانی کوردیشا که‌من خوۆم‌ده‌ قی دو نامه‌ی ئه‌م ذاته‌م دی. بوٚ شێخ مه‌حمود و بابا عه‌لی نوسیبوون، زوٚر سه‌رکه‌و توو، ماموٚستا بووٚه، به ڕاستی ئه‌وده‌مه‌ی په‌خشان نووسین زوٚرباونه بووٚه، ئه‌وان، جێگای خوٚیان له‌سه‌روی هه‌موو، نوسه‌ره کورده‌کان‌دا، کردوٚته‌وه، دروٚشمی. ماموٚستایی به‌که‌س نه داوه‌و، به، به‌ژنی خوٚی بڕ یوه)

گوتی باوکم، له‌که‌تره خه‌می و، بێ ئاگایی و، لێک جیانه کردنه‌وه‌ی هه‌ڵبه‌ستی ئه‌م و، ئه‌وی مه‌طبه عه‌داره‌کان توڕه ببوو، فه‌رموی تا ماوم. هه‌ڵبه‌سته‌کانم ناده‌مه، ده‌س ئه‌م لاژگانه، چونکوو، پارچه هه‌ڵبه‌ستێکی باوکمیان خستبوٚه ناو، دیوانه که‌ی طاهیر به‌گی جافه‌وه، طاهیر به‌گ و، باوکم فره به‌یه که‌وه به‌ینیان خوٚشبوو، ئه‌وان له پێنجوێن و، ئێمه‌ش له گره‌واته ئێره (بیلوو) بوێن، هاتوو چوٚی یه کترینیان ئه‌کرد. هه‌ڵبه‌ستیان بوٚ، یه‌ک ئه‌نارد. تائه‌وه‌ی روٚژێ طاهیربه‌گ، په‌نجه‌ی واته قامکی به‌ده‌مانچه ئه‌پێکێ باوکیشم، پارچه هه‌ڵبه‌ستێکی دانا بوو، که ووشه‌ی ئالی طاهیرینی تیا بوو، دیاره له‌وێیا، نزا و، پاڕانه‌وه له‌خواو، ده‌س گرتن به چاک و، داوێنی. حه‌ضره‌ت ره‌سول و، ئالی، طاهرینی، نانی بوو، پاش کوٚچی دوایی طاهیربه‌گ، میمکی واته پوری طاهیربه‌گ هه‌ڵبه‌سته‌کان ئه‌داته چاپ و، ئه‌م پارچه هه‌ڵبه‌سته‌ی باوکیشم هه‌ربه ناوی طاهیر به‌گه‌وه ئه‌خه‌نه.

ناو، دیوانه که‌وه‌و. به‌خوا، ئه‌یسه‌ش فره که‌س هه‌رلایان وایه‌ هی طاهیربه‌گه، نه‌ک هی باوکم، هه‌ڵبه‌ت مه‌لا عه‌بدولاش ڕایه‌ک پاش فه‌وتی کا که‌حه‌مه، له‌سه‌رخواستی شێخ بابه‌عه‌لی، شنگڵ، له‌خوٚی ئه‌داو، دیوانه که‌ی باوکی، له‌پشت ئه‌به‌ستێ و، له‌ڕێگه‌ی شاره‌زوره‌وه ئه‌ڕوا، بوٚسوله‌یمانی. کاتێ ده‌چه‌ته‌لای شێخ



**تایه ربه گی جاف (۱۸۷۵-۱۹۱۷)**

ناچاره ئه گه ر، وه ربگه ڕێ پردی ته حه موڵ          (سیروان ) سروشکم ، که ئه کا ، هاژه ، له ،(سه ر) دا

---

به بۆنه ی دور ختنه وه ی شێخ مه حمود. بو هیندوستان گوتراوه

بابه عه لی، ته ماشائه کا، پرێسکه، که ی، به پشته وه به لاٚم، هه ڵبه سته کانی دا خستووٚه، شێخ بابه عه لی زوٚری سه رکوٚنه ده کاو، مه لاعه به، به ده ستی خالّی یه ٚوه نه گه ڕێته وه، ئه مه شم هه رله خوٚی شنه فت

(٦) وه ک باسکرا، ئه حمه دی کوٚر ده سه لاتی به سه رواتای قورئان و، فه رمایشی حه ضره تی ره سولاّ بوّوه، که وا بوو سه ره ڕای ئه وه، که ده توانین بڵێن ئه م پارچه هه ڵبه سته ش هه رصوٚفیانه و، خوانا سانه یه، چونکو، هه رله سه ره تاوه تا کوٚ تایی سوره ی موباره کی، فاتیحا، به پێی بوٚچون و، لێک دانه وه ی خوٚی، هه موی هه رنزاو، پاڕانه وه یه، ئه مه ش بێژین، ده گه ڵ هه ڵبه سته کانی تری ئه حمه دی کوٚرا، له باری کا کڵ و، واتاو، دارشتنیشا. توٚ فیرێکی نییه، پاش ئه م هه موو، دریژ دا، دریێ من، ماموٚستا، روٚژبه یانی فه رموی (مه لا) ڕه نگه هه روابێ:

هه ڵبه ستی به هاره ئی شێخ ئه حمه دە یان که سێکی دی؟

هێندێ که س. به م به ڵگانه ی خواره وه لایان وایه. نا کرێ هی ئه حمه دی کوٚر بێ، (١) له م هه ڵبه ستانه دا باسی زوٚر شتی وه.ک ڕه نگ، ڕو، دیمه ن و، ئه وانه کراوه، که ئه شێ، به چاوی ڕون سه یری بکرێ، نه ک، به چاوی د ڵ و، هه ستی ده رون (٢) له کوٚ تایی ئه م هه ڵبه ستانه دا، ته نیا به ناوی ئه حمه د، قنیات کراوه و، ووشه ی کوٚری، به شوێنانِه ها تووٚه، (٣) له نوسراوه که ی قاضی شنوٚدا، که خه لیفه سه یدیان چاپی، کردوٚوه، ئه م پارچه هه ڵبه سته نه هاتوٚوه (٤) باسی گوڵ و، مه ل و، به رامه و، بوٚن و، شتی که ی به م، جوٚره، که له ته ک خووو، خواناسی ئه حمه دی کوٚر،دا نایه ته وه ده ری ده خات ئه م هه ڵبه سته هی شێخ ئه حمه دی کوٚر نییه، له ولاٚمی ئه م پرسیارو، ره خنه گرتناته دا، ده ڵێن، (١) ئه گه ر هه رشتێک به چاو، نه بنیرێ، مرخ و، هه ست نه بزوێنێ و، هوٚنه ر



شێخ مه حمودی نه مر
(١٨٨٣-١٩٥٦) (١٣٠٠-١٣٧٥)هـ-ق
بڵێ ( ناری ) له کونجی میحنه ت و، غه م ، دا ، هه تا ، ماوی
به بێ ( بازی فه ره ح ) ئاخر ، له سه یران وشکارم چی

بازی فه ره ح واته : شێخ مه حمود که له سالی ١٩٣١ وه تا ١٩٣٣ ، له ناصریه ی عیراق ، دا ده ست به سه ر بووه ، کاکه حه مه ی ناریش نه م هه لبه سته ی بو دا ناوه

نه جووڵێنێ، نه توانێ بیخاته ناوچوار چێوه ی هه ڵبه سته وه، ئه شیا، هه رگیزاو، هه رگیز، خه یاڵ و، شتـی نه بنیراوو، وه به رچاو نه هاتوو، بۆ که س ڕام نه باو، نه لووا بایه، بخرێته ناو، ڕسته و، هه ڵبه سته وه، ماموٚستا گورانیش

نه ی فه رموبایه: هه رچی ئه کهم، ئهوخه یاڵهی پێی مه ستم،

[1] (١) بوم نا حرێنه ناو چوار چێوه ی هه ڵبه ستم
به لام ئه فسووس که ئه م شیعره جوانانه
باڵدارێکن جێی نا هێڵن هێلانه
هه ستی ده رون لێکدانه وه ی زمانم
بۆچ وه ها، دوورن، له یه ک، نازانم
ئه مه ویست، ده رون بکرایه وه، وه ک نۆمار
دمر کهونایه دونیای جوانتر، له به هار
(٩) له ناوه وه، ئه جربوبن ئه خوێنن
هه رگیز قه لم به کاغه ذ دانا هێنن

تا شت وه به رچاو، نه که و تایه، که س نه ی توانایه باسی بکاو، په سندی بۆ، هه ڵدا، ووتو، وێژ، ئه با، ته نیا پێوه ندی به مه حسووساته وه ساته وه هه بایه و، مه عقوولات له کووله که ی ته ڕیش دا، باسی نه کرا بایه، سه ره ڕای ئه وه ش زۆر به ی هۆنه ره کان باس و خواسی هاتنی به هارو، ڕه نگ و، رواڵه ت و، دیمه نی دڵرفێنی که ژو، چیا به رزه کان و، چۆنایه تی قه تاره و، گه ڕانه وه ی مه ل.و، په له وه ری گه رمێن و، جۆری نیشتنه وه یان له ده م چه م و، شه تاوان، له پیره پیاوو، ڕاوچی و، خێلاتێکان ده بیسن و، پاشان ده یان خه نه ناو

١. هه لبه ستی ٤ و ٥ و ٦ و ٧ چونکو زۆر جیگای نیاز نه بون نه م هێناون، بۆیان بڕوانه دیوانه که ی خودی ماموٚستا گوران:

هەڵبەستەوە، کەواتە ئەوەی زیاتر پێویستە گوێچکەو، بیستنە، نەک چاو، پێ کەوتن و، دیتنە، (٢) ئەگەر بەباشی سەرنج درابێتە هەڵبەستەکانی ئەحمەدی کۆڕ باش ڕون دەبێتەوە بەهۆی بەرتەنگی کێش و، قافیەوە لەزور، شوێندا، جێگای کۆر، نەبۆوەتەوەو، هەر ئەحمەدها تۆوە یان بە پێچەوانە. بە (کۆر) قنیانی کردوەو، وازی لە، ئەحمەدیش هێناوە کەواتە، ئەحمەدو کۆر قیرێ کەوای سپی یەکتر نین، تالیێک جیا بوونەوە یان ببێتە هۆی نەناسینەوەو، بەسەر نەکردنەوەی هەڵبەستەکانی ئەحمەدی کۆڕو، نەتوانین، هونراوەی ئەوان لەهی هۆنەرەکانی تر. هەڵا وێرین. (٣) نەهێنا نی ئەم پارچە هەڵبەستەو، نەبوونی لەنو سراوەی قاضی شنۆو، چاپی خەلیفەی مهابادا، نا بێتە، بەڵگەی ئەوە، بگوترێ. ئەگەر، هی ئەحمەدی کۆڕ بایە. ئەشیا، لەنا و هینەکانی ئەوانا، بنووسرابایە، چونکو، نوسراوەی گۆڕین، هەمبانەی[1] بۆرین نییە. هەموو، شتێکی تیدابێ، زۆربەی هەڵبەستەکانی ئەحمەدی کۆر، وە، دەس قاضی نەکەوتون تا خەلیفەش چاپیان بکا. وەک نەقڵەکەی خوا، لێ خوشبوو (مامۆستا هیمەنی) بەڕێزو، زانای بەناو بانگ (ماموستا مەلا کەریم) و، کوڕە زاناو، بە، ئەمەگەکانی لەسەر ووشەی (نەی سەوارو، نیساری) کە بەزۆر نەی سەواریان لەمەیدانی، ڕەمبازێنی هەڵبەستی مامۆستا (نالی) بردۆتە دەرو، نیساری شەڕ کەریان لەجیێ داناوە، چونکو لایان وا بوۆە، (فەرهەنگی موعین) بەحری موحیطە، ووشەیەک لەوێدا، نەبێ و، ماسێک لیڕەدا، نەبێ، لەهیچ قامووس و، دەریایەکی ترا، دەس نا کەوێ، هەڵبەت من ئەم مەبەستەو، چەن مەبەستی ڕۆشنکرنەوەی ترم، بە، بەڵگەوە، نا مادە

١. مەبەست هەنبانە بۆ رینەی مامۆستا هەژار نییە، چونکو ئەویش بەفەرمایشی خۆی هەموشتێکی تێدا نییە:

کربون، بیان نێرم، بۆ، (گۆ ڤاری سروه) بەڵام، بەداخەوە، وەک نووسر[1]اوە کانی من، ئەڕای پەذ یەل، ضەرەریان بێ، چاپ نەکران، منیش وازم، لەناردنیان هێنا (٤) باسی گوڵو، موڵو، ئاڵو، گۆری سوروشتو، شتیوا، لەنرخو، بایەخی ئەحمەدی کۆرو، هەڵبەستەکانی کەمناکاتەوە، چونکوبەپێچەوانەی زۆر، بیرو، باوەڕ، کەلایان وایە، ئەحمەدی کۆر، هەرلەڕۆژی هەوەڵەوە، لەزێی خواناسیو، دورەپەرێزیو، تەنانەت کەلک وەرگرتن لەشتە سورشتیو، ئاسایەکانی ژیانی، مرۆ فایەتیو، پێکەوە نانی ماڵو، مناڵیشا. پێمەلەی کردووەو، قولاپەشی تەڕنە بوەوە، من لام وایە. ئەم ذاتە پیرۆزەش وەک هەموو. خواناسێکی تر. تانە کە وتوتە. سەر. ڕچەی ڕاستو، ڕەوانی خوداناسی ڕاستەقانێوە، لەکاتی مناڵیو، لاویدا. هەڵبەزیوە. دابەزیوە، گەمەی کرددوە، دەگەڵ کوڕو، کاڵەکانی ئاوایدا. گەڕەکو، کۆلانی گرتووە، لاتاو، تووانجیدە هێندێک کەس گرتووە لەناو، کومەڵی ئەوساکەدا ژیاوە. گۆرانی گوتووە هەڵبەستی داناوە، فڕی بەخەڵک دا، داوە، باسی جوانی بەهارو، ئاڵو، گوڕی سەری ساڵو، هاتنەوەی قازو، قورینگو، وسۆنەو، بۆرەو، پۆڕو، قەتاری پەلەوەری مزگێنی دەری گەرمینو، کوێستانی کردووە، گوێچکەی. بەدەنگی زوڵاڵی، گۆرانیو، شەڕە باڵۆرەی لاوو، کیژولانی لادێ زرینگاوە تەوە، قارەو، قیژەو، قاسپەو، سیرەی، دەنگی مەلەکانی خۆو، وڵاتی، دەگوێدا، دەنگی داوە تەوە، تامەزرۆی هەستو، مرخی سوروشت خۆشەویتی

[1]. لەسەر هەڵبەستەکانی خانای قوبادی بەتایەبەت حەوت بەندەکانی، شێخ حەسەنی مەولانا وا، هەبونی گیراوە، شەدەی زمانی کوردی و فارسی، بونی پیتی ذال، شین، صاد، طی و ضاد لەزمانی کوردیداو، چەن مەبەستی تری زمانەوانی چەن جارم بۆنوسین، بەڵام، ولامی نەبوو، چونکو...

خوّی و، جوان پەسندی دەسکردەکانی خودای، بەم جورە شتانە شکاندوّوە، کەوابوو، دە کریّ بلّیّن، ئەحمەدی کوّر، لەوچا خ و، سەردەما نەدا، ئەم پارچە هەڵبەستەی داناوە، سەرەڕای ئەوەش، باسی سوروشت و، بە دیها توّوەکانی خودایی، هیچ چەشنە ناڵە باری و، نارێکیێکی دە گەڵ خودا، ناسیدا نییّە، بە لّکو، خوّی ڕێگای خودا ناسیشە، مە گەر، بوّ، ویشکە صوّفی بەرچاو، تەنگی هیچ نە دیتوو.(٤) ئە گەر ئەم پارچە هەڵبەستە هی ئەحمەدی کوّر نییّە. ئەدی، ئی کیّیە، یان ئەوەش بوّتە (شیرین و، تەشیّکەیوەفایی)و، نا کریّ وەفایی شتی و ای گوتبیّ. ئە گەر زیندوش بیّتەوەو، مەلا صالّحی (حەریق)و، مەلا مەعروفی (کوّ کەیی) و، دەسنوسە کەی خوّشی بیّنیّ. چونکو، ماموّستا (عەلی قەرە داغی) لای وایە میرزا یەک، ناتوانیّ، فەلە کیّات[1] بزانیّ. نابیّ، هی ئە و بیّ و، ماموّستا (هیّمنیش)د دانی پیدا نە هیّناوە وە وەفایی لە خەوی شیرنیشدا تەشی، نەر ستوّوە، دیارە تەشی ڕیّسیکی تریش نەبوّوە، کەوا، بوو نەشیرین و، تەشی نە بەهارە خاوەنیان نییّە، هەلبەت من ئەم مەبەستەشم ڕون کردووتەوە، بەلاّم ئیّرە جیّگای نیە (٥) وەک، لەبەرا، ڕام گەیاند، یە کیّک لەم دەسنووسانەی بەلای منەوە هەیەو، لەسالی ١٣٢٣، ١٣٢١ و ١٣١١ کوّچی مانگیدا لەشاری کەرکووک نوسراوەتەوە ئەم پارچە هەڵبەستە (بەهارە) بەناوی ئەحمەدی کوّرەوە توّمار کراوە، دیارە بە پیّی لیّ توّ ژینەوەی ئیّمەوەک باستان بو، دە کەین، ئەم میّژو لکەی ئاخری دە کەویّتە. ئاخرو، ئوّ خری ژیانی ئەحمەدی کوّرو، چەن سا لیّک دوای

---

١. بەلام ئەشی ئەوە بیژم وەفایی سەرەڕای ئەوە کە میرزایە کی هەرەچازانی فارسی بوّوە، وەک خوّی لە دەسنوسیّکی خوّیدا، دەلیّ. مەلای پیرەباب فەلەکی زانی مەشور ماوەیەک ماموّستای شیّخانی شەمزین بوّوەو، وەفایش دەرسی هەنەکیاتی بەلاوە خوّیندوّوە.

وه فاتی ئه وان. که وابو، هیچ گومانێک نا مێنێته وه، بۆ ئه وه ی بگوترێ ئه م پارچه هه ڵبه سته ش وه ک یاره سول الله ذه لیل و، دڵ ... هی ئه حمه دی کۆرنییه.

جا. خوێنه ره وه ی به ڕێز، ئه وه بوو، بۆ چوون و، لێکدانه وه ی من ئه گه ر، ئامانجه که م پێکاوه، ئه وه، هیچمان له هیچ، ئه گه ر، تیری. بیرو، زانستیشم کوێره ی کردوه و، توزیشم، لێ هه ڵنه ستاندوه، ببورن، چونکو، شان و، باهۆی زانینم. له وه پتر هیزی هه ڵداشتنی ئه م تیره و، کێشانی ئه وکه وانه به کێشه ی. نه بوه، هیوایه. کوڕه کانی داهاتوو، له ئیمه ی فه قێی، وڵات گه ڕو، شاخ و، کێو، دیتوو، به ناو، هۆزو، خێڵاتی و، نیشته جێ و، گوندو، شاره کانی زۆربه ی وڵاتا، ڕۆیشتوو، هه ل و، مه رجێکی باشتریان. بۆبڕه خسێ و، ئه م جۆره بابه تانه. چاکتر له منی کاربه ده ستی میری و، دوره وڵات، بۆ کۆمه ڵی خوێنده واری گه له که مان. ڕون که نه وه و، ڕێگای خۆ، ناسینیان، نیشان بده ن و، بیان خه نه سه ر ڕێگای پێ گه یاندن و، سه رخستن له م جۆره کوسب و، ته گه رانه دا.

## بادانه وه

هه رله زوه، له نا وئێمه دا، قاوه، ده ڵێن بادانه وه له ناو. هۆزی مه نگوردا، باوه، دیاره ئه م مه ته ڵه یه، زۆرتر، بۆ گه ڕانه وه ی خوارده مه نی ده کار، ده هێنری به ڵام، من به وه، قنیاتم نه، کردوه و، ده گه ڕێمه وه، سه رباسه که و، وته ی خوالێ خۆشبوو، حاجی قادری کۆیی ده که مه، بنچینه ی به ڵگه ی لێ ها تویی ئه حمه دی کوڕو، سوارچاکی ئه وان له گۆڕه پانی گیسکه کوڕانه و، گریوی گۆ، ده رکردنی پایه ی هۆنه ری و، گه یاندنه سه رشاره و، قه له

منداره‌ی بردنه‌وه‌و، هه‌روه‌ها، ڕون کردنه‌وه‌ی چه‌ن مه‌به‌ستێکی تر حاجی قادر. به‌پێی ئه‌م نرسراوانه‌ی خواره‌وه له‌سالی ١٨١٥ زایینی و ١٢٣٥ کۆچی مانگیدا، له‌ئاوایی گۆڕقه‌ره‌جی شاری کۆدا، هاتۆته دیناوه، له‌ساڵه‌کانی ١٨٩٢ ـ ١٣١٢ یان ١٨٩٧ و ١٣١٥ شا. کۆچی دوایی کردۆوه.

١) مامۆستا عه‌لائه‌دّین سه‌جّا دی له‌مێژوی ئه‌ده‌بی کوردا، ئه‌ڵێ. حاجی له‌سالی ١٨١٥ دا، هاتۆته دیناوه‌و، له‌ساڵی ١٨٩٢ شا، وه‌فاتی کردۆه.

٢) مامۆستا ئاوره‌حمان گیوی موکریانی له‌پێشه‌کی دیوانی حاجی قادردا ئه‌ڵێ له‌ساڵی ١٨١٥ ڕا، تاکۆ تایی ١٨٩٢ ژیاوه.

٣) مامۆستا ئاوره‌حمان سه‌عید له‌سه‌ره‌تای باسی ژیانی حاجی، له‌دیوانه‌که‌یا ئه‌نوسێ، حاجی له ١٢٣٥ کۆچیدا هاتۆته دیناوه‌و، له ١٣١٥ دا کۆچی کردۆه.

٤) سه‌ردار حه‌مید میران له‌پێشه‌کی دیوانی حاجیا، ده‌گه‌ڵ لێ تۆژینه‌وه‌ی که‌ریم شاره‌زاو، پێدا چوونه‌وه‌ی مامۆستا مه‌سعود موحه‌مّه‌د، ئه‌ڵێ حاجی له‌ساڵی ١٨٩٧ دا، کۆچی دوایی کردۆه.

٥) مامۆستا مه‌دحه‌ت به‌درخان له‌ڕۆژنامه‌ی کوردستان «لاپه‌ڕه‌ی سی‌م سالی ١٩٨٦ چاپی قاهیره له‌مه‌ڕ حاجیدا، ده‌ڵێ ئه‌م ذاته له‌ساڵی ١٨٩٧ دا، کۆچی دوایی کردۆوه.

٦) مامۆستا مه‌سعود موحه‌مّه‌د کۆیی له‌دیوانی حاجی‌دا، چاپ کراوی ساڵه‌کانی ١٩٧١ ـ ١٩٧٤ ـ ١٩٧٦ که‌سێ چواره‌می دیوانه‌که‌ی له ١١٧٥ لاپه‌ڕه‌دا، له‌به‌غدا چاپ

کردوه، ئه‌ڵێ، حاجی له‌سالی ١٨٩٧ دا، کۆچی دوایی کردووه، پاشان له‌سه‌ر باسه‌که ئه‌ڕواو، ئه‌لێ حاجی له‌ساڵه‌کانی ١٨٥٣ ـ ١٨٥٤ زایینی و ١٢٧٠ ی کۆچی مانگیدا، بۆ خوێندنی

فه قیێه تی و، یانه ی ئایینی ده گه ڵ حاجی مه لاعه ولاّی جه لیزاده.
واته با پیره ی مه سعود، دا، ئه چنه ناوچه ی با ڵه کایه تی عێراق و، خزمه ت مه لا موحه مه دی خه طی، پاش ماوه یه ک (١٢٧١ کۆچی ه) لێک هه ڵده بڕێن و، حاجی قادر. ئه چێته شاری شنۆ، سابلاّغی کوردستانی ئێران و، تاساڵی ١٢٧٩ کۆچی و ١٨٦٢ و ١٨٦٣ زاینی، له وێ ئه مێنێته وه، دوای ته واو، کـردن و، ئیذنی مه لایه تی وه رگرتن له ساڵی ١٢٨٠ دا، ئه گه ڕێته وه شاری کۆ، ماوه یه ک له ته ک کۆنه دۆست و، هاواڵی سه رده می فه قیێه تی خۆی، واته ماموّستاجه لیزاده و حه مه ئاغای نێوبه ده ره وه ی شاری کۆدا، به خۆشی ڕای ده بوێرێ پاشان له ده س نه یارو، هێندێک شێخی رواڵه تی جا رزده بێ و، به ره و، شاری ئه سته مبوڵ ده که وێته ڕێ. دوای چه ن ساڵ مانه وه و، ده رس دا، دانی منالّی بنه ماڵه ی به درخانیه کان له ساڵی ١٨٩٧، دا، کۆچی دوایی ئه کاو، له گۆڕستانی ئه بوو، ئه یوبی ئه نصاریدا، له په نـای گڵکۆی مامـوستـا نـالـی وه، بـه خـاک ئه سپێردرێ، دیـاره هه رلـه ئه سته مـبولّیـشه وه حـاجی نـامه، بـۆ جه لیـزاده ئه نوسێ و، سه رده می فه قیێه تی وه بیر دێنیته وه، ده ڵێ.

بـه فـیکـرت دێ زه مـانی چوێـنه بالـه ک؟

به بێخاوسی، نه، که وشم بوو، نه، کاڵه ک؟

ماموّستا جه لیزاده ش، وه ک ماموّستا مه سعود موحه مه د، ئه ڵێ له ساڵی ١٢٥٠ ی کوچی مانگیدا، هاتوّته دیناوه، له ساڵی ١٢٩٢ دا، له به غدا، ده گه ل زاناو، بیلمه تی زه مان، موفتی زه هاویدا. چاویان پێک که و توّوه له ساڵی ١٣٠٩، دا، له لایه ن حکومه تی عوثمانیوه، بوّ، وتوو، وێژ، ده گه ڵ کاربه ده ستا نی ئیران. ئه چێته سابلا غ، له سـالـی ١٣١٨، دا، کـاری ده رس و، مـاموّسـتـایه تـی. ئـه داتـه، ده س



**حاجی قادری کوَیی**

١٢٣٧–١٣١٤ هـ–ق

حاجی که سێکه بی کەس . بو ئیوه قوز ، ده پێوێ
گوێ لێ ده کەن ، ظه ریفه . ئای کەن بە لا له خوتان
ئه ی بێ نه ظیر وهه مته هه رتوی که به رقه راری
بێ دار وبێ دیاری بێ نەر و بێ پایه داری



مەلا مەحموودی بایەزیدی

مەلاموحەمەدی کوڕی، واتە جەنابی مەلاو، با وکی مامۆستا مەسعود موحەمەد، لە ساڵی ١٣٢٦ دا، بۆ هەمیشە کۆچی دوایی و، ماڵ ئاوایی دەکا، (ئەوەشمان لە بیر نەچێ. ئەوە کەمامۆستای پایە بەرز بابا مەردۆخی روحانی لەلاپەڕەی ٣٠٨ ـ ٣٠٩ بەرگی دوهەمی کتێبە کەیانا دەڵێن. جەلیزادە بە خزمەت مەولانا خالید ئەگاو، ئیذنی خەلافەتی لێوەرئەگرێ وەڕاستنا چێ دیارە لە پاشان ڕونیشی دەکەینەوە) کەوا، بوو، حاجی قادر لەساڵی ١٢٧١ کەوە تا ساڵی ١٢٨٠ وا تەنزێکەی دەساڵ لەشاری شنۆو سابلاغ و، سەردەشت ماوەتەوە، ئەمەلەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە، ئەم هەڵبەستەی ئەحمەدی کۆر. کە بەحیسابی ئەبجەد، ئەکاتە ١٢٧٠: گەر کەسێ، کا پرسیارە، بابێ مەعلووم ئەوشوومارە:
چووە لە هیجرەت یەکهەزارە، دوصەدو، شێصتو، بەداج:
ڕونی دەکاتەوە، لە کاتێکا. حاجی قادر چل و، پینج ساڵە، بوۆە، ئەحمەدی کۆر، هێشتا. زیندو، لەبەندی ژیانا ماوەتەوە، لە هەڵبەستێکی، کەیدا، کە ٢٧ ساڵ ئەکەوێتە بەر ساڵی ١٢٧٠ وە

شد، مکانت عرش أعلا، رؤیـة اللـه در، نظر
در، ذج و، کج. تا، نسج و، سج، ژۆژگارت بردەسەر

ئەوەمان، بۆ دەرئەخا، ئەحمەدی کۆر لەساڵی (١٢٤٣) دا، کە هێمان حاجی قادر لاوێکی تازە پێگەییشتوو، چاردە پازدە ساڵانە بوۆە، هۆنەرو هەڵبەست وێژێکی کارامەو، نێو دێر بوۆە. کەواتە جێگای خۆیەتی کاتێ حاجی لەشاری ئەستەمبووڵ و ساڵەکانی بەرلە کۆچی دوایی خۆیدا (١٣١٢ ـ ١٣١٥) یەکێک، لە مروارێیەکانی لیزگەی هەڵبەستی شاسەواری بەلاغەتی کوردان بە ناوی ئەحمەدی کور. بهۆنێتەوەو، بەزیندو، ناوی بەرێ و، بلێ،



**مامۆستا.مه سعود ، موحه مه د**

کوزی زاناو، بیلمه تی کوردجه نابی مه لای گه وره یه .دیاره ، ئه مانیش وه ک باوکیان بلیمه ت و ، پسپۆر ، ئازا،نه ترس ،به هەست و ، زاناو، به ئه مه گن سه بارت ، به ئایین و، هۆزونیشتمانه خوشه ویسته که یا ن . هه لبه ت له کوزی ئه م باوەکه ش . هه ر ، ئه مه ، چاوه زوان ده کری .



**جه نابیَ مه لاموحه مه دی کۆیی (١٨٨٠ - ١٩٤٣ه - ق )**

کوڕی حاجی مه لاعه ولاّی جه لی زاده و ،باوکی ، مامۆستا مەسعود، موحه مه ده (بڕاونه،لا پەڕە ی ١٠١ تا١٠٥ ) کتیبی ئاداب و، ڕسومی کوردان ، نوسراوه ی عه زیزموحه مەدپور :داشبندی

ئه‌حمه‌دی كوڕ، له‌شاری سابلاغه‌

به‌یته‌ كی باغه‌، به‌یته‌ كی داغه‌، و،

ئه‌وان به‌ زمان و، زه‌مانی حاڵ باس بكاو. بێژی ئیستێ، له‌شاری سابلاغ دا، نیشته‌ جێ یه‌. ئه‌مه‌ش بێژین هه‌رله‌و هه‌ڵبه‌سته‌ ده‌رئه‌ كه‌وێ زۆر وی ده‌چێ، حاجی له‌ كاتی فه‌قێیه‌تی ئه‌م هه‌شت نۆده‌، ساڵه‌ی، دا، له‌سابلاغ و، شاره‌ كانی ترا، چاوی به‌خودی ئه‌حمه‌دی كوڕكه‌و تبێ و، له‌نزیكه‌وه‌، ده‌ گه‌ڵ خۆی و، هه‌ڵبه‌سته‌ پڕله‌سوزو، هه‌ستی ده‌رون و، مه‌ڵحه‌م و، هه‌توانی، تاسه‌ی دینی ئۆگره‌ كه‌ی. واته‌ پیغه‌مبه‌ری مه‌زنی ئیسلام دا، ئاشنا بووبێ، یان له‌ ئه‌سته‌ مبوڵه‌وه‌. گوێی بیست بوو بێی ئه‌حمه‌دی كوڕ له‌شه‌مزین و، خانه‌قای شێخانی. نه‌هریوه‌. گه‌ڕاوه‌ته‌وه‌ سابلاغ و، ئیستا، له‌ویێه‌، دیاره‌ئه‌م هه‌ڵبه‌سته‌ی حاجیش كه‌ له‌سه‌ره‌تای لیز گه‌ی شاسواری به‌لاغه‌تی كوردان، دا، هێناوێ و، ده‌ڵێ: ئه‌وی خۆم، دیومه‌، یانه‌، خۆئه‌ ئه‌ری:ئه‌مه‌یه‌، بۆت، ده‌ڵێم، به‌ موخته‌صه‌ری،

ئه‌وبیرو، ڕایه‌ی من نزیک، ده‌ كاته‌وه‌ له‌راسته‌ قانی ( ‌ڕه‌نگه‌، حاجی، چاوی به‌ خودی ئه‌حمه‌دی كوڕ، كه‌و تبێ) ئه‌وه‌ش جێگه‌ی سه‌رنجه‌. وه‌ ک مامۆستا مه‌سعود موحه‌مه‌دیش ڕای گه‌یاندوۆه‌، حاجی قادر دوای ئه‌وه‌ی چۆ ته‌ ئه‌سته‌مبوڵ و، ده‌ گه‌ڵ ئاڵ و، گۆری سه‌ر كه‌و تنی پیشه‌و، بیری خه‌ڵكی ئوڕوپاو، لاوه‌، ئازادی خوازه‌ كانی تورکیاو، جولانه‌وه‌ی سه‌ر به‌ستی و، ئایینی شێخ عوبه‌یدیلاو، شیخ عه‌بدولقادری كوڕیدا، ئاشنا بوۆه‌، پتر، كه‌و تۆته‌ سه‌رباری هۆنینه‌وه‌ی هه‌ڵبه‌ستی نه‌ ته‌وایه‌تی و، گه‌لی، خۆ، به‌ دنیا، ناساندن :كه‌واته‌، پارچه‌ هه‌ڵبه‌ستی شاسواری به‌لاغه‌تی



**حه ماغای کویی**

سه ره ک هۆزی بنه ماڵه ی غه فوری ،پیاویکی که لیک خێرو،مه ندو ، ئازاو ، به ده سه لاتی سه ر ،
ده می خۆی بووۆه ،زۆری خزمه‌ت به ئایین و ، بنه ماڵه ی جه لیزاده ، کردووه .دۆستایه تی نزیکی ،
له که ڵ حاجی قادرو ، که یفی و ، شوکری دا ، هه بوۆه . له چاخی پیریشابوته حاکمی زه سمی شاره که ی خۆی (کۆ)
حه ماغای کۆیه مه ردێ بوو ، هونه ور        ته بیعه ت به روز ، خاوه‌ن فیکری ئه نوه ر
له بۆمیوان و ، موحبتاجینی ناوشار        دیوان خانی ، موهه یابوو . به ، یه کجار

(مامۆستا زیوەر)

کوردانی حاجی بێ گومان لەشاری ئەستەمبوڵ و، دوای چەن ساڵ مانەوەی لەوێ گوتراوەو، رەنگەی نزیکەی ساڵی ١٣٠١ ـ ١٣٠٢. یانی دو ساڵ. دوای وەفاتی شێخ عوبەیدیلا (١٣٠٠)و، گەڕانەوەی شێخ ئەحمەدی کوڕ، بۆ سابلاغ. کەوابوو، دەتوانین بڵێین، ئەحمەدی کوڕ، تائەو دەمە هەر، زیندو بوە. هەروەک گوترا، حاجی لەزەمانی (شیخ عەبدولقادر) دا، ژیاوەو، ئەم نیوە هەڵبەستە شی: غەوثی ثانی و، حاتەمی مەذهەب: هەرسەبارەت بەوان گوتوە، نەک. (شێخ عەلی کەرکوک) وەک کاک کەریم. شارەزا، بە ناشارەزایی. لەدیوانی حاجیا. ڕاگەیاندوە، چونکو هەروەک ڕونی ئەکەینەوە غەوث ثانی لەقەبی شێخ عبدالقادری شەمزینی یەنەک، ذاتێکی تر. ئەوەکە حاجی لەهەڵبەستە کەیا، ئەفەرموی، ئەحمەدی کوڕ، لەشاری سابلاغە، رونە شێخ ئەحمەد دوای ئەوەی لەنهری ئەگەڕێتەوە، ماوەیەک. لەسابلاغ دەمێنێتەوە، پاشان هاتۆتەوە ئاوایی عەمبارو، تا کۆتایی ژیانی هەرلەوێ ماوەتەوە، هەڵبەت. ئەوساکە. نەشاری بۆکان و، نەعەمبار، ئەوەندە، نێو، بەدەرەوە نەبون، ذاتێکی وەک حاجی قادر، لەئەستەمبوو لەوە ناویان بزانێ و، باسیان، بکاو ئەحمەدی کوڕ، بداتە پاڵ ئەوانەوە، بەڵام، سابلاغی موکری بەتایەبەت نێوبدێری بداغ سوڵتانی، دامەزرێنەری ئەوشارەچوجرەو، فێرگەو، مامۆستاو، فەقێی و، لێ بونی شابەندەری عوثمانی و، هاتوو، چۆی گەڕۆکە، نامۆیەکانەوە هەمیشە، نێو. بەدەرەوە، بوە، کەوابوو. دەکرێ کاتێ حاجی ئەم پارچە هەڵبەستەی هۆنیوەتە، ئەحمەدی کوڕ، لەعەمبار بووبێ، نەک لەسابلاغ، گوتمان نوسراوەی مامۆستا بابا مەردوخ سەبارەت بەساڵی لەدایک بون و، بەخزمەت مەولانا خالید، گەیشتنی، حاجی مەلاعەولاجە لیزادە، وەڕاست ناچێ، بەم بە

لگه یه‌، وه ک ئه زانین و، خوا، لیّ خوشبوویش شێخ عوبه ی دیلاّی شه مزینی، له مه ثنه ویکه ی خوّیا، سه باره ت. به ساڵی له دایک بون و، وه فاتی مه ولانا نوسیویانه، ده گه ڵ، نوسراوه که ی بابا مه ردوخا. ڕێک نایه ته وه، شێخ عوبه ی دیلاّ سه باره ت، به ساڵی له دایک بوونی مه ولانا ئه فه رمویّ.

آن تمام المعرفة عارف نژاد ▪ عارف عرفان تم تاریخ زاد (۱۱۹۲ه.ق) نام والد أحمدو، جدّش حسین ▪ نور به شد. آن سعید نشأتین. ماموّستا، عه لائه دین سه جادی و، ماموّستا مه لا که ریمی. بیاره یش، له کتیبی میٚژوی ئه ده بی کوردی و، عُلَمٰائُنا فِي خدمة العلم والدين، دا، ئه لیّن، مه ولانا له سالی ۱۲۱۳ دا، له خزمه ت (شێخ قه سیم) سنه یی، یان به واته یه ک (ابنُ ئاده می باڵه کی) ئیذنی مه لایه تی وه ر ئه گریّ و، له ساڵی ۱۲۲۰ دا، ئه چێته زیاره تی ماڵی خودا، له ساڵی ۱۲۲٤، دا، ده چێته خانه قای شاعه بدولاّی ده هله وی، له ساڵی ۱۲۲٦ دا، ئه گه ڕێته وه شاری سوله یمانی وپاشی ماوه یه ک. ئه ڕواته زیاره تی گلکوّی (غه وثی گیّلاّنی) له به غدا دوای شه ش مانگ ده گه ڕێته وه سوله یمانی، له ساڵی ۱۲۲۸ دا، به هوّی ناکوّکی و، نیوّان ناخوّشی ده گه ڵ تاقمی ده رویٚش و، لایه نگرانی (شێخ مه عروفی نوّدێی) ڕوده کاته وه به غداو، له وخانه قایه ی که پاشان ناوی نرا، خالیدیّه، خه ریکی. ده رس و، ڕێنوینی خه ڵک ئه بیّ. له ساڵی ۱۲۳۰ دا، له سه رخواستی مه حمود پاشای بابان که مز گه وت و، خانه قای بوّ دروست کرد بوو، گه ڕایه وه سوله یمانی‌، دیسانه وه له ساڵی ۱۲۳٦ دا، ویٚیان هه ڵ نه کردو، (شێخ عه بدولاّی هه ڕه وی) کرده جیێ نشینی خوّیی و، ڕوّی کرده ته ویلّه ی هه ورامان و، ماوه یه ک له، خانه قای یه کیٚک له جیٚ نشینه کانی واته (شێخ عوثمان سیراجه دّین) دا، مایه وه،

پاشان چۆوه به غدا. له ساڵی ۱۲۳۸ دا، له وی ڕۆ یی و، ڕوی کرده شام و، له ساڵی ۱۲٤۱، دا، بۆ جاری دو هه م ده چێته زیاره تی ماڵی خودا. له ساڵی ۱۲٤۲ دا، ئه م ذاته پیرۆزو، ئاواره یه له وڵاتی غه ریبایه تیدا گیانی پاکی. دایه وه، به گیان ئافه رین و، بۆ هه میشه ماڵ ئاوایی کرد و هه ربه م هۆیه شه وه بۆوه، که حاجی قادر له، ئه سته مبوڵه وه. به ده نگی به رز، به هاوالانی کۆن و، هاو، وڵاتیان ڕا، ده گه یه نێ و، ده لێ.

قوطبی زه مانه خالید، وه ک من، بوۆه، ئاواره

بێ قه درو، قیمه ت و، شان، بێ خانمان و، بێ نان

که وا بوو، نا کرێ مه ولانا له ساڵی ۱۲٤۲ دا، وه فاتی کرد بێ، به لام مامۆستا جه لیزاده، ده گه ڵ ئه وه شا له ساڵی ۱۲۵۰ دا، هاتبێته. دیناوه، به خزمه ت مه ولانا گه یشتبێ و، له وان ئیذنی جێ نشینی وه ر گرتبێ، هه روه ک نا کرێ (شێخ عه بدولقادری شه مزینی) کوڕی شێخ عوبه یدیلاش، به خزمه ت مه ولانا گه یشتبێ، چونکو ئه وه ی ڕونه، با پیره ی شێخ عوبدولقادر واته (سه ید طه ها) که هاواڵ خه لیفه ی شێخ عوثمان بوۆه له ساڵی ۱۲۲۹ کۆچی مانگیدا، واته سێ ساڵ دوای ئه وه ی شێخ عوثمانی طه وێڵه ببوۆه خه لیفه، له مه ولانا خالید ئیذنی خه لیفایه تی وه رده گرێ. به لام ده کرێ مامۆستا جه لیزاده شێخ عوثمانی چاوپێکه وتبێ چونکوو، شێخ سیراجه دّین له ساڵی ۱۱۹۵ دا، واته سێ سال دوای مه ولانا، هاتوته. دنیاوه و له ساڵی ۱۲۲٦ دا، له به غدا، به خزمه ت مه ولانائه گاو، ده بێته نۆ گرو، مریدی ئه وان، له ساڵی ۱۲۸۳ شا وه فاتی فه رموۆه به م پێیه کاتی وه فاتی شێخ عوثمان. جه لیزاده ۳۳ ساڵانه بۆوه، ده گه ل ئه وه ش هیچکام له نووسه ره کان دیارده یان بۆ ئه م مه به سته

نه کردووه و، هێندێکیان ڕاگه یاندۆه مامۆستا جه‌لیزاده مریدی شێخ عومه‌رضیائه‌دّین کوڕی شێخ عوثمان بووه، دیاره شێخ عومه‌ر پنجسالْ له جه‌لیزاده چوکتر بوه، چونکو شێخ له سالی ١٢٥٥ دا، هاتۆته دیناوه، به‌لام جه‌لیزاده (١٢٥٠) هاتۆته دنیاوه‌و، له ١٣٢٦ دا، وه‌فات ده‌کا و شێخ عومه‌ریش له سالی ١٣١٨ دا، هه‌لبه‌ت ئه‌م ته‌مه‌ن چوکیش نابێته هۆی ئه‌وه که حاجی مه‌لاعه‌ولاّ مریدی شێخ عومه‌ر نه‌بووبێ، ئه‌وه‌ی بۆمن (مه‌لاعه‌زیز داشبه‌ندی) له‌م دو نامه‌دا، که له‌نێوان شێخ ضیائه‌دّین و، مامۆستا جه‌لیزاده دا، ئالْ و، گوڕ کراوه، ده‌رکه‌وتوه ئه‌وه‌یه، ئه‌م دو ذاته نێوانیان یه کجار زوّر خوش‌بووه،هه‌میشه‌تاسه‌ی‌یه‌کتریان کردۆوه‌و،هه‌میشه،تامه‌زرۆی‌دیتنی یه کتر بون، بۆیه که‌مین جارله به‌غدا چاویان پێک ئه‌که‌وێ ئه‌مه‌ش پارچه هه‌لبه‌سته که‌ی شێخی ضیائه‌دینه: دیاره شێخ، له‌م نوسراوه دا، زۆری هه‌ولْ داوه، جه‌لیزاده‌ش وه‌ک هێندێک مامۆستای‌تر. بکێشێته ژێر ده‌سه‌لاتی خۆی و، بیباته (بیاره) و، خه‌رقه‌و، عه‌باو، به‌رمالی که‌وی و، خۆ مالی کردنی پێدا دا به‌لام جه‌لیزاده‌ی کۆنه هاوالْ و، هاوبیری حاجی قادری کۆ لْنه‌ده‌رو، ده‌ربه‌ده‌ر به‌هیچ چه‌شنێک مل‌به‌م به لْین و، مزگینانه نه‌داو، هه‌رگیز، روناکاته، بیاره‌و، ده گه‌ل ئه‌م هه‌موو، ناکۆ کی و، ته‌نگ‌و، چه‌لْه‌مه‌ی بۆی دێته پێش‌شان بۆ ئه‌و جوره خه‌رقه‌و، عه‌بایه. دا، نانه‌وێنێ و، وه‌ک، که‌لْ، له‌مه‌یدانی به‌ربه‌ره‌کانی و، خواناسی راسته‌قانیدا، ئه‌منیێته‌وه‌و، حاجیش له ئه‌سته‌مبو لْه‌وه‌ڕا، ده گه‌یه نی و، ده‌لْێ:

حاجی عه‌بدولاّ له ئاده‌م فیلتره
باو جودی ڕوتبه‌ یی پێغه‌مبه‌ری
ئه‌و به صه‌د، شه‌یطان له کۆ یه ده‌رنه‌چوو
ئه‌م به یه‌ک شه‌یطان له‌جه‌نه‌ت ده‌رپه‌ری

بسم اللّه الرحمن الرحيم

**نامەی حەضرەتی ضیائەدین شیخ عومەری بیارە بۆحاجی مەلا عەبدوڵڵای کۆی سەنجاق.**

دەمێکە کاغەذت نایە تەلامان
عەجەب ستی لەپەیغام و، سەلامان
(جەلی) دایم دەبێ جلوەی دیار بێ
لەنێو گێژاوی شەطبێ، یان، کەنار بێ
(عومەر) عومرێکە، بۆ، تۆ ئینتیظارە
لەشەوقی تۆ، وەکو، ئاو. بێ قەرارە
چی ئینصافێکە، گاهێ نێوی نابەی
چی فکرێکت هەیە بێ باکی. تاکەی؟
حەیاتی من بەیادی تۆ. مەنووطە
نەوازش چاوەکەم لایق بەخۆ تە
دەبوو، بۆخاطری تەفریحی یاران
بکەی سەیرو، صەفا، وەقتی بەهاران
ببینی (شارە زوری) بێ ذەرو، زوور
بچیتە کێوی هەورا مانی پڕ نوور
شەوێ تا فەجری صادق، دا بنیشی
بە ئومێدی وەفا، پێ ڕا، نە کێشی
وەکو، ئەو عالمانە، مل بە حەق دەی
هەزار، نادان. وەپێشی شەق و، لەق دەی

ئـیـجـازەی خـەر قـەو، تـاج و، مـوصـەلاّ
بـسـیـێـنـی، بـۆ رەواجـی کـاری دونـیـا
لـەعـوقـبـا. گـەربـلـێـن بـۆچـی وەهـات کـرد
بـلـێ دە فـعـی فـەسـادم بـۆ، دەهـات کـرد
مـنـیـش بـۆ، دەفعی ئـەو مـەنـهـی قـەبـیـحـە
تـەلاشـم کـرد، بـە ئـەلـفـاظـی فـەصـیـحـە
لـە ئـەصلی دین و، ئیمان، بێ خەبەر بوون
لە هەی هەی قالوُا، قوُلوا، بێ خەطەر بوون
بـەصـیـرەتـیـان نـە بـوو، تـا حـەق بـزانـن
حـەق و، بـاطـڵ جـو ۆی کـەن یـا بـزانـن
وە ئـیـلاّ عـالـم و، عـامـی و، مـەشـایـخ
هەموی موحتاج بەوون، هەم طفل و، ڕاسیخ
جەوابی حاجی مەلاعەبدولاّی جەلیزادە بۆ شیخ عومەڕ[1]:

بسم الله الرحمن الرحيم

(ئەمەر[2]) نامەت بەدەستی (گۆوجی) موخلیص
گەییشتە دەستی سستی عەبدی موفلیس
تەماشام کرد، هەموی لوطف و، عیتاب بوو
بە، هـەم ئـا مـیـزشـی قـیـشـرو، لـو بـاب بـوو
سـەلامـی مـن چـیـیـە بـۆ، تـۆی بـنـێـرم
ئەتۆی عەذب و، فوڕات من تال و، سوێرم
(جەلی) إسمم، خەفی رەسمم، دو رەنگی
مـیـثـالـی مـەسـئـەلـەی کـافـوورو، زەنـگـی

١. سەردێڕی نامەکان چۆن بون هەربەوجۆرە هێنا و من و. دەستکاری نەکراون
٢. ئەمەرواتە عومەر ناوی شێخی ضیائەدین بۆوە.

(سوها)ی بێچارە، قوربان، چۆن دیارە
کەوەقتی شەعشەعەی شمسُ النهارە
(عومەر) عومرێکە، گەر. مەیلی بەلامە
ئەدی بۆچ مەرکەزی دەردو، بەلامە
ئەتۆی بێ ڕوحم و، بێ ئینصاف و، بێ باک
وەئیلاّ من لەبەر، پێتام وەکو،خاک
هەمو عومرم بە پاییز چوو، لەهیجران
بەهارم هیچ نەدی بۆگەشت و، سەیران
بە قوربان شارەزووری چون ببینم
زەڕو، زۆرم نییە شا قاو، هەڵینم
لەبا تی کێوی هەورامانی پڕ نوور
لەژێر کێوی غەمان کەوتوومە، وەک موور
ئەگەر لوطفت ببێ پێ ڕا، دەکێشم
لەقافلەی موفلیسی هەردەم لەپێشم
ئەوێ ڕۆژێ کە تۆم، دیوە لەبەغدا
ملم، داوە، بەحەق وەاللّەو، بِااللّە
وەلی تۆ دەرحەقم بێ ئیلتیفاتی
نییە بڕوات، بەئیستیحقاقی ذاتی
بەظاهیر ئەز، سیوەاللّە، دەر، تەحاشی
بەباطن، شێخ، نەجمە[1]دّین تراشی
لەبۆیە بەعضەکی نادانی بێ فام
لەجێی بەرشەقّی دەم، بەلەقّە، لێ دام

---

١ . رەنگە مەبەستی ماموستا جەلیزادە شێخ نەجمەدّینی کوڕی شێخ عومەر بێ کە لەساڵی ١٢٨٠، دا هاتۆتە دیناوەو، لەساڵی ١٣٣٨ یشا کۆچی دوابی کردۆە، دیارە شێخی ضیانەدین هەشت کوڕی بۆوە بەلاّم لەنێو هەمواندا. شێخ نەجمەدّین و، پاشان شێخ عەلاوەدّینی کردۆتەوە جێ نشینی خۆی.

ئیجازەی خەرقەو، تاج و، موصەلاّ
بسێنم بۆڕە واجی کاری دونیا!
فرە خۆشە گەلێ خاتە بە جێیە
وەلی گەر حەز بکەی ئێرەش ئەوێیە
لەلای تۆ قوڕب و، بوعد، هەردو یە کێکە
بڵێ هەمیانە. بگرەو، ئاردی تێکە
لەبەر شێخان ئەگەرچی دین بڕاوە
بە تیغی تۆ، زمانی من بڕاوە
هەمویان قاطعی ڕێگەن بەجێدی
ئەوون، میصداقی ئایەی (لاتَهَدّی)
وەلی بۆ خاطری تۆ، بەندەیانم
زمان دەگرم. لەحەقیان تا بتانم
لەپاشی تۆو، خودا. بۆ خۆی عەلیمە
لە کەر کوکێ، دوعاگۆی شێخ (عەلی[1] مە

ئەوەشم لەبیرنەچێ کاتێ لەساڵەکانی ١٣٤٠ ـ ١٣٤١ کۆچی هەتاویدا لە ئاوایی (نییەی مەریوان) لەخزمەت مامۆستای چازانم (حاجی مەلا سەید عەلی ئەڵمانەیی) ئاخر مادّەی دەرسە ئایینیەکانم ئەخوێند چەن کتێبکم لە فەقییەکی مەریوانی کڕی کەتازەلە

١. مەبەست خوالێ خوشبوو، حاجی شێخ عەلی طاڵەبانیە کە لەساڵی ١٢٦٠ دا، پێی نا وەتە دنیاوە و لە ساڵی ١٣٣٠ دا. کۆچی دوایی کردووە دیارە ئەم ذاتە سەرەڕای ئەوە کەدەگەل حاجی کاک ئەحمەدی سولەیمانی هاواڵ فەقیی جەلیزادە بون و، لەخزمەت حاجی مەلا، ئەسعەدی باوکی جەلیزادە دا، دەرسیان خوێندووەزوڕیان یەکتر خوش ویستوە پیاوێکی گەلێک خواناس و، بە کەلک بووە، لەزانین و، لێک دانەوەی واتای قورئانی پیروزو، فەرمایشی حەضرەتی رەسوڵیشا فرە دەسەلات دار بووە جا بەم هۆیانەوە، دەگەل ئەوەشا شێخ عەلی لەسەر ڕیگەی قادری بووەو، جەلیزادەش پتر ڕێ ڕەوی نەقشبەندی و نۆگری مەولانا خالید بووە زوری ڕیز لە شێخ عەلی و، کاک ئەحمەد گرتووە. ئەوانیش ڕیزی ئەمیان لەبەر بوە. دیارە ئەم سی ذاتە بۆ هەموکەس جێگای ریز بوون و بۆخەلک بە کەلک بوون

سولەیمانیێوە گەڕا بوۆە. لەناویە کێکیاندا ئەم دوپار چە هەڵبەستەی سەروو، لەوەرقێکدا نوسرا بوونەوە، منیش تائێستا هەرهەڵم گرتبوون و، وەک دەیان نووسراوەی تر، هەزار کەلێن و، کولێنم پێ کردون و، ئەوانەمڕۆ. ١٣٦٧/١٠/٢٠ کۆچی هەتاوی لە شاری تاران. بە زمانی قەڵەم بۆ ئێوەیان دەگێڕمەوە، هیوایە ئەوانەش کەلکیان لێ وەرگیرێ.

## ئەحمەدی کۆر کۆری کێ یەو، لە کام هۆزە ؟

بە پێچەوانەی بیرو، بڕوای ئەوکەسانەی لەخۆیانەوە، ناوی کەریم، عەبدوڵاو، تریان لە باوکی ئەحمەدی کوڕ ناوە، وەک خوالێ خوشبوو مامۆستا مەلاعەلی فەرمویان، ناوی باوکی شێخ مەلا موحەممەدی باب یان با بۆ، بوۆوە، نیۆوی بابی شێخ ئەحمەد، هەرۆوەک خۆشی لەم هەلبەستەدا. ڕای گەیاندوۆە، شێخ بابا بوۆە. ئەحمەدی شێخ باب پدەر، مەدحی نەبی خیرُ البَشَر

گەربۆت نەواوبێ، بێ بەصەر ئەیمەن لە خوفی مورنەعیب

دیارە نیێوی بابا، هەرلەزۆوە، لەناو کوردەواری دا، وەک ئاردیان ئە[1]ردە. عەردە شیری بابەکان، بابەکی خورەمدین باباطاهیر شێخ بابای غەوث ئاباد (هۆنەوەنوسەرو هونەروەرو، لێ ها توو، شەهیدی ڕێگای خودا وگەل). بابا شێخی ئەلمانەی مەریوان، حاجی بابا شێخی تورجان. شێخ بابا عەلی سولەیمان و..... باو بوۆە، کەوا بوو، ناوی شێخ، کە زۆر لەنووسەرەکانیش داویانە تەپاڵ ئەحمەدی کۆرو، پێیان گوتووە شیخ ئەحمەدی کۆر، لەباو کیۆە.

١. ئەوەش بلێن ئەرد، هەرد، عەرض دە گەل ئەوەشا بەواتای زەوی و کەژو کۆیە لە، زارۆەی مادی و، ئاویستاداوانەی داد پەروەریش ئەداو، ناوی فرشتەیە کیشە.

پیێ گەییشتووە، چونکو تائەو، جێگایەی من هەڵبەستەکانی ئەوانم هەڵسەنگا دوۆوە، لەهیچکامێکیانا ناوی شێخی لەخوێ نەناوەو، رەنگەزۆریشی حەظ لەم ناوە نەکردبێ، وەک لەپێشا باسمان کرد. ئەحمەدی کوێر لە خێڵی سەرەگایەو، ئێستاش چەن بنەماڵەیەکیان لەئاوایی حەمامیان و، شۆڕیجەی ناوچەی بۆکان دا، نێشتەجێن. زۆر، ڕونە ئەوەی ماموۆستا مەلاعەلی سەبارەت بە ئەحمەدی کوێر گوتویانە دەگەڵ ڕاستەقانی. باشتر دێتەوە، چونکوئەمانەی لەباو کی خوێ وەرگر تووە کە ئەوانیش بەهۆی هاوکاتی دەگەڵ سەردەمی ژیانی ئەحمەدی کوێرو، هاو کەوشەنی پەسۆیی «لاجان و، شنوۆ (ئاوایی شیوەسماق)»و، پاشان کانی ڕەش و، عەمبارو، تورجانی بۆکان باشتر ئاگای لەژیان و، بەسەرهاتی ئەحمەدی کوێر بووە[1]. بەتایبەت کە هەرکیان. واتە شێخ ئەحمەدو حاجی مەلاعەبدولاّی وەلّزی لەسەر رێگەی نەقشبەندی بون.

وەک گوترا، ئەحمەدی کوێر لەنێوان ساڵەکانی ١٣٠٤ ـ ١٣٠٥ کوۆچی مانگیدا وەفاتی کردوۆوە، حاجی مەلاعەولاّیش کە زیاتر مەبەستە کە لەخوارەوەڕون تر. دەکەینەوە لە ساڵی ١٣٤٩ دا، کوۆچی دوایی کرددۆوە واتە پاشی ٧٤ ساڵ تەمەن را بواردن کەوابوو. دوای وەفاتی شێخ، ماموۆستا وەڵزی نزیکەی چل و سێ چوار ساڵ ژیاوە: بەپێی نووسراوەیەکی ماموۆستا مەلائەحمەدی حفید الولزی کە لەمەهابادەو لەسەرخواستی خوۆم. بەهوێی کاک خالید خالیدی دوۆستی لەمێژینەم، بوێی ناردوم و، سوپاسیان لێ دەکەم، نوسراوە، حاجی مەلاعەولاّی وەڵزی لەساڵی

---

١. مەبەست ئەوەیە حاجی مەلاعەولاّی وەلّزی لەئاوایی پەسوێ و کانی ڕەش و تورجان بوۆوە شێخ ئەحمەدیش لەئاوایی شیوەسماقی شنوۆو عەمباری بۆکان بوۆوە واتە هاولاّتی و، هاوزەمان بون، کەواتە گوتەی ئەوان لەخەڵکی تر سەبارەت بەشێخ ئەحمەد ڕاستترە.

١٢٧٥ ی کۆچی مانگیدا. لەئاوایی وەڵزی ناوچەی باڵەکایەتی سەربە گەلاڵەی کوردستانی عێراق هاتۆتە دیناوە،لەمانگی موحەرەمی ساڵی ١٣٤٩ شا، لەئاوایی تورجان کۆچی دوایی کردوە. ناوبراو. کوڕی مەلا قادر. کوڕی مەلاعەلی فەوزی وەڵزی یە،

**(مامۆستا کانی وەڵزی)**

وەڵزی چەن مانگێک لەخزمەت خواناسی گەورەو، چازانی بێ.وێنە بەریز مامۆستا مەلاعەلی قزڵجی تورجان. مەلاسەید حەسەنی چۆری کە، یەکێک بوە لە فەقییەکانی قزڵجی، مەلا عبدالقادری کانی کەوەیی لەبیارەی هەورامان، دەرس ئەخوێنێ پاشان دێتە سابلاغ و، لە خزمەت مەلاعەولای پیرەباب (کۆنە فەقیێ قزڵجی و، هاوال فەقیێی دوایی ئەوان و، دەرس خوێنانی خزمەت موفتی زەهاویی لە بەغدا، کە بە راستی مامۆستا پیرە باب لە فەلەکیا تا. وێنەی نەبوە و، زۆر نوسراوەی بەسەر کتێبەکانەوە هەیە) لە مزگەوتی هەباس ئاغا، ئیزنی مەلایەتی وە[1] ردە گرێ و، دەبێتە مامۆستا و، دەرس وێژەوەی ئاوایی پەسوێی ناوچەی لاجانی موکری.

پاشان دێتە کانیێ رەشی لای سەردار ئابادی بۆکان و، لەوێشەوە دەچێتە تورجان و، گلکوی پیروز شیی هەر لەوێیە، لەم نوسراوەیەوە ئەم مەبەستانەی خوارەوەمان بۆدەرئەکەوێ

١ ـ بە پێچەوانەی نوسراوەی مامۆستامەلاکەریم لە کتێبی

---

١. وەک دەگێڕنەوە هێندێک لەمامۆستا یانی صۆفی شێخی بورهان گا زندە لەمەلای پیرە باب دەکەن. بۆچی ئیذنی مەلایەتی بە مەلاعەولای وەڵزی داوە کە مریدی شێخی ضیائەدین بۆەو، دەگەڵ شێخیی بۆرهاندا زۆر تەبا، نەبون، دەشی ئێریتە ئاوایی بە سوێ کە پێوندی دەگەڵ شێخی بورهان دا، بووەو، ئاغایە کەشی مریدی ئەوان بوەلەولامادە فەرمۆی من کارم بە ناکۆکی نێوان دو شیخ نەبوەنەو زاتەم زۆر بەلاوەباش و. باسەواد بوو، ویستم کەلکم لێ وەر گرێ و، خەڵکیش لەزانست و پیاو چاکی ئەوان کەلک وەرگرن.

عُلمائنا فی خدمة العلم والدّین و، ڕای ماموّستا بابا مه رووخ له کتێبی مه شاهیری کوردا، که ئه ڵێن (حاجی مه لاعه بدولاّی وه لزی له وه ڵزی له سالی ۱۲۸۵، دا، هاتوّته دونیاوه و، له سالێ ۱۳٦۰ شا، وه فاتی کردوّوه) له سالێ ۱۲۷۵، پێی ناوه ته دونیاوه و، له سالی ۱۳٤۹ دا کوّچی دووایی کردوّوه.

۲ ـ ئه ودوزاته ی سه روو، ڕایان گه یاندوّوه له بیاره له خزمه ت ماموّستامه لاقادری کانی که وه یی إجازه ی وه ر گرتووّه، به لاّم ده ر که وت له سابلاّغ وله خزمه ت ماموّستای پیره باب ئیذن دراوه.

۳ ـ ماموّستا مه لا که ریم نوسیویانه له ئاوایی وه لزێ ناوچه ی موکریان، له دایک بوّوه، ناوچه که موکریان نیه و، باڵه کایه تی غیّراقه، که من خوّم (مه لا عه زیز) له کاتی هه ڵ سوڕانه کانی له چه ن ساڵ له مه وبه ر[۳] دیومه، دیار، ماموّستا مه لا که ریم، له باسنه ی ئالانی لای مه رویێ ماوه تیشا به هه له چوّوه و، لای وایه، ئه سنای ولاّتی میصره و، ئه لّێ ابنُ الحاجَ له ئه سنای مصیر ها توّته دونیاوه، (ده رس خوێنه کانی ماموّستاوه لزی)

۱ ـ ماموستا مه لاعه لی وه ڵزی کوّری خوّی که له ساڵی ۱۳۱۰ ی کوّچی مانگیدا له ئاوایی په سوێ دێته جیهان و، له ره شه مه ی ساڵێ ۱۳۵۲ کوّچی هه تاویدا کوّچی داوایی ئه کا، ماموّستای ناوبراو، هه رله خزمه ت باوکی له ئاوایی تورجان ئیذنی مه لایه تی وه رده گرێ، به ڕاستی وه ک، له به را باسم کرد، ئه وانیش وه ک، باوکی خوالێ خوشبویان، له زانستی فه له کیّاتا. که م وێنه بون.

(۲) ماموّستا سه یدحوسینی طاهیربووغه یی که ماوه یه ک، له ناچیت، و، سه ردارئاباد، پاشان باغلوّجه خه ریکی ده رس گوتنه وه نه بێ و، له زانستی مه نطیق و، به یان وفه رایض به تایه به تی و، زانسته

---

۳ ـ له ده ورده می ڕاپه رینی پێشه وا بارزانیدا.

کانی تر بە گشتی بێ وێنە بون،

(٣) مامۆستا مەلا سەید کەریمی واژەیی. مامۆستاو، دەرس ویژەوەی ئاوایی باغچەی یەڵتەیمورو، قەرە گوێز. کە ئەم ذاتەش سەرەرای خواناسی و پیرۆزی مامۆستایەکی زۆر خاوەن زانست بوەو، دەگەڵ مامۆستا طایەر بوغەیی دا لەخزمەت شێخ عومەری قەرەداغی ئیذنی مەلایەتی وەردە گرن.

(٤) حاجی بابا شێخی تورجان، دەگەڵ ئەوەشا بە هۆی دەسەلاَتو، سامانەوە زۆر نە پەرژاوە تەسەر. دەرس گوتنەوە بەلاَم پیاوێکی زیرەک و، زانا بۆە بە تایەبەت لەزانستی فەلەکیاتی کۆ ندا.

(٥) مامۆستا شێخ مەلا حەسەنی شێخ لەر. کە بە راستی پیاویکی یە کجار دورە پە رێزو، خواناس و، باش بوو. لەزانستە ئابینیە کا نیشابە تایەت فیقها، زۆرئا گادار بوو، خودا لە هەمولایە کیان و، لە ئیمەش خۆش بی،

(٦) مامۆستا مەلا عەلی بوغدەکەندی کەئیستا هەرلەو ئاوایە دا. خەریکی خوا، پەرستی.و، ڕێنوینی خەڵکی ناوچە.یە، بەلاَم بە داخەوە، وەک ئەڵێن لەتوانا کەو توۆە هێزی دەرس گوتنەوەی نەماوە. پێویستە ئەوەش بڵێن ماموستا وەلزی ئۆ گرو، مزیدی شێخ عومەر، ضیائەدین بوۆەو، لەم ڕێگەیەشدا، زۆرسەر، کەوتوو، پایە بە رز بوۆە (شیخ ئەحمەدو، مەولانا خالید)

وەک ڕامان گەیاند قاضی شنۆ مامۆستا خضری نوسیوێتی ئەحمەدی کوڕ، لەڕەوشی خواناسیدا، لەسەر، ڕەچەی مەولانا بوۆە، بەلاَم بەڵگەیەکی بۆ هاو چەرخی ئەوان و، مەبەستە کە نە هێناوە تەوە، وا ئیمە بە پێی تواناو، لیک دانەوەی ساڵی وەفاتی مەولانا و، مێژولکەی سەردەمی ژیانی ئەحمەدی کوڕ بە گوێرەی، لیک

دانەوەی هینّدێک لە هەڵبەستە کانی بە حیسابی ئەبجەد. بابەتە کەڕون، دە کەینەوە.

گوتمان بە پێی هەڵبەستی شێخ عوبەیدیلاّی شەمزینی کوڕی سەید طەهای نەهری کە سەید طەها خۆی یەکێک بوّوە لە خەلیفە کانی مەولاناو، هەروەها، نوسراوەی ماموّستا عەلائەدین سەجادی و، ماموّستا مەلا کەریم. مەولانا لە سالی ١١٩٢ دا، لەقەرەداغی شارەزورهاتوّتە دیناوەو، لە ساڵی ١٢٤٢ شا لە شام کوّچی دوایی کردوّوە، شێخ ئەحمەدیش بە لیێک دانەوەی ئەم هەڵبەستەی خوّی.

در ذج وکج تا، نەج و، سج، ڕۆژگارت بردەسەر، رونە ٧ ساڵ

(١٢٤٩) بەر لە وەفاتی مەولانا خالید، ئەم پارچە هەڵبەستەی هۆنیـوەتەوەو، هۆنـەرێکـی بـەدەسەلاّت و. کـارا مـەبـوّوە·دیـارە تەمەنیشی نزیکەسی ساڵ بوّوە چونکو ئەحمەدی کوڕ ئەگەرتە مەنی ١٠٥ ساڵ بوو بێ و، لەساڵی ١٣٠٥ داوەفاتی کردبێ[1]. دەبێ لەساڵی ١٢٠٠ کوّچی مانگیدا، هات بێتە دیناوە·ئەمەلەلایە کەوە، لە، لایەکی تریشەوەڕای یە کەم. کاتێ ئەحمەدی کوّر ئەچێتە سولەیمانی و، لەوێشەوە، بە رەو بە غدا، ئە کەوێتە ڕێ. مەولاناش لە ویوّە لە سالی ١٢٣٨ دا، دەڕواتە شام، دە کرێ ئەحمەدی کوڕهەرلە وساڵەدا. لە بە غدا، بە خزمەت مەولانا گەیشبێ. یان لەساڵی ١٢٤١ دا، کەسەر لەنوێ مەولانا لەشا مەوە دە چێتە زیارەتی ماڵی خوداو، لە ساڵی ١٢٤٢ شا. ئەگەڕێتەوە، چوبێتە خزمەت ئەم ذاتەو، توّبەی لەسەر دەستی کردبێ، دەش گونجێ. ئەگەر بێتوو، بە خزمەت مەولانا، نەگەیشتبێ و، وەک دەرمان خست هاوچەرخی ئەوانیش

1. دیارە کاک ئەحمەدی سولەیمانیش هەر لەوساڵەدا، وەفاتی کردوّوە، کە،لە پیشەوەدا، گوتمان:

بووە شێخ عەبدوڵای هەڕەوی کە لە ساڵی ١٢٣٦ دا، لە سولەیمانی بووە جێ نشینی مەولانا، دیبێ و، بە لای ئەوەوە ڕێ و، شوێنی خوا پەرستی تایبەتی ئەقشبەندی وەر گریتێ. ئەمەدە کرێ ببێتە بەڵگەی ئەوە، کە شێخ ئەحمەد ئۆ گرو، مریدی مەولانا بووە، بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە، کاتێ ئەحمەدی کوێر. بۆ جاری دووهەم، لە دەس هێندێک دەروێش و، صۆفی ئە خویندەوارو، مامۆستای ساویلکەو، دەرەبەگی مل هوڕی ناوچەی موکری بۆ کان. تەر کە وڵات دەبێ و، ئەگەڕێتەوە سولەیمانی و، دەچێتە مزگەوت و، خانەقای مەولانا خالید، هێندێک مامۆستای ڕووا ڵەتی و، ویشکە.

تەبیاتی ئەوێش بە، بیانوی لەدەرس خوێندن کردنی فەقێ، کە گۆیا، هەڵبەستەکانی شێخ ئەحمەد. بۆتە هوێ پشت لەدەرس و، موتالاّ کردن و، خەریک ئە بونی خوێنکارەکان و، وەشوێن ئەکەوتن و، درێژەئەدان بە قال و، قیلی ئەخفەش و، کەسائی و، سێبەوەیهی، یان گێڕەو، کێشەی، ئەشعەری و، ماتوریدی و، موعتەزیلی و، شەڕەکوتەکی زەیدو، عەمر[1] لیێوە خۆو، کەوتن و، بە پشتیوانی ئەیارەکانی مەولانا و، و، لایەنگرانی خوالی خوشبوو، شێخ مەعروفی نۆدێی و، فتوای. مامۆستا مەلا موحەممەی باڵەکی

١. پێویستە ئەمەش بێژێن هەرلەو ساوە تائەم چەن ساڵەی بەرو، تاقمی فەقێ، لەهەموو، ناوچە کوردنشنەکانی وڵاتیا، لە گشت کومەڵ و، دەستەکانی خەڵکی تر، ڕوشنتر، ئازاو، بوێرو، بەهەستتر بوون، چاک و، خەراپ، چەوت و، راست. ڕێگای بێ کەندو کۆسب. پیاوخاش و، بۆرە پیاو، زۆر لێ کراو، ماف پێ شێل کراوی گەل و، ڕێ و شوێنی سەر کەوتن و، بەربەرەکانی دەگەل ماف خۆرو، مژی مژەکان و، کاتی راپەرینیان، باشتر ئەزانی، خۆیی و، کوری گەلەکەیان بون، پاقژ و، بی فێڵ و، تەڵەکە بون. جێگەی هیواو، باوەڕبون. پەری سەرعەردی خوا بوون و، زۆربەیان لەناوی شەوی پارێزیان دە کرد خەڵک وەشوێنیان ئەکەوتن. تەنانەت زۆر کەس لە رامیارو، هەڵسواروەکانیش بۆنەوەی خەڵک نامۆیان لێ نەکەن. ناوی فەقیان لە خویان دەناوەک. مەلاعەزیز. مەلا رەحیم و، تر..... دیارە شێخ ئەحمەدیش زۆرشتی سەبارەت بە فڕو، فێڵ و، داوی بەڕواڵەت ئاپینی بۆنەم تاقمە ڕوشنە بیرە لە هەڵبەستەکانیا خستوتە روو، هەڵبەت ئەوانیش کەوتنە شوێنی و، رێزیان لێ ناوە



**(١٨٨٢-١٩٣٥) مامۆستا شێخ عومه ر ، قه ره داغی**

زانای هه ڵکه وتوی عاله می ئیسلامه تی و، مامۆستای بلیمه تی کورد،سه یدحوسین طاهیربوغه یی
(١٣٢٣-١٢٧٢) ش مه لا سیه ید که ریم ، واژه یی ( ١٣٢٩-١٢٦٢) ش . مه لا یه حیای بانه یی
(١٣٦١-١٣١٣) ه- ق حاجی مه لا موحه مه دزه ئیس د( ١٣٩٩-١٣٢١) ه-ق

لەدژی مەولانا. ئەم کوێرە بێ دەسەڵات و، بە هەست و، خوست و، خواناسەیان، لەوێش وەتەنگ هەڵ هێناو، پەرەوازەو، لانەوازتریان کردو، تا پۆی زەندەقەو، لەڕێ لادراوو، هەتڵە بوونیان، بۆبە دیوارەکانی مز گەوت و، حوجرەکانی سولەیمانیۆەدا، سەرەڕای سوتاندن و، لەناو، بردنی زۆربەی هەڵبەستە ناسک و، پڕ لە سۆزو، دلڕفێنەکانی کە زۆر دەلاقەی مز گەوت و، حوجرە پڕ لە فەقێنکانی سولەیمانی. داگربتوو، خۆشیان لە وێ دەرکرد، ئەوەبو و ئەم ذاتە دڵڕونە ڕوی کردە شاری کوێ، پەنای بردە بە ربنە ماڵەی جەلیزادە. دیارە مامۆستا جەلیزادەش وەک باسمان کرد، سەرەڕای ئەوەی، ئۆ گرو، پێ‌ڕەوی ڕێگەی مەولاناو، نەقشبەندی بوۆە بە هۆی هاواڵ فەقیەتی دەگەڵ شێخ عەلی طالەبانی کەرکوک و، کاک ئەحمەدی سولەیمانی و، نیۆان خۆشی لەتەک ئەم دو، ذاتە پیرۆزەدا. کە هەر کیان پیرەوی قادری (عبدالقادر گیلانی) بون و، هەرسێکیان بە لای حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی جەلیزادە وە دەرسیان خوێند بوو، دەگەڵ ئەوەشا وەک گوترا، شێخ ئەحمەد پتر، لە دەس مامۆستاو، لایەنگرەکانی قادری، جارز، و، دەربە دەربو، بوو، توانیان ماوەیەک شێخ ئەحمەد لە (کۆ) بهێڵنەوە،بە لام دیسان شێخ لەوێش لەدەس ویشکە صۆفی و، زڕە دەروێش و. شێخی داتا شراوو، نەخوێنداەوارو، بەگی زۆردار. هەڵی نە کردو، وەک حاجی قادری ڕەبەنە ماڵ. لانەوازیان کردو، بەرەو، خانەقای شێخانی شەمزین کە خەلیفەو، جێ‌نشینی مەولانا خالید بون کەوتەڕێ و، تا ئاخرو، ئۆخری ژیانی لەوێ مایەوە. پاشی چەن ساڵێک تاسەی ولات و، ماڵ و، منداڵ و، زێدەکەی و،نزاوپاڕانەوەی عەبدولای کوڕی و، ئالۆزانی باری نەهری و، ڕاپەرینی شێخ عوبەیدلاو، دورخستنەوەیان بۆ طائفی حیجاز، نەگەڕێتەوە

عه مبارو، له وێ بۆ هه میشه سه ر، ده نێته وه. کاتێ ئه حمه دی کۆر ئه چێته شاری کۆو، ئه شێ ته مه نی جه لیزاده سی و، چه ن ساڵێک بو بێ و، چوونه که شی له ساڵی ۱۲۸۰ دا، ڕوی دابێ و، له ساڵی ۱۲۸۱ دا، له و ێوه چوبێته نه هری. چونکو جه لیزاده له ساڵی ۱۲۵۰ دا، له دایک بوۆوه له ساڵی ۱۲۷۰ شا، ده گه ڵ حاجی قادر چۆنه ته باڵه کایه تی بۆ خوێندن له ساڵی ۱۲۷۱ دا، حاجی دێته کوردستانی ئێران وجه لیزاده ده گه ڕێته کۆ یه و، ده بێته جێگری باو کی و، کاروباری ده رس گوتنه وه و، ڕێنوێنی خه ڵکی،وه ئه ستو ئه گرێ، وه ک له پێشه وه شدا، باس کرا، پارچه هه ڵبه ستێکی شێخ له شاری که رکوک و، له ساڵی ۱۳۲۱ کۆچی مانگیدا، نو سراوه ته وه واته نزیکه ی سی ساڵ دوای ڕۆویشتنی ئه وان له کۆو، چونیان بۆ نه هری.

(ئاخۆ، شێخ ئه حمه د چاوی به سه یه دطه های شه مزینی که ونوۆه) ؟

وه ک خوالێ خوشبو، شێخ عوبه یدیلاّی کوڕی سه ید طه ها له مه ثنه وێه. فارسێکه یا ئه فه رموێ. کۆچی دوایی ئه م ذاته خواناس و، مه زنه له ساڵی ۱۲٦۹ ی کۆچی مانگیدا ڕوی داوه‌ه والد، ماجد (خومارۆ) مولدش - (نهری) شد هم مسکن و، هم مدفنش - سیّد سادات قطب نامدار - چون ز دنیا شد سوی دارآلقرار - شد (بطغرایی الهی) ۱۲٦۹ در بهشت - هم قضا آ ن لفظ تاریخش نوشت - به گوێره ی ووته ی هێندێک له خزمه کانیان له ساڵی [1] ۱۲۰۰ دا هاتوته دیناوه و، ٦۹ ساڵ ژیاوه که واته ئه وانیش وه ک شێخ ئه حمه د، هه رله ساڵێکاو، هه شت ۸ ساڵ دوای له دایک بونی مه ولانا خالید هاتونه ته دیناوه، ئه مه له لایه که وه، له لایه کی دیشه وه گوتمان ئه حمه دی کوڕ له ساڵی ۱۲٤۹ دا، هۆنه رو، هه ڵبه ست وێژ بووۆه، یانی بیست ۲۰ ساڵ به ر له وه فاتی سه یدطه ها، هه روه ها له

---

۱. واته هه رله و ساله دا، که شێخ ئه حمه دی کورها تۆته دیناوه: سه ید طه هاش ها تۆته دیناوه

سالّی ۱۲۷۰ دا، به پێی هه‌ڵبه‌سته کانی خوی، شاعیرو، ناو دێر بوّوه واته ساڵێک پاش وه‌فاتی سه‌ید طه‌ها. که وا بوو، ده کرێ له نێوان ساڵه کانی ۱۲۲۹ که سه‌ید طه‌ها له به‌غدا، به خزمه‌ت مه‌ولانا ئه گاو، ئه‌بێته خه‌لیفه‌ی مه‌ولانا خالید سه‌ید طه‌های دیبێ یان له‌وساڵه‌وه تا ساڵی ۱۲٦۹ که فه‌وتی تیا ئه کا، و، چه‌ن جارتا ساڵی ۱۲٤۲ واته ساڵی وه‌فاتی مه‌ولانا. ده‌چێته سوله‌یمانی و، به‌غداو، شام، ئه‌حمه‌دی کوڕ، سه‌ید طه‌های بینیبێ و، هه‌رنه‌ویه کترناسینه‌ش بوو، بێته‌هۆی چونی شێخ ئه‌حمه‌د بۆ ئه‌هری، دیاره (موحه‌مه‌دشا)ی قاجاریش که له ساڵی کانی ۱۲٤٦ تا ۱۲٥۰ دا، ژیاوه‌و. دایکی (عه‌بّاس میرزا)ی کوڕیشی له‌بنه ماڵه‌ی شه‌مزینی بوّوه، له‌زه‌مانی سه‌ید طه‌ها و شێخ ئه‌حمه‌دا، بوّوه، زوّر ئوّگرو، ڕێز لێ گری خوالێ خوشبو سه‌ید طه‌ها بوّوه·چه‌ن ئاواییشی ده گه ڵسالآنه ۵۰۰ تمه‌ن بۆ خه‌رج و، به‌ڕێوه بردنی خانه‌قا. بۆ ته‌رخان ده کا، ئه‌م ئاوایانه‌و، گونده کانی تری سه‌ید طه‌ها، تا ساڵی ۱۲٥۱ کوّچی هه‌تاوی له پیتاک و، مزه‌ی میری، ده‌پارێز رین و، دوای موحه‌مه‌د شا زوّریان بۆ ئاوایه کان هێناو، داوای پیتاکی ئه‌م چه‌ن ساڵه یان لێ کردن و، لێره‌ڕا، شه‌ڕ ده گه‌ڵ حوکومه‌تی کاتی ده‌ستی پێکرد. به‌ڵام بێ گومان وه‌ک خودی شێخ عوبه‌یدیلاّ، سه‌باره‌ت به ساڵی له دایک بونی‌خوّی‌ئه‌ڵێ‌،له،ساڵی ۱۲٤۳ دا، هات بیّته دیناوه (تولدّ من . شێخ عوبه‌ی دیلاّ)

گشت تاریخ ولادم الـغریب (۱۲٤۳)
لا عَجب مِنَ الفقرانْ بَنغریبْ

واته له ساڵی ۱۲٤۳. دا، هاتومه ته‌دنیاوه‌و، زوّرسه‌یر وسه‌مه‌ره‌ش نییه ئه گه‌ر له ساڵی ۱۳۲۳ شا ئاواره بم‌و، فه‌وت بکه‌م

دیاره لەساڵی ١٢٩٨ دا بە دەس سوڵتان عبدالحمیدخانی تورک ئاواره دەکرێ و، لە ساڵی ١٣٠٠ ی کۆچی مانگیشا لە[1] طائف وەفات ئەکاوڕە نگە ئەم هەڵبەستەی حاجیش پتر، سەبارەت بەم کارە، نالەبارەی عبدالحمید بێ کە ئەڵێ.

**ئەمە، کەر، میزە دەڵێن وارثی شەرعی نەبەوین**

**هەموو ،عەبدی صەنەمن،باسی مەکە،گەورەکەیان (واتەعبدالحمید)**

دەکرێ شێخ ئەحمەد کە لە ساڵی ١٢٧٠ دا، شاعیرێکی ناودار بوو، ئەوساکە شێخ عوبەی دیلاّش ١٧ ساڵانە، تا ساڵی وەفاتیان کە ئەحمەدی کوّر لە ١٣٠٥ و شێخ عوبەیدیلاّش لە ١٣٠٠ کۆچی دواییان کردووە، چاویان پێک کەوتبێ، بە گۆیرەی گو تراوەی ڕا بوردو کە گوتمان ئەحمەدی کوّر لە ساڵی ١٢٨٠،دا، چوّتە، نەهری ئەو ساکەتە مەنی شێخ عوبەیدیلاّ نزیکی چل ساڵ بو وّەو، تا ساڵی دور خستنەوەیان بۆ حیجاز (١٢٩٨) دەکرێ چەن جاریە کتریان بینیبێ و، ئەحمەدی کور، هەرلە نەهری ما بێتەوە، بە لاّم پاش گرتن و، دور خستنەوەی شێخ و، گۆرانی باری ولاّت و، خانەقای شەمزین، وەک، ڕامان گەیاند ئەحمەدی کۆریش هێلانەی لێ تێک ئەچێ و، بەرەو، موکریان دەگەڕێتەوە، ئەمەش لە بیر نەکەین (شێخ عبدالقادر) کوڕی شێخ عوبەی دیلاّ. دوای تێ شکانی شورەشەکەیان. لەتەک باوکیا دور ئەخرێنەوەو، پاش وەفاتی بابی دەگەڕێتەوە تورکیاو، دەبێتە نوینەری پارلمانی ئەوێ. پاشان دەگەڵ (سەید موحەمەّدی) کوڕیدا، بەدەس خوێنڕێژەکانی عوثمانی لە قەنارە ئەدرێن و، گیانی پاکیان بە گیان

[1]. وەک خوالی خوشبو، حاجی عبدالرحیم وەفایی لە دەستوسێکا نووسیوّتیی، شێخ عوبەیدیلاّ و شێخ صەدیق و، خیزانی شیخ لەماوەی ٢٤ کات ژمێرد' بە ئازاره باریکه (وەبا) فەوت دەکەن و هەرسێکیان لەسەر وەصیەتی شێخ لە گۆڕستانی موعەلاّی مەکەدا بە خاک دەسپێرین:

ئافەرین تەسلیم دە کەنەوە (هەڵبەت من، کارەساتە کەم لەناو شەپۆڕ نامەی کاک،واتە مەلانەمجەدی عوثمانی دا بە هەڵبەست هێناوە) (١٣٤٦)

**غەوثی ثانی کێ بوو، عبدالقادری گێلاّنی کۆیندەری یە؟**

وەک باسیتیل نیکیتین لە کتێی کوردو، کوردستانا. ئەڵێ، عەبدولقادری گێلاّنی دامەزرێنەری ڕچەی خواناسی قادری کەئێستا (١٩١٥ ـ ١٩١٨) لە ناو هۆزە کوردەکانا زۆر بەڕێزو، ڕێگەی کەی فرە بەبرە وەبڕەنگە هەربە و هۆیەوە بێ چونکو خودی شێخ عبدالقادر کوردە. شێخانی نەهریش ڕەگەزیان هەردە چێتەوە سەرعەبدولقادری گێلاّنی،وادیارە، کوڕێکی بە ناوی عبدالعزیز بۆ ڕێنوێنی و،ڕاگەیاند نی ڕێگای قادری چۆ تە (ئا کریێو، ئامێد) یان ئا کریی لای شاری (ڕەواندز) کە ئێستاش گڵکۆ کەی لە وێ جێگای ڕێزی خەڵکیناوچەیە (دیارە ئەم بیروڕایەی نیکتین لەلایەن کۆڕی زانستی بۆ نیسکۆشەوە، وەر گیراوە کە لە لاپەڕەی ٦٠٥ ی بەرگی یەکەمی گۆڤاری ایرانشەهردا، چاپی ساڵی ١٣٤٢ ی کۆچی هەتاوی. لەتاران لەژمیرەی ٢٢دا، نو سراوە،ڕچەی قادری. ئەدرێتە پاڵ شێخ عەبدولقادر موحیەدّین، کوڕی صاڵحی خەڵکی گیلاّن یان جێلانی سەربە کرماشان کە لە ساڵی ٤٧١ ی کۆچی مانگیا، هاتۆتە دیناوەو، لە ساڵی ٥٦٠ شا، وەفاتی کردۆوەو، لە شاری بەغدا، بە خاک سپێراوە،ئەم تا قمەواتە کۆمەڵی قادری لەتەواوی ولاّتە إسلامیّەکا نا، هەن، لەزۆربەی شارو، شارو لکە زۆر ئاوایەکانیشا هەروەک ڕۆژ هەلاّتەکان بارەگای زۆر گەورەو، ڕازاوە بە ناوی شێخ عبدالقادری گێلاّنی بنیات نراوە، هەڵبەت ئەم

راسته قانیّیه بو هه‌مو تۆ ژه‌ره وه یه‌ک ڕون بۆ ته‌وه که ئه‌م ذاته پیرۆزه کورده‌و، خه‌ڵکی گێلانی کرماشانه، ته‌نیا دوکتور (موعین) و، چه‌ن که سێکی تر، که‌له لانی مێژو نا سێوه زۆریان حیساب له‌سه‌ر نا کرێ،گو تویانه خه‌ڵکی صۆمیعه سه‌رای ڕه‌شت و، خه‌ڵکی گێلانی با کوری ئێرانه، هێندێک، له نووسه‌ره، کورده کانیش ئه‌م ڕچه هه‌ڵه‌یان گر توۆه‌و، وه‌ک چه قه‌پێوه‌ی نوساون؛ دیاره خاوه‌نی کتێبی جامیعی ئه‌دیانیش هه‌رله سه‌ربیرو باوه‌ڕی باستیل و، ئه‌وانن، که خه‌ڵکی گێلانی کرماشان و، کورده)

کوڕێکی شێخ عبدالعزیز به ناوی شێخ ئه‌بوبه‌کر، ده‌چێته ناوچه‌ی هه‌رکی و، له ئاوایی ستوانه‌دا، نیشته جێ ئه‌بێ. شێخ حه‌یده‌ر. کوڕی شێخ ئه بو به کرو، سی، چوار پشتی دوای ئه‌ویش هه‌رله‌وێ ئه‌مێنیته‌وه له‌و ساوه تازه‌مانی مه‌لا حاجی ئه‌م بنه ما ڵه‌یه له ئاوایی مه‌لاعه‌یانی سه‌ر، به‌ناوچه‌ی (خومارۆ) دا، ماو نه‌وه، پاشان ده‌چنه ئاوایی (دۆمانه) تا زه‌مانی مه‌لا صالح که، کوڕه کانی ئه‌وان، ڕێگه‌ی قادری جێ دێڵن و، ده که‌ونه سه‌ر. ڕچه‌و، شوێنی نه‌قشبه‌ندی. دێنه ئاوایی (نه هری) ناوه‌ندی به‌شی، (شه‌مزین) به گوێره‌ی. ئه‌و، پشت برنه‌وه سه‌ریه که‌ی باستیل که له زه‌مانی مه‌لا صالحه وه، هاتوه‌، یه کێک له کوڕه کانی مه‌لا صاله ناوی (سه‌ید عه‌بدولاّ) بوۆه، سه‌ید (طه‌ها)ی شه‌مزینی کوڕی ئه‌م ذاته بوۆه. شێخ عوبه‌یدیلاّ کوڕی سه‌ید طه‌هاو، شێخ عه‌بدولقادریش کوڕی شێخ عوبه‌یدیلاّ، بوۆه.شیخ عه‌بدولقادر. به ناو، با پیره گه‌وره‌یه‌وه ناوئه‌نرێ و، له‌قه‌بی غه‌وثی ثانی پێ ئه‌درێ چونکو پیری گه‌یلانی (غه‌وثی یه‌که‌م) بوۆه (دو هه‌م) دراوه به شێخ عبدالقادری شه‌مزینی وه‌ک له‌زنجیره‌ی پشت به پشتی ئه‌م بنه ماڵه دا، ها توۆه‌و، من (داشبه‌ندی) تائیستا پێم‌زانیوه، هه‌رله عبدالقادری گێلا نیوه تا



**غه وثی ثانی ،شه هیدی ڕێگه ی خوداو ،که ل شێخ عبدالقادر ، شه‌مزینی**

له ،ڕۆژنی ۲۴ی مانگی مارتي سالێ ۱۳۴۲ ی ه – ق ، دا، له گه لێ دوکتور ، فوئادو سه‌ید موحه مه دی کوڕی و، هاواڵه کانیان . به فرمانی که ماڵ پاشای تورک ،له قه ناره ،دران

ڕۆژی تاریحی له بیست و، چواری مارتاواقیعه
ڕۆژی ماته م ، روژی قوزپێوانی کولێ میله ته
(صاحه‌بقران )
به ر، به سێ داره ،ذلت ،ژانه چه نێ
بۆ ،وه ته ن بمره ،ژیانت ئه ده نێ
هه ژار
ئه و خۆنیه‌ناڵه، خونچه ی گه ش دینێ
مێژو ، بولبوله ، دێ لێی ، ده خوێنێ
تۆڵه ئه ستین

زه‌مانی شێخ عبدالقادر هیچ عه‌بدولقادرێکی که‌یان نه‌ بۆوه‌ ئه‌مه‌له‌ لایه‌ که‌وه‌. له‌لایه‌ کی تریشه‌ زۆر به‌ی هۆنه‌ره‌ کورده‌ کانی موکریان له‌ هه‌لبه‌سته‌ کانی خۆیاندا. شێخ عبدالقادریان به‌ ناوی غه‌وثی ثانی ناو بردۆوه‌؛ وه‌ک وه‌فایی و، مه‌لا صالحی حه‌ریق و ئه‌وانی تر، که‌ وا، بوو. وه‌ک له‌ پێشه‌وه‌ شدا، گوتمان له‌قه‌بی غه‌وثی ثانی هی شێخ عه‌بدولقادری کوڕی شێخ عوبه‌یدیلاّ یه‌و، ناکرێ هی شێخ عه‌لی که‌رکوک بێ و ناشکرێ شێخ عبدالقادر، چاویان به‌. مه‌ولانا خالید که‌و تبێ چونکو ته‌مه‌نی شێخ عوبه‌یدیلاّی باو کی له‌ته‌ک زه‌مانی مه‌ولانادا، نایه‌ته‌وه‌. چی بگا به‌ زه‌مانی ژیانی شێخ عبدالقادر، که‌ چه‌ن ساڵ دوای وه‌فاتی مه‌ولانا هاتۆته‌ دیناوه‌؛ که‌واته‌ وه‌ک رامان گه‌یاند. نوسراوه‌ که‌ی بابا مه‌ردۆخ سه‌باره‌ت به‌ چاوپێکه‌وتنی مه‌ولانا و شێخ عبدالقادر یه‌ک نا گرنه‌وه‌، نیکتین، له‌ نوسراوه‌ که‌یا ئه‌وه‌شمان، بۆ، ڕون ئه‌ کا ته‌وه‌. که‌ سه‌ید عه‌بدولاّی باوکی سه‌ید طه‌ها و، مه‌ولانا دۆست و، نا سیاوی کۆنی یه‌کتر بوون و، له‌ که‌یه‌وه‌، بنه‌ ماڵه‌ی نه‌هری ڕه‌ووشی با پیره‌ گه‌وره‌ی خۆیان واته‌ عبدالقادری گیلاّنی به‌ر داوه‌و، چوونه‌ سه‌ر، ڕه‌وه‌ندو، ڕێبازی نه‌قشبه‌ندی. ئه‌لێ. وه‌ک من له‌ مامۆستاو، ڕێنوێنی کوردی خۆم مه‌لا[1] سه‌عید که‌یه‌ کێک بوو، له‌ مریده‌ کانی سه‌ید طه‌ها، بیست. کاتێ مه‌ولانا خالید ئه‌یه‌وێ بچێته‌ لای شا عه‌بدولاّی ده‌ هله‌وی، له‌به‌را، دێته‌ لای سه‌ید عبداللّه‌ی نه‌هری و، پرسی پێ ده‌کاو، کاره‌ ساته‌ که‌ی بۆ ده‌ گێر ێته‌وه‌؛ ئه‌میش له‌ئا کامی ووتو وێژه‌ که‌دا. ئه‌لێ. ئه‌ گه‌ر هه‌ر سوری له‌سه‌ر چون. منیش دێم. پاش گه‌ڕانه‌وه‌یان. سه‌ید عه‌بدولاّ، ڕێ و، شوێنی قادری وه‌لا،

---

١. وا دیاره‌ ئه‌م مه‌لا سه‌عیده‌ باو کی فه‌قی عبدالرّحمن سه‌عید فه‌رمانده‌ری هێزی چه‌ک. هه‌ڵگری شێخ عبدالسلام بارزانی بو بێ که‌من له‌ ناداب و ڕوسومی کوردا باسم کردون.

دەنێ و، ڕێگەی نەقشبەندی دەگرێتە بەر. لەو ساوە، تا زەمانی خوا لێ خوشبو حاجی سەیدعەبدولاّ ئەفەندی دانیشتوی دزەی ناوچەی مەرگەوەڕ. هەر لەسەرئەم ڕێگەیە بون: دیارە ئەم ذاتە پیرۆزە هیچکاتێک، خۆی بە شێخ و، خەلیفە، دا، نەدەنا، بەلاّم ماڵی ئەوان هەمیشە پەناو پەسیوی ژارو، لێ قەوماو، ڕە بە نەماڵی هەموو چین و، تۆو، تۆرەمەیەک بوو:

## من و، شێخ ئەحمەد

ئەوەی راست بێ ئەوەیە. تا ساڵی ١٣٢٩ ی کۆچی هەتاوی کە بنەماڵەی ئێمە لە(قەرەگۆلی) ناوچەی چۆمی مەجید خانەوە،هاتە (داشبەندی) بۆ کان و، دیارەئەوسا کە منا لێکی دە ساڵانە بوم و، تازە قوڕئان و، پێشەکی گولستانی سەعدی و، چەن و وردە کتێب و، نامیلکەم خوێند بوو،ناوی ئەحمەدی کوڕم بە تیتوش نە بیستبوو، بەلاّم هەرئەو ساڵە. ڕۆژی جێژنی قوربان، دەگەڵ سێ چوار کەس، لە هاواڵە قوتا بێکانم. لەداشبەندەوە چوینەسەر گڵکۆو، گونبەذی شێخ ئەحمەد لەئاوایی (عەمبار) (هەڵبەت لە چاخی منالی ئێمەدا. باو، بوو، ڕۆژانی جێژنی رەمەضان و، قوربان، مەولودو، نەورۆز کوڕو، کاڵ و، کیژو، لاوە دلتەرەکان دەچونە سەرشەخص[1] و، زیارەتی پیاو، چاکەکانی ناوچە) گونبەذێکی قوڕینەو، زۆر ساکارو، بچووک بوو، دەرگایەکی چەپەرو، کۆنی لەلای ژۆر هەڵاتەوە، وێخرابوو،بە گوێرەی یاسای منالان چوینە ژورەوە،بەردە کیلەکانمان، ڕامووسی. زۆر نوسراوەو، کتێبی چاپی و، دەسنوسی

---

[1]. ئەم باسەم لەژێر سەردیری (چوونی سەرچاک و پیران) دا، بە هەڵبەت لە کتێبی (آداب و، رسوم کردان) دا هێناوە

جۆرا و، جۆر لە قولکەی سەر گۆزە کە، و، دەلاقەو، تاقەی لای باشوری، لەسەر یە ک، کە لە کە، کرابوون، زۆریان، لێ وورد، بو مەوە بە لام چیان لێ تێ نە گەیشتم و، هەژێیەم، لەبڕێ نە کردنەوە، پاش ئەوسا لە چەن ڕایەکی تریش، وێڕای خەلک ئەمنیش. دە چوو مەسەر گلکۆی ئەم ذاتە پیرۆزە،تا لە سالە کانی ١٣٣١ و، ١٣٣٢ دا چو و مەناو فەقیان و، هێندێک هۆش و، بیری منالیم زرینگایەوەو، ئیتر زۆر گویم بەم جورە شتانە. نەدەداو، لە چونی سەرچاک و، ماک. بە تەوا وی تەرە کەمە بووم. تا سالە کانی ١٣٣٤ و ١٣٣٥ کاتێ دە گەل هەلبەستە کانی مامۆستا نا لی و، حاجی قادرو، جەنابی مەلای کۆدا. ئاشنا بووم و، هەرچی زۆرتریان پێوە خەریک دە بوم کە مترم لێ دەزانین،ئەمەش بێژم لەم دوسێ سالەی دواییشا. دیسان پاشی نزیکەی سیی سال چاوێکی ترم بە دیوانی نالیدا. خشاندو. شەرحە کەی مامۆستا مەلا کەریم و، کوژە کانیشم. دایە. بەرسەرنج و، لەتەک دوسێ نوو سراوەی کۆن و، دەسنو سا، لەبەر یە کم، ڕانان دیتم تیری بیرو، زانستی مامۆستا ش وەک ئێستای من. زۆر جێگای هەلبەستە کانی نالی نەپێکاوە. هێندێکیانم. عەرضی مامۆستا هەژار کرد، فەرموی راست دە کەی وایە. (بە لام بەراستی ادّعای نالی زانین بۆ هەمو کەس عەیبەو، نەزانیشی بۆ کەس عەیب نییە کەواتە.) بە پانەوە دەلێم. مەلە کردن لەدەریای خورۆ شانی زانینی هەلبەستە کانی نالیدا. بۆ ئەوسا کەی من، کە هێشتا فێری پەلەقاژەش نەبوو، بووم تەنانەت بۆ ئێستاشم کە تارادەیەک بە غیرەتی مەلەوا نانی چازانەوە،زات دە کەم. لێی وە نزیک کەو مەوەً کارێکی زۆر سوک و، سان نییە. ئەمە لە لایە کەوە. لەلایە کی تریشەوە کاتێ بە هۆی زۆر خوێند نەوەو، پێدا چونەوەی بە سەر هاتی حاجی و، هەلبەستە کانی و،هەلسەنگاند نی بیرو،

باوەڕی خواناسی (ئەی بێ‌نەظیرو، هەمتا هەرتۆی کەبەر قەراری - بێ، دارو، بێ، دیاری، بیدار و پایەداری....)

و، گەل‌ویستی ئەم ذاتە. زۆرتر مرخم کە وتەسەر. دیوانی حاجی دوایی دیتم. حاجی سەرە ڕای ئەوەی ناوی چەن هۆنەری پایە بەرزی کوردی لەناو، دیوانە کەیا، هێناوە‌لە لێزگە هەڵبەستی شاسواری بەلاغەتی کوردا نیشا نزیکەی ٤٨ کەسی لە گەورە شاعیرانی خوێندەوارو، نەخوێندەواری، خستوتە، ناو، ئەم میلیۆ نکەیەوەو، ناوی ئەحمەدی کوّر یشی کردوّتە، قاشی نیّوان ئەو هۆنراوە پڕ لە دوڕو، مەرجانەی دەریای وێژەو، وێژەوانانی جیهانی هۆزە کەیەوە. تیگەیشتم. ئەحمەدی کوّر، هەرئەو ئەحمەدە کوڕە نیّیە کە ئێمە بە ناوی کوێر ێکی خۆ وێژ و، فڕ هاوێژ. ئەویش لەهەر ێمێکی چوکی ناوچەی موکری لای بوکان‌دا، ئەی ناسین‌بەڵکو، ئەم ذاتە بە فەرمودەی حاجی،کوێرێک بوۆە، توانیوێتی بچێتە مەیدانی جلیت بازی شاسوارێکی وەک موصطەفابەگی (کوردی)و، دەگەل شێخ ئەحمەدی (خانی) جزیری.... و تەنانەت مامۆستا نالی،دا. ئەسبی طەبعی خۆی‌و، بیرو، باوەڕی خوا. ناسی ڕاستە قانی. لینگ داو، بگاتە قەلەمندارەی گیسکە، کوڕانە بردنەوەو، دروشمی مەثنەوی کوردی (ئەوانە هەموو شاعیری غەڕانن. هەروەکو، مەثنەوین لەنێو کودان)لەدەس ئەخصێکی وەک حاجی وەرگرێ. بەلەتە هەڵبەستێکی داخی دە رون‌و، تاسەی ئەوین، وە جۆش بێنێ‌و، لەش‌و، ئیشقانی مرۆڤ بسووتێنێ‌و، لەڕێگەی خواناسیدا، قاڵ کاو، بتا وێنیتەوە بە کوتە کەی تریشی. گیانی لە بەندی لەش ڕزگار بوو، بخاتە باغی بە هەشتی خواناسی ڕاستە قانی‌و، بە ئاوات گەیشتن و، بۆ هەتا هەتا یە بی، حەسێنێتەوە (ئەحمەدی کور لە شاری سابلاغە: بە یتە کی

باغه، بەیتە کی داغە)

جانەوە بوو، من هەرلەزەمانی فەقێیە تیۆە،کەو تمەشوێن هەواڵ و، بە سەرهات و، کۆ کردنە وەی هەڵبەستە کانی ئەم ڕۆشنە دڵ و، بیر، ڕوناکە و، تائیێستاش کارە کە، درێژەی هەیە و، ئەمەش بەرهە مە کەیەتی وا، لە چەن لاپە ڕەیە کا دەیخە ینە بە رچاوی ئێوەی خوێنەرە وەی بەڕێز. هیوایە بە پێی توانا کەلکی لیٚوەر گرن، و، بیٚ، خوێننە وە، تا باشتر، ناودارو، هۆنەرە کانتان بنا سن و، بە خەڵکیشیان بنا سێنن:

## تۆ چت لەو کوێرە داوە؟

هەروە ک باسمان کرد. خوا لیٚ خوشبوو، مامۆستا مەلاعەلی وەلزی گەورە مامۆستام (کە سەبارەت بە باری ژیانی شێخ ئەحمەد بەو جۆرە لەباو کیان بیستبوو، گەلێک شارەزایی بە کەلکی کردم. لە کاتی خوێند نیشانەو چەشنەی دە گەڵ مندا. دەجولانەوە. لە گەڵ، هیچ فەقیێ و، موستە عیدێکا ئەوجۆرە، ڕەفتارە یان بەڕیوە، نە برد بوو، منی وە ک کوڕێکی بە ئەمە گی خوێ دا. ئەناو، ڕێزیکی تایە بە تی بومن، دا، دەنا بۆوێنە تا من لەو دیو (عیڕاق) و، مەریوان نە گەڕامەوە وڵات و، نەچوو مە خزمە یتان هەرگیز موستە عیدو، ئاخر مادّە، خوێنێک نەی توانی بوو. بە بیٚ کەوای شۆڕە و، ئاو، دامین و، چا ک بلاوی مەلایە تی. لەخزمە تیدا. بە چۆ کەوە دانیشێ و، دەرس بخوێنیٚ. بە لاٚم من هەربەجل و بەرگی خۆ ماڵی و، کوردیٚوە چوومە ماڵیٚ و، عەرضم کرد، بەم هۆیانەوە من ناتوانم کە وای درێژو، شا قە ل پان بکەمە بەر. فەرموی قەی نا کا. پاشان وای لیٚ هاتبوو لە سەر، ئەم با سەوە،بەدەم دەرەبە گ و،

خەڵکە، کە دا دەهاتەوەو، لایەنگری لێ دە کردم و، بە توندی بە رسف و، وڵامی ئەدانەوە، ئەم کارەی من بوۆە هوێ ئەوە، فەقیێ و، موستە عیدە کانی ترو، تەنانەت ئەوانی دوای ئیمەش هەر لەو، ڕە ووشتە کەلک وەر گرن و، بە، بەر گی جیا واز. خۆیان لە خەڵک جیانە کە نەوە، کاتێ لەزیندان و، بەندیخانەی قزلْقەلعەی تاران ڕزگار بوم، بەرلەوەی بچمەوە ماڵی خۆمان چوومە خزمەتی فەرموی (عبدالعزیز) ئەگەر هەواڵی ئازاد بونتانم زانیبایە، دەگەڵ مەلاو، فەقیێە کان تاشاری مەراغە بە پیرتانەوە دەهاتم. پاشی ئەوەی ماوەیە کیش لەئاوایە چووکە کەی خۆمان، دا واتە (ئاڵی کەند). دەس بەسەربووم، هەر کاتێ فەرما نیێکی دەبوو، وڵامی دەنارد، یان نامە یە کی دە نووسی، بەدەنگیۆە دەچوم و، کارە کەم، بە ڕێوە دەبرد. دیارە منیش خۆم بە کوڕێکی چوکی ئەم ذاتە بەڕێزە دەزانی. و، ئەوانیش وەک باو کیێکی دڵسۆز بون بۆ ئیمە خودا، جەزای بە خیێریان بداتەوە) کاتێ سەبارەت بە شیێخ ئەحمەد پرسیارم لێ کرد، بە پیکەنینەوە فەرموی تۆ، چتلە و کوێرە داوە؟ دیارە باری فەقیێەتی و، کاتی خوێندنی ئیمەی ئەوسا کە، بە تایەبەت لە ناوچە کانی هەریمی مو کریاندا، کەهیمان باوی دەرە بە گایەتی و، بیر،ویشکی زۆر بەی خوێندەوارو، مامۆستا کانیش وەک دێوەزمە بە سەرهەست و، خواستی خەڵکدا، زاڵ بوو، بە چەشنێکی وا، تابۆیان لووا بایە، نەیان دەهیێشت فەقیێ بکە وێتە شوێن ڕون کردنەوەی خەڵک و، کارو باری لێ تۆ ژینەوە و، ساغ کردنەوەی باری ژیانی کەسێکی وەک ئەحمەدی کور، کە وێ. لایان وابوو، فەقیێ دەبێ خەریکی دەرس و، موتاڵای نوسراوە عەرەبیێکان بێ و، دوای تەواو کردنیش. بچیێتەلای دەربە گیێک و، بە گوێرەی بیرو، باوەڕی ئەو بجو لیێتەوە و، ساڵێ جار یێک یان زیاتر

بڕ واته لای شێخی ئاغا. کەوابوو ئەم جۆرە باس و، خوازانە. دە گەڵ. ئەو چەشنە بڕوایانە دا. ڕێک نە دەهاتەوە، منیش عەرضم کرد. ئەحمەدی کوڕ (عەمباری) و، من (داشبەندی) حەقمان بەسەریە کەوە هەیە و، هاو، کە وشەنین، ئەمرۆ من باسی ئەوان دێنمە گوریّ و، سۆزیش کە سێکی تر. لەبارەی منەوە ئەدویّ. کاری دنیا. دەستە وایە و، ئەمەش راستە قانێکە، ئەگەر ئێمە خۆمان لەغەمی خۆمانا. نەبین و، مافی یەکتر نە پارێزین. یەکدی بە خزم و، گەل و، خۆو، نامۆو، لاوەکی نە، ناسێنین، دەردو، ژانی گەل، نەچێژین. پەژارە و، تەنگ و، چەڵەمەی هۆز و، بەسەرها تی گەورەو، ڕا بوردوّ کانمان بە نوسین و، لێکدانەوە. تۆمار نە کەین، کە لە پوری ئایینی و، نەتەوایەتی چەن هەزار ساڵەی گەل، بۆ ساو او، لاوو، گەنجە لە خۆ بیّ هەواڵەکان ڕون نە کەینەوە، بیّ ئاگاو، هەواڵ، لە، کەس و، کارو، گەورە پیاوانی ڕا براو، بیان هێڵینەوە، خۆبە کەم زان و، دژ بە زۆر، زان،خۆنەویست و، بێگانە پەرست، بار، دێن و، رەنگە تا ک و توو کێکیش، گازندە لە ئێمە بکەن و، بماندەنە بەر، تەوس و، پلاری رەخنەوە و، بیژن، بۆچی لە کاتی خۆیا، شنگلیّە کیان لە خۆیان نەداوە و، ئەم جورە بابە تانە یان بۆ ئێمە نە خستۆ تەسەر کاغەذموە،ئەشیّ لەبەرا مبەرشا نازی خەڵکەوە ئەوە یان پیّ بلێن، ئەگەر هۆزی عەرەب، پیاوێکی وەک (عومەری کوڕی عبدالعزیزی) هە بوّوە، ئێمەش. قارەما نێکی وەک (صەلاحەدینی ئەیو بیمان) بوّوە ئەگەر (سەلمان یان سڵەمانی فارسی) لەخزمەت حەضرەتی رەسولاّ بوّوە. ئەمەش (جابان و، مەیمونی کوڕی) ئەوانمان هەبوّوە،هەروەها بە درێژایی مێژو، تا، ئەمرۆ. لەلانی هۆزانی و، بلیمەتی و، خوێندەواری زانا و، نیّودیریش دالێ خەڵکی تر، دووا، نەکەوتوێن. مامۆستاو، چازانی ئاینیشمان لە

دراوسێکان پتر بوۆەو، تا ئیستاش دایکی نیشتیمانە کەمان لەزگ نەوێستاوە تەوە و، ڕەنگە لە مەولاوە ڕۆ ڵەی زۆر، بە هەست و، زانای باشتریش بخاتەوە، کە واتە پێویستە بەسەرها تی. ئەم ذاتە گەورە ئایینیەی وەک ئەحمەدی کوڕیش بەپێی توانا، بۆ خەڵک ڕون کرێتەوە، تا، داها تۆەکان،تووکمان لێنە کەن و، بە تیری توانج، دەس و، پینووسە، کۆڵە کەمان نەپێکن و، بە ووتەی خوّم نەڵین.

زمانت لاڵ دەس و، پێنووسەکەت کوۆڵ
ئەگەر کوردی نەبێژیت و، نەنووسی

هیوادارم خوداوەندیش هەمو لایەکمان بۆ خزمەت بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و، ئەم گەلە بەش خوراوو، چەوسا وەیە کە ساڵانی ساڵە بە هەموو، شتێکەوە کەوتۆ تەبەر هێرشی حەزیای پیرو، مافخۆری إستیعماری جهانیۆەسەرکە و توکا:لام وایە ئەگەر گەل خۆی یەک بێ خواش دەها نای بێ و، بەزەیی پێیدا بێتەوە، بەڵێ، تارێک نەکەون، ڕێو، دە کەون، هەڵبەت ئەم ڕێک کەوتنەش،بە لای خوداوە شتێکی زۆر ئاسایی و، زۆر، هاسانە:

## شێوە و، بابەت و، ناوەڕۆ کی هەڵبەستەکانی شێخ ئەحمەدی کۆر.

هەڵبەستەکانی ئەحمەدی کۆر، لەباری دا، ڕژتن و، تێکوڵ و، ووشەوە،هەر ئەو شێوازەیە کە هۆنەرو، شاعیرە را بوردۆەکانی وەک مەلای جزیری، ئەحمەدی خانی، نالی و، هاو، چەرخەکانی وەک کوردی، سالم بەگ و، حاجی قادری کۆیی، ڕەچاویان کرد بوو[1]، هۆنراوەکانیان بەووشەو، ڕستەی نامۆی ئارەبی. تورکی و،

[1] . دیارە زمانی ئەدەبیی ئەوسا کەمانەمەدرەسەو، قوتابخانەی مامۆستا نالی و، نەوانی تر بووە کە ←

فارسی تەندرا بووە تارو، پۆی هەلبەستیان بەم فرێت و، خاو کە.
هۆنرا بوۆە، دیارە ئەم ڕێچکە یە، لە سەر دەمی چەرخی نۆزدەی زایە
نیۆە (سیزدە هەمی کۆچی مانگی) تا ئەم دووایییانە، پتر لە پیشوو،
برەوو، پەرەی سەند بوو، هۆنەرو و مامۆستاو، نوسەرە کانی سەر
بە مە ڵبەندی فەرمان رەوایی بابان بە گشتی و، ئەردەڵانی سنەش تا
رادە یەک. ببونە قوتابی ئەم قوتابخانە یە. تەنانەت ذاتیێکی وەکوو.
شێخ مەعروفی نۆ دێی تەنیا نامیلکەی ئەحمەدی نە بێ، کە فەرەنگۆ
کە یە کی ئارە بی و، کوردی یە، هەروەها کاک ئەحمەدیخواناس و،
و، کوڕی شێخ مەعروفیش. لەم هەمو هۆنراوەو، پەخشانە کە
نوسیویانە دانە یە کیان کوردی نین بە ڵکوزۆربە یان ئارە بی و،
ئەوانی تریش فارسین، هەڵبەت ڕەچاو کردنی ئەم شێوە نوسینەش
زیاتر بە هۆی ئەوەوە بوۆە، نوسین و، خوێندنەوە، لە ناو چەجوڕ، بە
جۆرە کانی کوردستانی سەر بە میری تورکیاو، ئێران بە زمانی
عارە بی و، فارسی بوۆە، بە تایە بەت وڵاتی بابان و، کوردستانی
ئەوسای سەر بە تورکیەی عوثمانی. زۆربەی کار بە دەست و،
موچە خۆرە کانیان تورک بوون، جا بەم پێیە. شاعیرو، نوسەریش
هەولی داوە،دە سەڵات داریێەتی خۆی بە سەر زمانی ئاییینی واتە
عەرەبی و، زمانی ئا والدۆوانە و، نزیێکی زمانی کوزدی،یانی
فارسی و، زمانی دە سەڵاتدار و، بە زۆر، بە سەرا، سەپاوی تورکیدا،
لە هەڵبەست و، پەخشانا، بنۆینێ و، بخاتە بەرچاوو، تەنانەت بە
تورکیش هەڵبەست بێژن، ئەوە یە شێخ ئەحمەدیش هەرئەو
ڕێگایەی گر توتە بە رو، بە، دە گمەن چاو بە هەڵبەستێکی نا کەوێ
لە باری و وشە وە،بۆنی ناموێ لێ نە یەو، ئەو خەر مانە سورو، جوانە،

---

→ لە هە مونا و چە کانی کوڕمانجی ناوە ندیدا (واتە سوله یمانی، سۆران، مکریان، ئەردەڵان) زمانی
وێژەو، نووسین بوۆە، پاشان لە ١٩٢٢ دا، بۆتە زمانی رەسمی:

دارماڵ و، پڕ، نه کرابێ، له چێودان و، کۆروی، زاراوه ی لاوه کی،
دیاره چه ن هه ڵبه ستێکی تورکی و، عه ره بیش له ناو هه ڵبه سته کا نا
به رچاو ئه که ون، ئه وانی تریش وه ک گوترا، کوردی ئاوێته و،
تێکه ڵا وی فارسی و، ئاڕه وین. کوردیێکه شی ئه وه ی تائیێستا وه ده س
من که و تون. زۆربه یان به زاراوه ی موکر [1] ی واته کوڕمانجی
ناوه ندی، به تایه به ت (بوکان) (مهاباد و، شنۆیه). هه ڵبه ت له زۆرو
و شه دا، زمانی زگ ما کی باو کی یان هی کاتی منالی و، چو کی
خۆشی

واته شنۆ، ئه گه ر بێژین له شیوه سماقی لای شاری (شنۆ):
هاتۆته دیناوه، ده کار هێناوه. هه ربه و جۆره ی له باسی (چه ن
ئه حمه دی کوڕ هه بون) له خزمه ت مامۆستا هه ژاردا، ڕابرا،
ئه حمه دی کۆر هه ڵبه ستی به زاراوه ی کوڕمانجی ژوروش، زۆر
بوۆه، به لام صه د، داخ و، مه خابن. ته نیا چه ن پارچه هه ڵبه ستێک نه
بێ که له نوسراوه که ی کاک صالح مه حمود بارزانی(خوارزای سه [2]
رۆک و، ڕا به ری جولانه وه ی چه ن ساڵه ی گه لی، لێ قه وماوی
کوردستانی عیڕاق له دژی حوکومه ته کانی به زۆر، دا سه پاو، به
تایه به ت به عثی خوێنرێژ و، عه فله قی) دا که، له دو، په ڕاوه ی
جواندا به ناوی (باغچه ی به هارستانی ۱ و ۲) ده سنوسی ساڵه کانی
۱۸ ـ ۱۹ ـ ۱۹۲۰ زایه نی کاتی دور خرانه وه یان ده گه ڵ بنه ماڵه ی
خالوانیدا له (به غدا) هه و لێر (به صره) و، (حیلّه) وه گیرم که وتون
هیچ هه ڵبه ستێکی تری ئه م ذاته م، به زاراوه ی ژورو. ده س نه

---

۱. زاراوه ی موکری به شێکه له چار به شه دیا لێکته که ی کورمانجی ناوه ندی. کورمانجی ژوروش پنج به شه (بۆتانی، هه کاری، بادینانی. بایه زید، ئاشتایی)

۲. مه به ست، پیشه وا، بارزانی یه (مه لا موصطه فا)

کەوتوۆە، هیوایەڕۆژیک. چاومان بەوانیش ڕون بێتەوەو، بیان خەینەپاڵدیوانەکەی.هەڵبەت،لەبەر ،کەمی‌ئەوانیشم‌لیرەدا ،نەهێناوە:

لیێرەدا، سوپاس لەمامۆستا هەژار دەکەم. کە بوۆە، هۆی پێک نا ساندنمان و، وەرگرتنی ئەوپەڕا وانە. سوپاس، بۆ کاک صاڵحیش کە ئەم نرسراوانەی لەوساوە، تائیێستا دەگەڵ ئەم هەمو گیرو، گرفت و، چەق و، تەفەدا،ئاوا، بەجوانی راگر توۆە، دیارە لە هێندیک کەسیش هەرئەوە چاوەڕوان دەکرێ.

(بابەتەکانی هەڵبەستی شێخ ئەحمەد)

هۆنراوەکانی ئەحمەدی کۆر، لەباری کاکڵ و، ناوەرۆ کەوە زۆربەیان، پەسندی خوداو، پیغەمبەری مەزنی ئیسلام و، باسی دوینـاو، جیهانی پەسلان و، خۆبواردن لەکاری بێ ئاکام و، بێ کەلک، دورەپەرێزی لە کردەوەی بێ هودە، گەڕانەوە بۆسەرە خوۆ، ئاوردانەوە لەرا بوردو، بەر، بەرەکانی دەگەڵ نەفس و، ویست و، خواستی خەراوو، شەیطانی، پارانەوە و، نزاکردن. بە واتایەکی تر، ئەوین و، ئەوینداری دەگەڵ ذاتی خوداوەندی میری مەزن و، ڕاسپاردە گەورەکەی ئیسلام، خۆبەخت کردن و، قاڵ بون. لەپێنا وی گەیشتن بە ئاواتی دیتن و، گەیاندنە، سەری ئەویندار یێەتی راستەقانی یە، هەرلەو، ڕێگەشەوە پلاری توانج و، رەخنە داوێتە. کۆلکە مەلاو، زرە دەروێش و، ویشکە صۆفی و، جیا کردنەوەی مامۆستای ڕۆشن بیرو، ڕێ نیشاندەری راستەقینەی ئیسلام و، دەروێش و، صوفی خواناس و، گەل ویست و، دورە پەرێز، کە بە رواڵەت خودایی و، بە نهێنی لەڕێ لادەرو، گزیکارو، خۆ، نەناس و، ماف فرۆشن، دیارە ئەم بیرو، باوەڕە کە لەلایەن، داگیر کەری پیری، فێڵەبازی إنگلیس و، زۆربەی دەرەبەگەکانی ناوچە و، چڵکاو، خورە خۆنەویست و، بێگانەپەرستە، دەرفەت

هێنەرە کان، لایەنگیری لێ نەدە کراو، دە بۆوە هۆی دەربە دەری دەیان کەسی وەک ئەحمەدی کۆر، حاجی قادری کۆیی. ئازارو، ئەشکەنجەی ووتە، و، تەوس و، پلارو، بە ربەرە کانی کردن دە گەڵ صەدان ذات و، خواناس و بلیمەتی بێ وێنەی وەک حاجی مەلاعە وڵای جەلیزادە و، جەنابی مەلای کوژی[1] لەشاری کۆو، جێگا کانی دیکەی وڵات دا، دیارە ئەوەش شتێکی ئاساییە. لەهە موچە رخێکا راست و، چەوت لەبە رامبەر یە کا،وێستاون.

## کێش و، وەزن:

هەڵبە ستە کانی شێخ ئەحمەد، لەلانی کێش و، وەزنەوە، وەک هۆنراوەی هەمو، هۆنەرێکی صەدەی سێزدە هەمی کۆچی مانگی، بگرە. تا، سەرە تای زاڵ بونی کلتوری عەرەب و، وێژەی زبان و، ئایینی پیرۆزی ئیسلام. بە سەرزمان و، وێژەی تایەبەتی کوردیدا رێبازی کێشی عەروضی (واتەزانستی برٚ گەبرٚ گە کردنی هەلبەست) گر توٚ تەبەر، هەمو هەڵبەستە کانی خاوەن کێشن، زۆربەیان، غەزەلن، چەن فەصیدە واتە چامەیان بەند، پینج خشتەکی و، تێ هەڵکێشیان تێدا. بە رچاو، ئەکەوێ، (صەنایعی شعری) واتە کردەو، هونەر، یان پیشەی جوانکردنی هەڵبەست، لە هۆنراوەی شێخ دا، دەبەر چاوگیر اون، جا بۆنەوەی خوێنەرەوە بەرێزە کان باشتر لە جوانی و، رێک و، پێکی هەڵبەستە کان بگەن و، تارادە یە کیش لەم هونەرە و، ئەو کەم و، کوڕییانەی دەبنە هۆی عەیب و، کەم بایەخی هەڵبەست سەر، بێنەدەرێ. ئەونا میلکەیەم بە

---

١. مەبەست مەلا موحەمەدی کوژی حاجی مەلاعە و لایە کە بە جەنابی مەلاپان مەلای گەورە نیو دیر بووە، کاک مەسعود موحەمەدی مەشهوریش کوژی ئەم ذاتەیە:

زمانی کوردی نوسیوەو، خستوومەتە کوتایی ئەم باسەو، پێش دیوانە کەوە،بە هیوای کەلک لیوەر گرتنی لاوو، ساواکانی قوتابی و، خوینکارەکانیش لێ جارزو، وەرەزنەبن و، وەبەر دلیان کەوێ و، بەشتێکی خوما لی وەری گرن و، بەئالە کۆ کێکی کوردی دابنێن:

## شیوەی نوسینەوە:[1]

شێوازی نوسینەوەی هەمو هەلبەستەکانی ئەحمەدی کۆر. کە. لە ماوەی ئەم چەن سالەدا، کوم کردو نەوە، فارسی و، عەرەبی، بێ نیشانەو سەرو، ژێرو، بۆر بوون، دیارە هەلەو، جێگۆر کێی، پیتە، وەک، یەک چوەوەکانی. دال، ذال، زێ و، ژێ، کاف، گاف و، هی دی زۆر، تێدا. بوون. کەم و، کوڕی و، دابڕاو یی، هەلبەستێک یان پارچەیەک. لە هێندێک، دەس نوسەکانا، بەرچاو، دەکەوت،بەلام، من، دەگەل ڕاست کردنەوەی هەلەکان و، خستنەوە سەریەکی، هەلبەستەکانی، شیوە نوسینە کەم. هیناوەتەسەر، رێ و، شوێنی نوسینی ئەمرۆی زمانی کوردی ناوەندی، هەلبەت ئەو شێوە، دا. تا شراوەی هێندێک، لەو، گۆڤارو، رۆژنامەو، کتێبانەی کەئەمرۆ، کردو یا نەتەبا و، بەتایبەت لەئیرانا، دەبەرچاو، نەگیراوە، چونکو، هەموویان بەلاساکردنەوەی، زمانە بێگانەکان و، چونەوەسەر، نوسینی سەردەمی ساسانی، بەمقەستی، بێ، لێ تۆژینەو، لیکدانەوە، دەستیان کردۆوە. بەقەلت و، بڕی. پیتە، رەسەن و، خۆ مالیکانی کوردی و، تەنانەت

---

[1] ١. دیارە جیاوازی دانەنانی نێوان کاف و، گافیش هەتا ئەو دوابیانە گرێ کوێرەیەک بوو بۆ نوسینی و خوێندنەوە،کە لە هەلبەستەکانی ئەحمەدی کوریشدا، هەر، ما بۆوە:

لە زمانی خوشکە کەشی واتە، زمانی فارسی، بێ بەش تریان کردۆوە، دیارە من ئەم باسەم بە تەواوی لە کتێبێکی تایە بەتا هەروەها، چەن نامە و، نوسراوەیە کدا، بە، بەڵگە وە، نووسیوە، خودا، یا ربێ ئەویش لە کاتی خۆیا، دە درێتە بەرسەرنج،وە خوێندنە وەی هەمو هاو، وڵاتی و، خوێندە وارێکی هاو، زمانەوە بەلاّم، وەک دەزانین سەرچاوە و، ماکەی هەڵبەستی ئەحمەدی کۆر پتر ئایەتەکانی پیرۆزی قۆرئان و، ووتەی پیغەمبەری مەزنی ئیسلامە، لەزۆر شوێنا ئایەتی کردۆتە قاشی لیز گەی هۆنراوە کانی، دیارە پیت و، ووشە و،ڕستە و، واتای قوڕئانیش نا کرێ بگورێ،جا لە بەر. ئەمە ئایەتەکان، هەروەها، رستە عەرەبێکان لەسەرشێوەی عەرەبی ماونە تەوە، سەرو، ژێرو، بۆرو، شەدومەدەیان بۆ، دانراوە، فارسی و، تورکێکانیشم هەرخستۆتە، سەرشێوازی نوسینی کوردی، لە کۆتاییدا، وا تا نامەیە کیشم. بۆ، لێک جیا کردنەوە و، باشتر،لێ حاڵی بوون، بۆ داناوە، هیوایە، تیا نە گلابم. دیارە هەرخوداشە نا گلێ و، لە کردە و، ووتەی خۆ ی پاش گەز نابێتەوە، لەم چەن نوسراوەو، دەسنوسانەی بە لامەوە هەن و، کەلکم لێ وەر گرتون، پاشی پێک هەڵسە نگاندن و، لەبەریەک دانانیان، کامە یا نەم. بە لاوە رێک و پێکترو، راستر بوو، بێ، ئەوم هەڵ بژاردۆو، نوسیومەتەوە، ئیتروازم. لە هێنان و، ئاماژە کردنی ئەوانی دی هێناوە تەنیا لەچەن شۆینانەبێ کەلام وابۆوە پێوستە.

## شێخ ئەحمەد و، خوواجەی شیرازی

وەک دەزانین زۆر کەس لە هۆنەرانی ئێستاو، را بوردوی کورد، بە خۆیانا پژماو ن و، ذاتیان کردۆوە بچنە گۆرەپانی پێش

بڕکەی هەڵبەست، گوتن و، لاسایی کردنەوەی شوڕە سواری پیرو، چازانی خوواجەی شیرازەوە، دیارە زۆربەیان ئەسپی طەبعیان. تابشی نەهێناوە و، نەی توانیوە بگاتە سەری مەیدان و، لە پڕتاوی یەکەما، سەر سمی داوە و، سەرەنگرێ بون و، تۆزی چارە وای تیژ ڕەوو، خۆ شبەزو، عاملاوی مرخی خوا جەیان نەشکاندووە، بە شپرزەیی، مەیدانیان بەجێ هێشتوو، بە رەو، دووا، گەڕاونەوە؛ بەلام، هێندێکی وەک مەلا جزیری شان بە شانی خوواجە، تا سەری شارە و، قەلەمندارەی پێش بڕکە، ڕۆیشتون و، ئەگەر ذات نەکەین و، نەلێن گرەوەکەی بردۆتەوە، ناش توانین بێژین دۆزاندویەتی و، دەگەڵ حافظ دا، بەرامبەر، نەهاتۆتەوە؛ وا، ئێمە بۆ، وێنە هەڵبەستی چەن هۆنەرو، شاعیرێکی وەک حاجی قادری کۆیی. ئاورەحمان بەگی سالم، شێخ ئەحمەدی جزیری. ئەخەینە، بەر چاو، و، خۆتان لەبارە یا نەوە داوەری بکەن؛ هەڵبەت شێخ ئەحمەدی ئێمەش بە خۆی خورۆیوە و، لە ئەسپی طەبعی، ڕادیوە و، چۆ تەناو گۆری ئەو خۆ تاقی کرنەوە و، پێش برکێیەوە؛ ئەویش لەمەیدانی، پڕ، کەندو، کوسب و، کڵۆی ألا یا أیهاالسافی، دا؛ بەڕاستی سوار چاکی و، غیرەتی گەرەکە، کوێر یێکی بێوە کازو، بێ دەسکێش و، چاو ساغی، وا، بوێرێ بچێتە مەیدانی جلیتبازێکی وەک خواجەی شیرازی یەوە، ئەویش نەی دۆرینێ؛ ئەوەش وێنەی هەڵبەستی ئەوچەن شاعیرە کوردەی کە خۆیان خستۆتە. ئەم دەریایەوە و، دەگەڵ خواجە کەوتونەتە، قڕ نەگومەو، پێ مەلەوە، پاشان بە گوێرەی شەرحی مامۆستا موحەمەد ئەفەندی سودی و، وەرگێڕانەوەی خوشکە عیصمەتی سەتارزادە لە تورکیەوە بۆ فارسی، واتای هەڵبەستەکەی حافظ ئەدەینە بەر، لێکدانەوەو، خۆشم ئامارە و، دیاردە، بۆ هیندێک لە نوکتەکانی زمانەوانی و

وشەو، پیتەکان دەکەم، ئەوەش بێژم، دوکتور سەتارزادە بەپێشنیاری مامۆستا سەعیدی نەفیسی دەسی داوەتە کاری وەرگێڕانەوەی سوودی:

## سالم بەگ و، حافظ

بە دەل، کەین با، بە نەشئەی مەی غوباری میحنەتی دونیا
**ألا یا أیّها السّاقی أدِر کاساً و، ناوِلها**

موحەبّەت، زۆر، بە ناشووبە. بە، سەهلی، تێمە گەن، یاران
**که عشق آسان نمود اوّل ولی افتاد مشکلها**

کە بادی صوبحدەم. ئەفشان، دەکا، گێسوویی پڕچینی
**زتاب جعد مشکینش چه خون افتاد در دلها**

محەلّی محینەتی دونیا. رەفیق، ئیمرۆژو، فەردایە
**جرس فریاد میدارد. که بربندید محملها**

قصەی من شوهرەتی شەهرەتەمامە، تازە، بێ پوشم
**نهان کی ماند آن رازی کزو سازند محفلها**

دڵا، هەرچی دەڵێ ناصح، لەنیک و، بەد، بەجێ بێنە
**که سالک بی‌خبر نبود زراه و رسم منزلها**

ویصالی دڵبەری (سالم) موعەظەمتر لەهەر مەطلەب
**مَتیٰ مٰا تَلقَ مَن تَهواه، دَعِ الدُّنیٰا وَ أمهِلهٰا**

## حاجی قادری کۆیی و، خواجه حافظ

ده خیلت بم وه‌ره ساقی «أدر کأساً و، ناولها»
غه‌م و، غوصه‌ی دڵم که‌م بوو، «ولی افتاد مشکلها»
ئومێدی زولفی میشکینم «صبا زان طرّه بگشاید»
که‌چی نه‌مزانی به‌م ده‌رده «چه‌خون افتاد در دلها»
له‌ به‌حری عیشق و، خۆفی مه‌وج و «گرداب چنین هائل»
به‌ هاواری دڵم ناگه‌ن «سبکباران ساحلها»
به‌ ئه‌وه‌ل عیشقی بوون، کردو، «به‌بدنامی کشید آخر»
چلۆن په‌نهان ده‌بێ سیرّێ (کزو سازند محفلها»
بلێ، بمره، ده‌بێ بمری «اگر پیر مُغان گوید»
که‌ چونکه‌ خۆی خه‌به‌رداره «زراه و رسم منزلها»
له‌ هیجرانی ئه‌تۆ، بۆ، من «چه‌أمن و عیش، چون، هر، دم
ئه‌جه‌ل بانگمان، ده‌کا بزوو، که‌ن «که‌بربندید محملها»
ئه‌گه‌ر تۆ، موخلیصی عیشقی «از او غائب مشو حافظ»
که‌ (حاجی) بو سه‌فه‌ر، برّوا «دَع الدُّنیا و أمهِلها»

## شێخی جزیری و، خواجه‌ی شیرازی

هه‌رێ مه‌یگێر:
نه‌وایا مو طریب و، چه‌نگێ فغان ئاویته‌ خه‌رچه‌نگێ
وه‌ره‌ ساقی، هه‌تا که‌نگێ نه‌شۆیین دڵ، ژقێ ژه‌نگێ
حه‌یاتا، دڵ مه‌یی، باقی بنۆشین، دا، به‌ موشتاقی
ألا یا أیّها الساقی. أدِر کأساً وَ، ناوِلها

کو، کاتیب، دیمی جه‌دوه‌ل که‌ت، شکسته‌ خه‌ط، موسه‌لسه‌ل، که‌ت

ژ .یەک حەرفانموفەصّەل کەت، کی بە ،وێ موشکلێ حەل کەت ؟
د ، زانی رودو، عود ، ئەوەّل چتافێتن، سورود ، ئەوەل؟
**که عشق آسان نمود اوّل، ولی افتاد. مشکلها**

ژ ،میهراوێ شەفەق سەعدێ شیرین لەعلێ ،شەکەر ،وەعدێ
دەنالم. شوبهەتی رەعدێ عەجیبم لێ. ژ ، وێ جەعدێ
کە دل را تاب هرچینش بکفری می برد ، دینش
**زتاب جعد مشکینش، چه خون افتاد ،دردلها**

د ، ڤێ، طاقێ، دە،ڤێ ،خانی ،مە،عەیش و ،ئەیمنی کانێ؟
کەسی ،دەست دەت ،ژ ،دەورانی نیهالەک ،ڤێ، گولستانێ
در آغوشش چو می آرد که از دل جانش بسپارد
**جرس فریاد می دارد که بربندید محملها**

بە قورئانێ بە ئایاتێ ئەگەر پیری خەراباتێ
بێژ ییت سەجدە بنە لاتێ، مریدین، وی، دەبن قاتێ
مرید ،ارپی بصر نبود. ز، فرمانش بدر نبود
**که سالک بی خبر نبود ز، راه و، رسم منزلها**

شەڤێ ظولمات و ،دەریایێ ژ ،مەوجان قەط. خەبەر نایێ
شکەستێ، کەشتیا بایێ عەجاجێ، ڤێ شەفەق نایێ
ژ. حەرفان. ماه و ،سالی. ما ،نەهات دەر ،شکلی فا مێ ما
**کجا دانند حال ما سبکباران ساحلها**

مە،را ژەوەّل جەبەر، خامی کە شاند ئاخر ،بە،بەدنامی
ژ ،رەنگی «سەعدی وجامی» ژ ،شوهرەت پێ حەسین عامی
بە دەنگ و ،بانگ و ،ئاوازێ د ،بێژ ییت نەغمەیا سازێ
**نهان که ماند آن رازی کزو، سازند محفلها**

ژ ،(حافظ) قوطبی شیرازێ «مەلا» فەهم نەربکەی رازێ

بە ئاوازی نەیی و، سازێ ببن بەرچە رخ پەروازێ
تُزَد فی حُبِّهاالصَفویٰ بِهِ أهلُ الهَویٰ نَشویٰ
مَتیٰ ما تَلْقَ مَنْ، تَهویٰ، دَعِ الدّنیا وَ أمهِلها

خوێنەرەوەی ئازیزو، بەڕێز، بۆ، زانین و، لێکدانەوەی، و وشەو

هەلبەستە کانی مامۆستای جزیری دەتوانی بڕوا نێیە دیوانی جزیری. شەرحی مامۆستای پایە بەرزی کورد. مامۆستا هەژار، کە سرووش لەچاپی داوە ...

سەبارەت بە نەهێنانی تێ هەڵکێشە کەی شێخ ئەحمەدی کور، لێرەدا، ئەشێ بێژم. هەر، وەکوو، چون مامۆستای شێخ مەلائەحمەدی جزیری پێڕەوی لەخواجەی شیراز کردووە و، سەرەتای دیوانە کەی خوێ بە (هەرێ مەیگێڕ) ڕاز اندوتەوە، منیش بە پێڕەوی لە شێخی جزیری (ئەهۆی کاکی مەیگێڕ)ی شێخ ئەحمەدی موکری دەکە مەگوڵی سەر، قەرتاڵەی گوڵستانی دیوانە کەیان و، بۆ خۆ پاراستن لە دوپاتە کردنەوەی، ئەم پارچە هەڵبەستە، لێرەدا، نای هێنم و، بە هێنانی ئەویێ قینات دەکەم، وەک بە ڵینم دا بوو، ئیستا، واتاو، لێکدانەوەی و وشەو، هەڵبەستی خواجەو، نوکتەو وردەکانی زمانەوانیتان بۆ، ڕوون، دەکەمەوە:
ألا ـ یٰا ـ أیُّ، هٰا ـ السّاقی ـ أدِرْ، کَأسن. وَ، نٰاوِلْ ـ هٰا .... پێویستە ئەوەش بڵێن، دەگەڵ ئەوەشا، عەلامەی قەزوینی لای وایە خواجە حافظ ئەو نیوە هەڵبەستەی سەروی لە یەزید، وەر نەگر توە، بەلام، وەک زۆربەی حافظ زانەکان،مامۆستا موحەمەد، ئەفەندی واتە سودیی ڕاقەکەرو، لێ کۆلێلەرەوەی دیوانی خواجەی شیراز. پێی وایە ئەم نیوە هەڵبەستە لەو شێعرەی یەزید، وەرگیراوە. دیارە بەم جورە ڕا گوێژ تنانە دەگوترێ تەضمین و، دەباڵ یەک ڕا کردن.

أنا آلمسمُومْ ماعِنْدی بِتِرْياقٍ وَلا راقی
أدِرْ كأساً وَ ناوِلها . ألا يا آيّها السّاقی

بەلام حافظ بۆ هاوكێش كردنی ئەم كوتە شێعرە،دە گەڵ ئەوەكانی خۆی و، بۆ تێک شكاندنی قەوارەی هەڵبەستە كەی یەزید، پاش و، پێشی پێ كردووە و، دەڵێ. آلا یا آیّهاالسّاقی أدِرْ كَأساً وَ ناوِلها .

## نوكتە و، واتا:

آلا: ئەهۆی. ئەرێ. هەرێ. پیتی ئا گاداری و، هۆشیار كردنەوە و، وەبیر هێنانەوەیە؛یا: پیتی بانگ و، قاوپێكردنە و، بۆ دورە. أیُّ: پیتی ناوە،واتە بانگ كراو، بۆ تاک و، نێرینەیە. ها: پیتی جیا كرنەوە و، لێک دور خستنەوەی وشەی أیُّ و، الساقی یە كە هەركیان ناسراون و، بۆ، تاقن. ألساقی: ناوی بكەرە، واتە ئاو دێر. مەیگێڕ. أدرْ: كردەوەی تێپەڕ و، فەرمانە، واتە پڕ كە، تەژی و، لێو ڕێژی كە: كَأسْ: كاسە، دەفر، ئامان، پیاڵە، جام. ناوِلْ: كردەوەی تێپەڕە و، دوو، كراوەی،واتە (مەفعولی) گەرە كە. واتە ناوِلها إیّایَ، بیدە بە من ها: پیتی جێ نشین و، جێگرە، بۆە ئافرەت و، مێ یینە و، شتی وایە كە: پیتی بە لُگە هێنا نە وە یە،واتە. چونكو، ژە، بەر هەندی. بۆیە، عشق: هەستی بە هێزو، توندی ئەوین: ئاسان: هاسان بێ زەحمەت نمود: كردە وەی وێستاو و، تی نەپەرە (فیعلی لازم) واتە دەریخست خۆی نواند. وەلی: پیتی بەسەر گرتنەوەیە، واتە بەلام، دە گەڵ ئەوەشا أفتاد، كەوت، داكەوت، هاتە پێش. موشكل: دژوار سەخت، (كورتەی واتا): ئەهۆی كاكی مەیگێڕ پیاڵە یەكم بۆ پڕ كەو، بم دەیە، چونكو ئەوین و، خۆشەویستی یار. لە بەرا، زۆر سووک و، هاسان بوو، بەلام، كاتێ كە وتمە

ناو گێژاوی دەریای دڵدارییە وە، صەدان تەنگ و چەڵەمەم، هاتە پێش و، خۆم، تیا گوم کرد، جیا بۆ. خۆ شاردنەوە لەم هەمو پەژارانە، دەمەوێ لە گشت شتێک بێ ئاگا بم: بوو: بۆن، بێن، بەرامە، نافە: ناوکی ئاسک و، مامز، جێگای خوشبۆ ئاخر: بێ گومان لە ئاکا ما، لە کۆتایی دا، صەبا بەو، بایەی لە کاتی شەو و، ڕۆژ، بەرامبەر، بون دا کە لە لایێ ڕۆژ هەڵا تەوە لە، وەختی بەرە بەیانی دا، هەڵ دەکا، دە گوترێ‌بەڵام لەزاراوەی شاعیراندا، هەربایەک، لەلای دڵبەرو، نۆ گرەوە، بێ، پێی ئەوترێ صەبا. زان: زی ئان لەو، لەوەوە، ژ وی. طورە: تەویل، ناوچاوان، ئەو مویەی دە کەوێتە سەرتەوێڵ، بگوشایەد: بکاتەوە، ڤەکا، وازی کا، لیکی جیا کاتەوە: زتابی: لەتاوو، پیچی بە سەریە کا کەو توو، جەعد: موی کرژو، لول. هەڵ پێچراو، مشکین: مسک ئاوی واتە. ئەو، مۆەوەک میسک ڕەش و، بۆن خۆشە، یای (ی) میسکین پیتی نیسبەت و، پیوەلکا ندنە، نون (ن) بۆ سور بوون و، پێ دا گرتنە، بەم چەشنە نونە ئەوترێ نونی تایەبەتی، چونکو هەربە، شوێن یای، نیسبەتا، دێ: چە: چەندە، هێندە، خون: خوێن. هوون کورتەی واتا: بەهۆی بۆن خۆشی میسکی موکا نیوە کە، بای صەبا لەزولف و، کەزیە و، پرچی ڕەش و، پڕچینی دڵبەرەوە ئەی هێنێ. هەمودڵێکی پڕ کردوۆە لەخوێن، چونکو. زوو، نای کاتەوە، تاوە کوو، ئەم بۆن و، بەرامە خۆشە بلاو بیتەوە: مەی: شەراب، سەجّادە: بەرماڵ دو گر. جێی نوێژ، جانەماز، ڕەنگین ڕەنگاوی. ڕە نگاو، ڕەنگ کون: بکە، بە جیێ بێنە. گەر: ئەگەر، ووشەی ئامرازی مەرجە، تْ: تو، تە، بە تو، گویەد: بلێ. بێژێ، پیر: گەورە و، سەرۆکِ موغان: مالم، کەشە، رابەری ئایینی زەرِ دەشت: سالیک، ڕێبوار، پیری ڕێ نیشاندەر، ڕەسم: یاسا، عادەت. شیوە، نەریتی. مەنزل: ماڵ، مەیخانەی ئەوین و، خۆشەویستی: کورتەی واتا: بە مەرجێک پیری موغان پیت بێژێ ئامراز و، کەرەسەی خوا پەرستی و، بەر ماڵە

که ت، به ره نگی سوری شه ڕاب، بره نگینه، به گوێ بکه و، له قصه ی لا مه ده. چونکو. هه ر پیرباش ده زانیّ،ڕێبواری ڕێگای ئه وین ده بیّ چبکا و، به کوێدا بڕوا ، مه ُرا: بر من. ژمن به خاطری من جانان: کـۆمه ڵی ئه ویندااران. چه: ئامرازی پرسیاره، و وشه ی سه ر سوڕمان و، سه یرو، سه مه ره یه ئه من: هێمنی. هێمنایه تی و، ئاسوده بوون. عه یش: ژیان، را بواردن. چون: چونکو، له به ر ئه وه هه رده م: هه مو کات. جه ره س: زه نگ. زه نگوڵه، که پتر ده ملی، و وشترو، که ڵ و، نیێری ده کریّ فه ریاد: هاوارو، داد، زیڕه و، قیژه، می داره د: هه ڵدیێنیّ. هاوارده کا. به ر: سه ر، پێش، دیره دا، بۆ، سور بوون و، جه خت له سه ر کردن، ده کار هێنراوه به ندید: ببه ستن. کۆ که نه وه، لیێک نیێن، باران لیّ نین مه حمیل: بارو، بنه کورته ی واتا: هیچکاتێک ژیان و، ڕا بواردن له قۆناخی ئه ویندااران دا، بۆ من. مه یسه ل نابیّ و، نا، گونجیّ، چونکوپه یتا په یتا، زه نگی ئاماده بون و، وه شوێن که وتنی یاران، به ده نگی به رز، قاوده کاو، گوێم ده زرینگێنیته وه و، ده ڵیّ، باران، لیّ نیێن و، ڕاکه ن، خۆتان بگه یه نه کاروانی دلدارانی خودایی و، ڕاسته قانی. شه ب: شه و، شه ڤ تاریک: ئه نگوسته چاو بیم: ترس، مه و ج: شه پۆل. پیێل، گرداب: گیژاو (ی) پیتی، تاک و، نه ناسینه و، بۆ، سام و، هه یبه ته چونین: به م جوره به و، چه شنه، ئاوا ها. ئه م و وشه یه، تێکه لاوێکه له چون. واته وه ک وه نین واته ئه مه، که ئاماژه کردنه بۆ نزیێک هائل: ترسینه ر، به ترس، مه ترسی دار، کوجا: کویّ، و وشه که بۆ پرسیارو، سه ر سوڕ مانه، دانه ند: ئه زانن، کرده وه ی کات و، کۆمه ڵه حال: بارو، چلۆ نایه تی، ما: ئێمه سه بوک: سوک، که م وه زن بار: لیێره دا مه به ست خه یاڵ و، که تره خه می یه: ساحیل: که نار، قه راغ، ویشکایی ده م ئاو کورته ی واتا: باری ژیانی ئێمه بوته، تاریکه شه وی دوریی یاران، مه ترسی خه نیم و، نه یاران، ترسی خنکانی گیژاوه ی دور، که وتنه وه ی هه تا هه تای دلداران، دیاره،

ئه وانه ی گه یشتونه ویشکایی، گه یشتن به دلْخوازیان و ئیدی بیریْ.
له ئیْمه نا که نه وه، چونکو، نه ترسی ناموْیان ماوه و، نه مه ترسی له دلْدار جیا بونه وه یان له دلْدا ماوه. هه.مه: هه مو، گشت. هه می. تـه واو، کـار: کـرده وه، خـود کـامـی: سـه ره روْیـی گـوێ نـه دان، به دنامی: به خراپ نیوْدیرْ بون، ریسوایی: له بره و که وتن، که شید: گه رامه، سه ر... بووم، به... ئاخر: دیْره دا، بوْ سوربون و، بێ گومان بونه، پنهان: په نامه کی پیوار، نادیار، که ی که نگیْ. چکات ماند: ده مێ نیته وه ده رنا که وێ. ئاشکرا نابێ ئان: بوْ ئا ماژه و، دیارده و، ئیشاره ی دوره رْاز: نهیْنی، مه طلّه بی ده رنه خراو، رْا، نه ندراو، که زو: که له و را، له وه وه سازه ند: دروست ئه که ن. پیْک دیْنن هه لْده به ستن مه حفل: کوْرْ، کورته ی واتا چونکو ته واوی کاره کانم. به سه ره روْیی و، گوْی پێ نه دان به خواستی کوْ مه لْ بوو، پاش ئه م گشته جه زره به یه کیْشرامه به د نیوْی و، ریسوایی به خه یالْی خاوی خوْم لام وابوو، که س پێ نازانیْ، به لاْم وا، نه بوو چونکو، من ده گه لْ کومه لاْنی دوست و، هاوالْ. که وتبوو مه یسه ر، رْچه ی ئه ویندارا ن، ئه وان گوێیان به خواستی نه فس و، خوْ بینی نه دا پیْ گه یشتن، من به جیْ مامم و، تیْم گه یشتن، که واته، ئه م، رازه به سه ر پوْشی نامیْنیْته وه و، صه دان کوْری له سه رده گیریْ و بلاْوه ده بیْته وه و، هه مو که سی تیْی ده گا حضوری: پیْچه وانه ی دوری یه به رامبه ری سه فه ره، دیاره ئاسایش و، هیْمنایه تیشی تیْدایه. هه می: ئامرازی دریژه دان و، نه پسانه وه یه خواهی: ئه ته وێ ئه خوازی، گه ر کته غایب: دژو، به را مبه ری حاضره مه شوْ: مه به حافظ ئه ی حافظ. لیْرده دا، هونه ری ئیلتیفات واته، قصه کردن له ته ک خوْیدا، وه ک بیْگانه و، نه ناسراوده کار هیْندرواه متیٰ: ئامرازی مه رجی و، پرسیاره واته هه رکات، ما: لیْرده دا بوْکات و، زه مان و، سور بونی له سه ر کاته که یه (متی) دَعِ الدنـیا وه لانیْیه. دونیاو، ئه وه ی، وا. تیْشی دایه ئه مهلها: جیْی بیْله و، به هیچی دانیه. تَلْقَ: پێ بگه ی. من:

به‌و كه‌ سه‌ی ـ تهوا: تهواه گه‌ر كته‌، خۆ شت ئه‌وێ. كورته‌ی واتا: ئه‌ گه‌ر ئاسایش و، هێمنایه‌ تیت گه‌ره‌ كه‌و، ده‌ ته‌وێ به‌دڵخوازی خوێت بگه‌ی پێویسته‌ دونیاو، هه‌رچی تێیا یه‌تی به‌ هیچی بزانی و، ئه‌وان. وه‌لانیه‌ی، ئه‌وه‌ش بزانه‌ ئاسوده‌یی تۆ هه‌رله‌وه‌ دایه‌ هیچكا تێك دڵدارو، ئۆ گره‌ كه‌ت، وه‌لاڕه‌ خه‌ی. كه‌واته‌ چونكو ئه‌م دوڕانه‌ ده‌ گه‌ڵ یه‌ ك نایه‌ نه‌وه‌ڕه‌شێ دونیای بۆ، وه‌لا خه‌ی. به‌واته‌ی ئه‌حمه‌دی كوڕی ئیمه‌ش، یه‌ كێ بگره‌، یه‌ ك. ته‌ڵاق ده‌، پێكوه‌ نابن دوو هه‌وێ

**مه‌لا عه‌زیز داشبه‌ندی موحه‌مه‌ پور**

## کێش و، قافییه:

### یان وه‌زن و، کلکه‌ی هه‌ڵبه‌ست

وه ک ده‌زانین، یه کێک له‌و، شتانه‌ی بۆته هۆی جیا وازی و، سه‌ر که وتنی به‌ره‌ی ئاده‌میزاد، به‌سه‌ر، هه‌موو، جیهان و، گیان له‌به‌ر یێکا، ئه‌وه‌یه، بیرده کاته‌وه، ئه‌تۆ ژێته‌وه، تێ ئه‌فکرێ: هه‌ستی به‌رزی مرۆ ڤایه‌تی ئه‌و، به دیتنی روا ڵه‌تی هیچ شتێک که‌وه ک په‌رده‌یه ک، به، به‌ر چاویدا، دێ و، وه، ڕاسته‌قانی ده‌چێ، فریو، ناخوا، هه‌رکا تێک توشی، گرێ کوێره‌و، نه‌زانراوێک دێ، به ئه‌رکی سه‌رشانی خۆی ده‌زانێ، ڕێگا بدۆ زێته‌وه و، بیناسی لیفه‌ی نه‌زانی له‌سه‌ر، هه‌ڵ داته‌وه، زانسته کانی به‌روی بکاته، کلیلی کرنه‌وه‌ی ده‌رگای هه‌مو. ته‌نگ و، چه ڵه‌مه‌یه کی، باری ژیانی، له‌را بوردوی کۆ مه ڵی خۆ ی و، خه ڵکی تر، که‌لک، وه‌ر گرێ، زمانی کردۆته که‌ره‌سه و، ئامرازی ئا ڵ و، گۆر کردنی گشت، چه شنه زانست و، لێک حاڵی بو نێک، دیاره هه‌رچی شارستا نێه تی و، زانین، به‌ره‌و، ژور. ئه‌ڕوا، که‌ره‌سته‌ی پێویست تریش دێته گوڕێ زمان جوانتر. ده رازێته‌وه، قه ڵه‌م و، پینووس به هانایه‌وه، دین ده‌ستیان گرتووه‌و، بردویانه ته، سه‌ر ترۆ پکی سه‌ر که‌تن، ڕێ و، شوێنی جوان نوسین، باش، وێژین، چۆن و، که‌ی و، بۆ کێ

نـشیـسین و، ئاخـفـتـن کـردن. دامـەزراوەو، نـاوی نـراوە، راست و، ڕەوانی، یەک گرتنەوەی و وتەو، واتا، بەجێ بوونی، و وشەو، گوتە و، نوسراوە. ڕێک و، پێکی، رستە و، جوان ڕا گەیاندنی مەبەست، ڕازاندنەوەی و وشەو، ڕستەی. بەکار براو، بێ. زڕو، زیـوان بـونـی. وێـژراوە و، نـوسـراوە. لـەئـامـرازی دا، تـاشـراو و، نـە بیستراوی، پڕ گرێ و، گۆڵ، دیارە کەسێک لە ووتارو، نوسینا ئەم بابەتانەی سەروو، دەبەر چاو. بگرێ و، درێژ،دا، دزو، بە قەڵت و، بڕ نەبێ. کات ناس و، نۆرە بڕو، خۆ تی هەڵ قوتین نەبێ. بەزمان ڕەوان و، دە مەوەر، ئەنا سرێ. هەڵبەت ئەو، د مەوەری و، زمان پاراوێ یە، بۆ ووتە و، پەخشان و، هەڵبەستیش دە کار دەهێنرێ.

## کێش و، وەزن:

وەک، ئەزانین. هێندێک ووشە. لەکاتی بە، سەر، زار. دا، هێناندا بڕ گەو، قۆر تیێکی هەیە، وەک. کەڵو، کەل. بڕ یکیش، دو، بـڕ گـە، یـان، زیـاتـرن،وەک، ڕەزگـار بـون و، سـەرکـەوتـن جـا، هەر کاتێک، دو، ووشە، کەوتنە بەرامبەر یەک و، هەرکیان لە بڕ گەو، بەشا. وەک یەک وا، بون. پێیان دە گوترێ، ئەمانە هاوکێشی یە کەن، وەک، ڕێک کەوتن و، سەر کەوتن قا فیێ یە: هەر گاە، لە کۆ تایی ووشە، یان و وتەدا. بە تایەبەت لە هەڵبەستا، پیتێک. یان دو پیت، دەنگ و، ڕەنگیان. وەک یەک وابێ، پێیان ئەو ترێ هاو، دەنگ و، ڕەنگ. بە دو کوتە هەڵبەستە کەش، ئێژن هام پاشگرو، کلکە.یان قافی یە:بەخشان: واتە پڕژو، بلاو، بر یتی یە، لەو، ووتە و، نوسراوەی دەر بەستی. کێش و، هاو دەنگ بوونی و وشە کانی کۆ تایی رستە نەبێ، وەک نامە و پەیامی نوسراو، ووتو، وێژی گشتی کـتـێـب و، پـەرتـو کـی، زانـسـت و، دەرس و، وانـــەی مـنـالان و، خویند کارانی زانکۆ کان. هونراوە: یان شێعرو، هە.ڵبەست ئەوەیە،

پیویسته، ده گه ڵ ئه وشا . که ده بێ. خاوه نی هه ست و، خه یا ڵیکی ناسک و، جووان بێ و، پڕی بیێ له واتای ده رون و، مه به ستی سه رسوڕ هێنه ر، ئه شێ، خێوی کێش و، ده نگی تایه به تیش بێ.

## هه ڵبه ست چه ن جۆره:

یه که م. هه ڵبه ستی گۆرانی و، به یت و، با ڵوره یه، دیاره ئه م جۆره هه ڵبه سته هه ر له زۆوه، له ناو کۆ مه ڵی کورده واریدا، بۆ نزاو، پاڕانه وه ئایینێ یه کان به مه به ستی ده ر بڕینی، ناخۆشی و، غه م و، په ژاره ی، له ده س دانی ئازیزو، گه وره گه وره کانی سه ر هۆزو، پیاوه نیۆ به ده ره وه و، خوایی یه کان وه ک شین گێڕان و، پێدا هه ڵ گوتن. باو، بوۆه، چونکو به گشتی مرۆڤ هه رله و کاته وه زمانی گرتوۆه و، ووشه ی به ده ما هاتوۆه و، توانیوێتی هه ست به خۆشی و، ناخۆشی، ئه وین و، قین، په ژاره و، شادی سه ر که وتن و، تێ شکان هیواو، دڵنیایی، ئۆگر و، بێزاری به ئاوات گه یشتن و، چاوه ڕوانی نیازو، بێ نیازی پاڕانه وه و، توک و، نزا، بکا شێعری ناسیوه و، به م شێعره توانیوێتی هه موشتێک ده ربڕێ له م چه شنه هه ڵبه ستانه دا، هاوکێشی و، ڕێک هاتنه وه ی بڕ گه و، به شی و وشه و، ڕسته و، کورتی و، درێژی ده به ر چاو، نه گیراوه، ئێستاش ئه م شێوه، هه ڵبه سته له ناو، ئێمه ی کوردا، هه ر ماوه و، ده کار، ده هێندرێ دوهه م: هه ڵبه ستی خاوه ن بڕ گه یه، له م جۆره هه ڵبه سته دا، زۆر جار، قوڕتی کورت له به رامبه ر قوڕتی درێژدا، دانراوه، وه ک هۆره ی جاف، سیاچه مانه ی هه ورامی «گوران» «لاوک و، لاوژۆ کی کوڕمانجی ناوه ندی و، ژو رووه ڕونه له زمانی ساسانی و، په هله ویشا، ئه و شیۆه هه ڵبه سته، زوڕ، به بره و، بوۆه که واته: هاو ده نگی و وشه کانی دوای هه ڵبه سته کان زۆر، ڕه چاو، نه کراوه، به ڵام دوای

ئه وه ی هه ڵبه ست خۆی گرتووه هاو کێشیی لێ بۆته بارو، به ری نه داوه.

### سێهه م هه ڵبه ستی عه روضی:

**یان خاوه ن کێش.**

له م چه شنه هه ڵبه سته دا، سه ره ڕای ئه وه ی پێویسته کێش و، هاوده نگی ده به رچا بگیرێ. ئه شێ بڕ گه ی کورت و، درێژیش له شوێنی خۆیانا، دا بندرین، واته، کورت له به رامبه ر کورت و، درێژله به رامبه ری درێژدا هه ڵ که وێ. به کورتی ئه توانین بێژین، هه ڵبه ست و، هونراوه ی کوردی هه ر له سه ره تاوه، تا ئه مڕۆ، له سه ر، دو، ڕه وت هاتۆوه.

١. فۆلکلۆریک: یان هونراوه ی کۆمه ڵی نه خوێنده وار. که به شێوه ی به یت و، باڵوره و، گۆرانی. حه یران و، لاوژه، هۆره و، سیاچه مانه ده ماو، ده م هاتون و، که و تونه ته ناو کومه ڵه وه، بڕیکێشیان، به نوسراوه یی له ناو، خه ڵکا. بره ویان په یدا، کردۆوه، دیاره ئه م شێوه یه به هه ردوک باره که یه وه له سه ر کێشی بڕ گه یی بون، به لام له به یت و، باوه کانا، هاو کێشی کورت و، درێژ زۆر، ده به رچاو، نه گیراوه، دیاره گه وره ترین هه ڵبه ستی نووسراوه ی کوردی وه ک میژوو، نیشانمان ده دا، هه ڵبه ستی پیری شالیاری هه ورامێ یه که، له سه ره تای ئیسلامدا له ژێر ناوی ماریفه توپیری شالیارێ، دا، هونه راوه ته وه‌یان پارچه هه ڵبه ستی (هۆرمز گان ڕمان. ئاتران کوژان).

٢. که لاسیک: یان هۆنراوه ی خوێنده وارانه، هه روه ک، ڕابرا کێشی هه ڵبه ستی هۆزه کانی ئێران به کوردو، فارسه وه به رله ئایینی

پیرۆزی ئیسلام. بە هەر دوو، شێوە کا نێ یە وەلە سەر کێشی بڕ گە یی بوۆە، بەلاّم پاش وەر گرتنی رێ و، شوێنی ئایینی ئیسلام کێشی عەروضی کە تایە بەتی هەڵبەستی زمانی عەرەبە. هاتەنێو زمانی هەلبێەست و، هۆنراوەی گەلی کوردە وەو، جێگای خۆی رۆژ لە رۆژ، فرت و، فراونتر کردەوە، بە چەشنێکی واەئێستاش زۆر بەی هۆنەرە ناودارو، گەورە کانی کورد، هەر لەسەر ئەو شێوازەیەاو نەتەوە، دیارە ئەو شوێنەی زانستی عەروضی کردێ یە، سەر زمانی شێعری فارسی نەی کردۆ تەسەر، شێعری کوردی،چونکو، وەک زاُمان گە یاند، هەڵبەستی کوردی خوا، فۆ لـکلـوریکی و، خوا کەلاسیکی لەسەر شیۆەی کێشی بڕ گە یی بوۆە، ئێستاش بە یت و، گۆرانی و، حە یران، هەر بەم جۆرە ماونە تەوە. ئەمەلە لایە کەوە، لەلایە کی تریشەوە ووشەی کوردی بە پێچەوانەی زۆر کەس لەزاناو، مامۆستا کانی کورد، وەک مامۆستای هەرە چازانی زمان و، ڕێز مانی کورد، خوالێ خوشبوو، دوکتور صەدیقی موفتی زادە، مامۆستای کاتـی زانستگای تاران، کەلایان وابوو، لە کوردیشا ناکرێ هیـچ ووشە یە ک بێ جوو لە دەس پێ بکا، یە کێک لە، تایە بە تێکانی زمانی کوردی، ئەوە یە، لەزۆر، ووشەدا، پیتی یە کم زە نە دارە، واتە خاوەن جەزم و، سکوونە، ڕونە، ئەم مە بەستە، دە گەڵ دە بەرچاو گرتنی یاسای عەروضی عەرە بدا، نایە تەوە، بە کوردی و، کورتی دە توانین بڵێن، کێشی بڕ گە یی خۆماڵی ترن و. لەتە ک خوو، خدەی زمانە کەمانا باشتر ڕێک نە کەوێ، دیارە هەڵبەستی نوێی ئەمڕۆش کە مامۆستا عە[1]بدولاّ گۆران بەر، لە نیما یۆشیج هێنایە گوڕێ، بادانەوەیە کە بۆسەر کێشی لەمێژینەی کورد، واتە کێشی بڕ گە یی و، بە یت و بالۆ رەو گۆرانی.ئەمە باسی هەڵبەست

١. مامۆستا گوران لە سالی ١٩٠٢ دا، هاتۆتە دیناوەو، لە سالی ١٩٦٢ شا وەفاتی هەرمۆوە

بوو، لەلانی کێشەوە. ئێستاش باسی هەڵبەست لەباری مەبەست و، بابەت و، چلۆنایەتی، ڕێک خستن و، داڕژتنا، دەکەین کە، لەم ڕێگەشەوە بە چەن بەش، دا بەش دەکرێ.

مەثنەوی:

یان دو، خشتەکی و، دو لاشیپانە، دیارە ئەم جۆرە هەڵبەستە زۆر بێ ئەرک و، هاسان و، سووکە،چونکو هەر دو کوتە کەی بە یەکەوە هاو دەنگن، هەربەم هۆیەشەوە، ئەم وێنە هەڵبەستە لەوانی تر پترەو، زۆرتر. هۆنراوەی پێ ئە هونرێتەوە.

دو هەڵبەستی:

دو بەیتی،یان چوار خشتەکی. ئەم جۆرە هەڵبەستە خاوەنی چوار لاشیپانە یە و، بە هەر چواریان مەبەستێک ڕا، ئەگەیەنن. لەباری هاو، دەنگیشەوە کوتی یە کەم و، دو هەم و، چوارەم. هاو دەنگی یە کن، لە کوتی سێهەما، هۆنەر، سەر، پشکە ئەویش بکاتە هاو دەنگی کوتە کانی تر. یان. نا، وێنەی ئەو، چەشنە هەڵبەستە لە زەمانی ساسانیدا. فرە بۆوەو، ئێستاش زۆربەی گۆرا نییە کانی کوردی هەربەم شێوەیە ئە گوترێن.

چووارینە:

یان روباعی. ئەو شێوە شێعرەش لەباری هاو، دەنگیوە، هەرچوار خشتەکی یە، بەلام. لەباری کێشەوە خاوەنی ۱۲ بڕ گە یە.وە، حەتا دە گاتە بڕ گەو، قۆرتی دە هەم، پێویستە بڕ گەی کورت لە بە رامبەری کورتاو، درێژ لە بەرامبەری بڕ گەی درێژا، دابندرێ، بەلام بڕ گە کانی یازدە و، دوازدە ئەشێ هەر کیان درێژ

بن،وه ک کێشی لا حولَ ولا قوة الاّ باللّه: که واته چوار خشته کی له ته ک دو هه ڵبه ستیا له لانی هـــاوده نـگـــیۆه، وه ک، یه ک وان، به ڵام له لانی کێشه وه پێکه وه تۆفیریان هه یه، وێنه ی دو هه ڵبه ستی، وه ک هۆنراوه کانی بابا طاهیری هه مه دانی وینه ی هه لبه ستی چـوواریـنه ش وه ک هه ڵبه سته کانی عومه ری خه یّام و، هه ڵ گه ڕاوه ی ماموستا هه ژار.

قه طعه: یان پارچه:

له چه ن هه لبه ستێک، پێک دێ که پێویسته ئه م مه رجانه ی خواره وه.ی تێدا، ڕه چاو کرابێ (١) ئه شێ ته نیا دوله ته هه لبه ستی دوایی نه بێ هه ڵبه سته کان به یه که وه هاوده نگ بن، که واته له تی یه ک و، دو، یان سێ و، چوار، هه روه ها تا، ئه گاته دو کوته که ی دوایـی، ده کـری، پـێـکـه وه هـاوده نـگ نـه بـن (٢) پێوێســـه هه مو هه ڵـبـه سـتـه کـان سـه بـاره ت بـه، بـابـه تـیـک بـدوێـن (٣) ژمـێـڕه ی هه ڵبه سته کان ناشێ، له دو وان که مترو، له شازده ش پتر بن. به ڵام هیندێک جار به پێی نیاز بۆ باشتر ڕون کردنه وه و، نیشان دانی مه به ست و بابه ته که ده کرێ، ژمێره یان بگاته، په نجا، شێصت هه ڵبه ست

مو سه مّه ط:

یان ملوێنکه ی مرواری. ئه م چه شنه هه ڵبه سته یه که له چه ن به شی چـوک پـێـک هـاتـبێ و، هـه مـویـان لـه کـێش و، ژمـێـره ی، کـوتـه هه ڵبه سته کانا وه ک یه ک وابن، به ڵام، هه مویان پێکه وه، هاوده نگ نه بن، واته پێنج کوته کانی هه وه ڵ به یه که وه هاو.کێش و، هاوده نگن، به ڵام کوتی، شه شه م، ده گه ڵ ئه وه شا. له ته ک له تی پێنجه ما، هاوکێشه هاوده نگ نیێ یه، دیاره به شی دو هه میش هه ربه م

جۆره یه، واته هه رپێنج کوته کانی به یه که وه هاو کێش و، هاوده نگن به لاّم کوته شه شه که ی ده گه ڵ ئه وانا هاو ده نگ نیّ یه، به ڵکو، ده گه ڵ کوتی شه شه می به شی به رودا، پێویسته هاوده نگ و، هاو قافیّه بیّ، هه روه ها تا، هه موبه شه کان کوّتلیان دیّ، ئه وه ش بیژّین، هێنڎیک جار، کوتی به شێک له به شه کان. هه ڵبه ستی چوا رینه ن، بریّ راش پێنجینه. که میّک ئه ردیش شه شینه ن واته (مُرَبّع) مخمّس (مُسدّس) دیاره ئه وکاته موسه مّه طه که ش هه ر به ناوی ئه م به شانه وه، ناو، ئه بریّ (موسه مّه طی، موربّه ع، مخمّس، مسدّس)

**ته رجیع به ند: یان سه ربه ندو، بۆ گیرّانه وه.**

ئه م چه شنه هه ڵبه سته ش له چه ند به ش هه ڵبه ست پێک دیّ. هه ربه شێک ده گه ڵ به شه که ی ترا، هاو کێشن، به لاّم، هیچ به شێک، له ته ک ئه وه که ی که دا هاو، ده نگ نین به لاّن، پێویسته کوتی هه وه ڵی هه ربه شێک ده گه ڵ هاو جوت و، لینگه که ی خوّیدا، هاو ده نگ بیّ. له کوّ تایی هه ربه شێکا دو «میصره ع» واته دو لینگه هه ڵبه ست که پیان ده گرتریّ به ر به ست و، سه ربه ند، ده هێندریّ، دیاره ئه م دوانه له ته ک لینگه ی هه ڵبه سته کانی پێشه وه دا، هاوده نگ نین. ئه و دو لیینگه یه له دوای هه.مو به شه کانا، دوپاته ده کرێنه وه.

**ته رکیب به ند: یان لێک دراو:**

ئه ویش هه روه ک، ته رجیع به ند وایه، ئه وه نده نه بیّ، هه ڵبه سته. سه ربه نده که، واته ئه و دو لیینگه ی ئه بێته. سه ربه ندی به شه کان. لیرّه دا دوپاته نا کرێته وه به ڵکوهه ر، به شه. خوّی به سه ر به ستی و، ئازادانه ده برّ یّته وه.

**موسته‌زاد: یان پێی هه‌ڵپه‌سێراو:**

ئه‌وه‌یه له‌تێک هه‌ڵبه‌ست ئه‌خه‌نه شوێن هه‌ر لیینگه هۆنراوه‌یه کی پارچه هه‌ڵبه‌سته که‌وه دیاره ئه‌م له‌ته هه‌ڵ په‌سێراوانه خۆیان به‌یه که‌وه، هاو، ده‌نگن، به‌ڵام، له‌ته‌ک ئه‌و لینگه، هه‌ڵبه‌سته‌ی پیێوه‌ی هه‌ڵ و اسراون، هاوده‌نگ نین، ئه‌مه‌ش ڕۆنه ئه‌م جۆره هه‌ڵبه‌ستانه له‌ڕاستیا، سه‌ربه خۆنین. به‌ڵکو، به‌جۆره فیڵ و، ته‌ڵه که‌یه‌ک به هه‌ڵبه‌ستی تره‌وه، هه‌ڵا وه‌سراون و، پیێیان ئه‌لێن هه‌ڵبه‌ست.

**غه‌زه‌ل: ته‌شی ریسی یان ئه‌وینداری و، نۆ گربی:**

برێتیێ یه، له‌چه‌ن هه‌ڵبه‌ستێکی هاو کێش و، هاوده‌نگ. که هه‌مویان سه‌باره‌ت به جوانی، دڵرفێنی، نۆ گری و، ڕاگه‌یاندنی ده‌ردی دوری، بڵیسه‌ی ئا گری به‌تینی جیایی. مه‌ینه‌تی لێک جۆی بونه‌وه، پێک نه گه‌یشتن. تامه‌زرۆ، تا سه‌ی دیداری ئه‌وینداره، ڕاز اندنه‌وه‌ی خوو، خده‌و، قه‌واره‌ی، دڵبه‌ر، ده‌د، وین و، ئاخه فتن ئه که‌ن؛ دیاره زۆر که‌سیش، واتا گه‌لی، فره جوان و، به‌نرخی خواناسی ئه‌خه‌نه ناو چوار چێوه‌ی غه‌زه‌له‌وه‌و، له‌م مه‌یدانه‌شا به سه‌ر به‌رزێوه له‌ئه‌زمون هاتونه‌ته ده‌رێ. له غه‌زه‌لائه‌م تایه‌به‌تانه‌ی خواره‌وه ده‌به‌رچاو، ئه گێرین (۱) هه‌ردوک لیینگه هه‌ڵبه‌سته که‌ی پێشه‌وه که روانگه‌ی (مَطْلَعی) پێ ئه‌وترێ، پێویسته ده گه‌ڵ هاو، لیینگه‌ی دو هه‌می جوته کانی ترا، هاوده‌نگ بن (۲) هه‌ڵبه‌سته کانی غه‌زه‌ل ناشێ پێوه‌ندی واتایان به‌یه‌که‌وه هه‌بێ، واته هه‌ر هه‌ڵبه‌ستێک ئه بێ خۆی له‌لانی واتاوه، ته‌واوو، سه‌ر به خۆ بێ (۳) ژمێره‌ی هه‌ڵبه‌سته کانی له حه‌و ته‌وه تا سێزده‌یه؛ به‌ڵام هه‌ێندێک

کەس تا ژمێرەی سییان بۆ غەزەل دا ناوە، کەواتە لە حەوتەوە.
تاسییٚ یە:

**قەصیدە: یانکا کلی پڕٚ:**

چەشنە هەڵبەستێکن لەباری کێشەوە، لینگەی یەکەم و، دو هەمیان لە گەڵ لینگەی هاو جوتی هەڵبەستەکانی ترا، هاودەنگن، لەباری واتاو، بابەتیشەوە، بۆ، پەسند کردن، توانج و، ڕەخنە و سەر کۆنە کردن سەرەخۆشی و، جێژن، سەر کەوتن و، زاڵنامە، شەڕو، شوور، سکاڵا. شانازی، خۆهەڵ کێشان، ئازایەتی و، جوامێری، نەترسان و، بوێری، کۆ تەڵ ڕازاندنەوەو، شین گێڕی باسیی خوو، خودەی جوان و، ناحەز کردن، گلەیی و، گازندەو، شتی تری وا، دە کار، ئەهێنرێ و، دەهو ندرێتەوە. لانی کەمی ژمێرەی هەلبەستەکانی سێزدە(١٣) یە، لانی ناوەندیان بیست (٢٠) تا هەشتا (٨٠) یە، لانی هەرە زۆریان، تا صەدو پەنجاو، (١٥٠) بان ترە بەڵام هێندێک کەس سنورێکیان بۆ ژمێرەی هەڵبەستی قەصیدە، دا، نەناوە،

**حوسنی مەطلەع: یانٚ ڕۆانگەی جوان.**

هەروەک باسمان کرد یەکەمین هەڵبەستی قەصیدە کە هەردوک لینگەکانی پێکەوە، هاو دەنگن، روانگەی پێ ئەو ترێ برێک جار، هۆنەر، لەنێوان هەڵبەستە کانیدا، دانەیەک، هەڵ ئەبژیرێ و، دەیکاتە روانگە، دیارە هەرچی ئەم روانگەیە، سەرنج ڕا کێشەرو، رازاوەتر بێ بیسەرو، گوێ دێرو، خوێنەرەوە باشتر بۆ لای خۆی را، دە کێشی و، بۆ بیستن و، خوێندنەوەی چاکتر مرخ خۆش دە کا. هەربەو، هۆیەوە، هۆنەرەوە کان بۆ ڕاز اندنەوەی

ڕوانگەی غەزەل و، قەصیدە تێکۆشاون و، چەن هونەری دەسکردیان بنیات ناوە، بە ناوی حوسنی مەطلەع کە باسکرا، (تەشبیب) واتە. وەبیر هێنانەوەی کات و، ڕۆژگاری لاوی (تەغەزول) واتە، تەشی ڕستن و، پێدا، هەڵ گوتن، هێندێک هۆنەر لە هەڵبەستەکانی خۆیانا، بەر لەوەی بێنە سەر باسی مەبەستی بنەڕەتی، پێشەکیێکی. ڕێک و، پێک و، جوان. دێنن، بۆ ئەوەی بیسەرو، خوێنەرەوە، وە جۆش بێنێ تا، باش بنو، بیستن و، خوێندنەوەی مەبەستەکە، خۆی ئا مادەکا، جا ئەگەر ئەم پێش ووتارە (بەر لە، ڕاگەیاندنی مەبەستەکە) سەبارەت بە، بەهارو، خەزان. یان خوو، خەسڵەتی سوروشت. سکاڵای ئەوین و، دڵبەرو، دڵدارو،شتیوابوو،ئەوەپێیدەڵێنتەشبیب،ئەگەرهاتوو،باسی کامڕەوایی ئەویندارو،پەسندیئۆگرو، پەسند کراوەکەشیبوو،پێی ئەوترێتەغەزولو،تەشی ڕستن (تەخەلوص) یان خۆڕەزگار کردن، بریتیێ یە،لەم تەغەزول و، تەشبیبە، کە هۆنەر،زۆر بە ئارامی و،لەسەرە خۆ بێتە،سەر،مەبەستە بنەڕەتیەکە.

**حوسنی إعتیذار: یان عوذر هێنانەوەی جوان.**

ئەوەیە هۆنەر، پاش تەواو، کردنی قەصیدەکەی. کە بە خەیالی خۆی نە یتوانیوە، پلەو، پایەی ئۆگرو، پەسند کراوە پێدا هەڵ گوتراوە کە،بەباشی ڕاگەیەنیو. ئەوەی شایان ئەو بووە، بیدرکێنێ، عوذرێکی جوان و، لەبەردڵ شیرینی بۆ دێنێتەوە.

**شەریطە: یان مەرج دانان.**

ئەوەیە، لەم جۆرە قەصیدانەی بۆ پەسند کردن. دا، دەنرێن، هۆنەر،زۆربەی هەڵبەستەکانی بە نزاو، پاڕانەوە،کۆتایی دێنێ و،

ئارەزوی لەش ساغی و، درێژی تەمەنی تۆ گرو، پەسند کراوە کەی، دەخاتە قالب و، بیچمی مەر جەوە، وەک ئەوە بڵێ، تا ڕۆژدێ و، دەچێ تۆ، هەر، بمێنی

**حوسنی مەقطەع: یان، جوان بڕینەوە.**

ئەوەیە. شاعیر بۆ ئەوەی تام و، چێژی هەڵبەستەکانی، لەدەم و، مێشکی بیسیار، دا بمێنێتەوە، قەصیدە، یان غەزەلەکەی خۆی بەچەن هەڵبەستی جوان ئەڕازێنێتەوە، کۆ تایی، پێ دێنیێ.

**إرتیجال بەدیهە: یان گوت و، بڕ.**

بەم، پەخشان و، هۆنراوەو، نامەیە، ئەو ترێ، بۆ، نووسین و، دانانیان لەبەرا، بیر، نەکرا بێتەوە، دیارە ئەم، هونەرە، بۆ پیاوی دەمەوەرو، نو سەرو، هۆنەر. شتێکی گەلێک بەنرخە.

**تەضمین یان تێک هەڵکێشان:**

ئەوەیە، هۆنەر، هەڵبەستێکی خۆی، یا، هی هۆنەرێکی تر، تێکەڵاوی هەڵبەستەکانی خۆی ئەکا، بێ ئەوەی ئاڵو، گۆڕێک لەکێش و، دەنگی هەڵبەستە خوازراوەکەدا، بەدی بێنێ، زۆر جاری وا هەیە. ناوی خاوەنی هەڵبەستەکەش دێنن.

**رەدوصەدری علی العجز: یان گلکەوەسەر کردنەوە.**

ئەوەیە، ئەم ووشەی کەو تۆتە، کۆ تایی کوتی یەکەمی هەڵبەستێکەوە، بخرێتە، هەوەڵی کوتی دو هەمی هەمان هەڵبەستەوە.

ردُّ العجز على الصّدر: یان سەر وەکلکە، کردنەوە.

ئەوەیە، هەرئەم ووشەی لەسەرەتای کوتی یەکەمی هەڵبەستەکەدا، هاتۆوە بخرێتەوە کۆتایی کوتی دو هەمی هەڵبەستە کەوە.

ردُالمطلع: یان دوپاتە کردنەوەی ڕۆانگە.

ئەوەیە لینگەی یەکەم، یان دو هەمی هەڵبەستە، سەرە تاییەکەی غەزەل، یان قەصیدە بۆ جوانیو، ڕازاندنەوەی هەڵبەستەکان. دو پاتە کرێتەوە.

## قافیێەو، پیتەکانی:

قافیێە‌یان کلکەی هەڵبەست، بەم پیتانە، ئەوترێ، کەلە کۆتایی و، پاشەڵی هەڵبەست یان، لینگە هەڵبەستەکانا دوپاتە، ئەکرێنەوە، دیارە پیتی قافیەش سێ جوورن (۱) ئەوانەی لە هەموبارێکی، قافییەدا، پێویستە دو پاتە کرێنەوە، کەپێیان ئەوترێ ڕەوێ. یان (گوریس و، شورکەی بارپێچان) ڕونە، کە ئەم پیتانە دە کەونە کۆتایی پیتەبنەڕەتەکەی قافییەوە بۆ، وێنە هەرکات ووشەی هەواڵ و، گەواڵ، شەماڵ و، خەیاڵ، ببنە هاو، قافییە، پیتی (ڵ) ئەبێتە ڕەوێ. (۲) ئەوپیتانەن کە هێندێک جار، بەشوێن ڕەوێدا، دین (کە دووا، هەمین پیتی قافیێە) وەپێویستە دوپاتە کرێنەوە، ئەمانەش بریتین لە پیتی وەصڵ ـ خرووج. مەزیدو، نایەرە: (۳) ئەو پیتانەن کە، ئەکەونە، پێش، پیتی ڕەوییەوەو، بریتین لە، قەید، رِدف ـ تأسیس و، دَخیل کەواتە پیتی قافییە، بەگشتی نۆ، دانەن، وەک ڕابراو، منیش لەم هەڵبەستەم دا، هێناومن،

قافیێە خۆی یەک پیتەو، هەشتەکانی تر. وەچەن

چوار، لە پێش و، چوار، لەدواوە، پێت ئەڵێم هەرکامە چەن

پیتی: قەیدو، ڕیدف و، تەأسیس و، دەخیل.

وەصڵ و، دەرچون و، مەزید و، نایرە بێ قال و، قیل

وا، ئێستاش هەر کامێکیان بە کورتی باس ئە کەین:

**قافیێە دو جورە: سەربەست و، گیراو:**

گیراو، ئەوەیە بە شوێن پیتی ڕەویدا. پیتێکی تر، نەیەو، رەوێکەش خوێ زەنەدار بێ (ـُـ)، قافیێەی سەربەستیش، ئەوەیە، بە شوێن پیتەڕەوێکەدا،یەک،یان، چەن پیتی ترێبێن، دیارە ئەشێ ڕەوێکە لەم حاڵەتەدا ساکن و، زەنەدار نەبێ، بەڵکو، مُتَحَرِکْ واتە خاوەن جوڵەو، بزوێنە،ئەم جوڵەو، حەڕە کەتەش وەک گوترا. یەکەمین پیتی دوای رەویَ یەکە، کە پێی ئەوترێ (وەصل) کە پیتێکی بێکارەیە، دو هەم خرووج: واتە دەرچون: سیهەم مەزید: بێ کەلک: چوارەم نایرە: سڵ و، ڕەوەک: وێنەی هەمویان لەم هەڵبەستە فارسیدا هەیە:

بکویش گوهر نایاب دل گم گشته جویمش:

بدامن خاک بر داریم و،زاشک دیده شوییمش

جوییمش، شوییمش: (و) پیتی ڕەویَ (ی) دو هەم،خروج (م) مەزید، (ش) نایرە.

وەک ڕامان گەیاند، یەکەمین پیتی - پێشی ڕەویش پێ ئەوترێ (قەید) یان بەندو، پێوەند، ئەگەر ئەم پیتە، واوی

خاوەن بوورو، (ـُو ـو) یەی ژیردار (ـیِـ) یان ئەلفی سەردار (ـَـ) نەبێ، دیارە زەنەدارە (ـْـ) و، پێی ئەگوترێ قەید. بەڵام ئەگەر. واوویێی و، ئەلفی باسکراو، بوو،پیێی دە گوترێ (ڕیدف) یان شوێن، کەوتوو، کەواتە. واوو، ئەلف ویێی جو لەداری پێش رەوی ئەبنە ردف **تأسیس: یان، بناغە.**

بەو ئەلفە ئەوترێ کە، دە کەوێتە پێش پیتی یە کـەمـی بەر پیتی ڕەویَ وە، واتە کاتێ دو پیت ئە کەونە بەر ڕەویَ یەوە، ئــە گــەر یــە کــەمــە کە یان ألف بوو، بــەم ئەلفە ئە گوترێ تأسیس وەک ئەلفی کامل و، عادل لەم هەڵبەستەدا،

دارای جـهـان نـصـرت دیـن خـسـرو کـامـل
یـحـیـی بـن مـظـفّـر مـلـک عـالـم عـادل

دیارە،دەبەرچاو گرتنی تأسیس لەقافییەدا، پێویست نی یە

(دەخیل) یان خۆ تێرا کردوو،

بەم پیتە جوڵەدارە ئەوترێ،کەلە، نێوان ئەلفی تأسیس و، پیتی ڕەویَ دا، جێی ئە گرێ. دیارە دەبەر چاو گرتنی جوڵەی پیتی دەخیل لەقافییەدا پێویستە. بەڵام دەبەرچاو نە گرتنی خودی دەخیل گـرینگ نی یە، دە گەڵ ئەوەشا،ئە گەرسەرنجی بدرێتێ و، لانی دە بەرچاو گرتنی ئەویش بگیرێ باشترە:کەواتە ووشەی. داوەر و، صابیر نابنەها و قافیەی یەک، بەڵام، شامل و، مـسائل بە یە کەوە، ئەبنە هاو قافیە.

## کەم و، کووڕیی قافیە

(١) عەیبی هەرە گەورە و، بنەڕەتی قافیە، دەبەر چاو نە گرتنی، هەرکام لە پیتی قەیدو، ڕیدفو، وەصڵ و، خروج و، مەزیدو نایرەو، بەجێی نەهێنانی جوڵەی هاو شانی بەر، لەوانە یە، هەڵبەت جوڵەی پێش ئەلفی تأسیسیش کە هەمیشە سەرە (ـَ) ئەشێ دەبەرچاو بگیرێ. ناوی ئەو جوڵەو، بزوێنا نەش ئەمانەن. هی پیتی دەخیل پـیێ ئە گوترێ إشباع، واتە، تیر کردن. جوڵەی پێش پیتی ڕیدف پێی ئەڵێن (حەذو) واتە لاسا کردنەوە، هی قەیدیش هەرواسە.

جوڵەی بەر، رەویش نەوجبە، واتە ڕێگە رونکەرەوەی پێ ئێژن جوڵەی خودی ڕەویە کەش موجری، واتە بە ڕێورە بەرو، هی‌پێش خروج و، مەزید و نایرەش پیان ئەوترێ نفاذ، واتە پاڵێو، راوە

(٢) إیطاء، یان پێ کوتە، ئەویش بەوە ئەوترێ کە، قافیێە کە، دوپاتە کرێتەوە، ئەمەش دو جۆرە: بە کەم، خۆیاو، ئاشکرا، دو هەم پیوارو، شێراوە، ئاکشرا کە، ئەوەیە دوپاتە بونەوەی قافیێە کە، بە باشی دیار بێ، شێراوەش ئەوەیە بە باشی دەر، نە کەوێ بەڵکو پاش سەرنجدان و، تێ فکرین، دوپاتە بونەوەی قافیێە کە، دەر ئە کەوێ، وەک. ئاوو، گوڵاو:

(٣) شایەگان، یان بێگاری و، کاری خۆڕایی: ئەویش ئەوەیە، ڕێ و، شوێنی تایەبەتی زمانێک، بێنی، بە سەر زمانێکی بێگانەی ترا، بسەپێنی؛ وەک ئەوە ئەلف و، نونی بکەری دو کەسە، یان واو، نونی کومەڵی عەرەبی «واتە، مثنی و، جمع» بە، بە ڕووشەی کوردیا کەی و، پاشان بیانکەیە، هاو قافیێەو، پاشکۆی یەکترە کوتایی باسە کە بەم دو مەبەستە دێنین

مورەدەف: یان وەشوین، خراو، لە پاش تەرک سوار کراو.
بەم چەن ووشە سەربە خۆیە ئەڵێن کە بەشوێن قافیێە کەدا، دێن و، پێویستیشە لە هەڵبەستی خاوەن ڕەدیفا، دە بەرچاو بگیرێن؛ وەک ئەم هەڵبەستەی. سەعدی شیرازی:

تن آدمی شریف است بجان آدمیّت
نه همین صورت زیباست نشان آدمیّت

لیرەدا جان و نشان ووشەی قافیێە کەن آدمیّتش ڕەدیفە
ذوْ قافیین: یان خاوەنی دو جورە قافیێە: ئەویش بەم جۆرەیە،

هەر کاتێ. لە دوو ووشەی کۆتایی هەڵبەستا،یان لە ئاخری دو، لا دەرگانە کانی شێعردا، دو قافیێە ڕەچاو کرابێ. ئەڵێن دو قافیێەی هەیە وەک ئەم هەڵبەستە:

دل در سر زلف یار بستم÷وز نرگس آن نگار مستم:که یارو نگار، هەروەها بەستەم و، مەستەم بە یە کەوە قافیێەن؛یان، هۆنەر لە پارچە هەڵبەستێکا چەن چەشنە قافیە یەکی، دە کار هێنا بێ، بەم جۆرە، هەر هەڵبەستیک یان چەن هەڵبەست خاوەنی قافییەک و، ئەوانی تریش قافیێەکی تریان هەبێ:کا لەم دژاو، چم پێ نەبڕا خۆینەرەوەی بەڕێز ئەوەی لە باری کێش و، قافییەدا، پێم وا بوو، پێویستە. لێرەدا، هێناو مە، جاتۆش پێت باشە یان خراپە، کە یفی خۆتە:

کات ژمیری ١٢/٥ ی. ڕۆژی یەک شەمۆی ساڵی ١٣٦٧ ی هەتاوی؛ واتە ڕۆژی بەر لە نۆی بونەوەی نەو ڕۆژ،لە نوسینەوەی ئەم پێشەکیەی دیوانی شێخ ئەحمەدی کوڕ بوومەوە؛هیوایە جێگای کەلک لێوە رگرتن بێ.

**مەلاعەزیز داشبەندی (محمّد پور) شاری،تاران.**

١٣٦٧/١٢/٢٨ هەتاوی

١٠/شەعبانی ١٤٠٩ ە ق

١٩ ی مارس ١٩٨٩ زایەنی

٢٨ی ڕەشەمەی ٢٠٦١ کوردی

## پیتی ئه لف: ئه هۆی مه یگێڕ

### پێنجخشته کی شێخ ئه حمه دو، خواجه ی شیرازی

شه وو ڕۆژ . بێ قه رارم، ئەمز، لەعیشقی ڕوویی نەو، گولها
ده کەم، طەی چوۆڵو، بەیدو، بەر . بەناڵین شیبهی بولبولها
له قه یدی زولفی تۆ ئه یمه ن نییه، مه جنون و، عاقلها
اَلا یـا اَیـهَا السـآقی اَدِرْ کـأساً وَ، ناوِلـهـا
کـه عشق آسان نمود اوّل ولی افتاد مشکلها
له شکڵی تۆ، له ڕوی ئه رضێ نه هات و، که س نه می ئایه د
له بۆ عوشاقی دڵ مه حروق. طه بیبی چون تو، که ی ئایه د

تێ بینی: له هیندێک نووسراوه دا. ئه م له ته هه ڵبه ستانه ی خواره وه به م جوره بون. له جێی.

لـه قـه یـدی، زولـفـی تـۆ — بـه قـه یـدی زولـفـی تۆ مـه سـتـم نـیـه م مـه جـنـونـی عـاقـلـهـا
لـه شـکـڵـی تـۆ لـه ڕوی — له شکڵت که س له ڕوی ئه رضێ نه هات و، هه م نه می ئایه د
له بۆ عوشاقی دڵ مه حروق — لـه بـۆ عـوشـاقـی دڵ مـه حـزون حـه بـیـبـی
لـه نـه سـلـی ئـادەم و... — کـه چـون تـو، نـور چـنـیـن زایـه د
هه مو عاله م له شه رق و... — نه هه ر که س عاشقی او شود زدین ودل که دست شویه د

نه ده ر دونیا، نه ده ر عوقبا به جوز تو خمی موحبه ت ده ر دلی او هیچ نه می رویه د

دڵـت چـون لـه سـه رناچز، — لـه سـه ر مـه چـوز، واتـه: چـوزوی پـێـوه دان هـاتـوۆه

لە نەسلی ئادەم و، حەوآ، حەبیبی چون تو، چون زایەد
بە بوی نافۂ کآخر صبا زان طرّہ بگشاید
زتاب جعد مشکینش چە خون افتاد در دلها
هەموو ،عالەم ،لە شەرق و ،غەرب ،لە بەحرو ،بەر .فیدای ڕویەت
جەمیعی کافرو، ئیسلام. بە فیدیەی قەدّی دڵجویەت
تەمامی ئەهلی عوشّاقان، قەتیلی قەوسی ئەبرویەت
بە می سجّادہ رنگین کن،گرت پیرمغان گوید
کە سالک بی خبر نبود ، زراہ و، رسم منزلها
دەڵێم بەو نەرگسی ،چاوان ،ئیمان و ،عەقڵ و ،دین بوردەم
لە داخ و، حەسرەتی جانان، زیاد بو، میحنەت و، دەردەم
وەکو، شەمعێ بە سۆزو، گڕ، وەکو، پەروانە بی پەردەم
مرا در منزل جانان چە أمن و،عیش چون هردم
جرس فریاد میدارد کە بربندید محملها
لە وێ روژێ کە تۆ، خولقّای هەمو، عالەم، بە تۆ مایل
دەکەن، ئەرجوو، تەمەنّایە، لەدەرگاهت وەکو، سایل
چموشتاقن ببینن ڕوی تۆ، بێ پەردە و، حایل
شب تاریک و بیم موج و گردابی چنین هایل
کجا دانند حال ما سبکباران ساحلها
فیدایی قەدّی نەو، طەرزت، ڕوحی من ئەی شەهی نادر
کە پێ خولڤاند ، لە نوری خۆی قەدیم و، قەیّوم و، قادر
عەجەب ،نەقش و ،نیگارێک بوی ،لەڕوی عالەم کە بوی ظاهر
همە کارم زخود کامی بە بدنامی کشد آخر
نهان کە ماند آن رازی کزو سازند محفلها
ئەلائەی (ئەحمەدی کوری) ذەلیل و، خەستە، تەن عاجز
لە داخ و، حەسرەتی جانان مەلول و، مات و، گەردن کز

دڵت چون خانه یی زه نبور. عه قاریبان له سه ر، نا ، جز
حضوری گر همی خواهی از او غائب مشو حافظ
مَتیٰ ما تَلْقَ مَنْ تَهْویٰ دَعِ الدّنیا وَ أَمْهِلْها

ب

۱

## ئه ی شه هی لَوْلاکَ لَوْلاکْ

دڵبه را ، په ی ڕۆی فیراقت، دڵ ده ناڵێ چون ڕوباب
به و ،دو ،ئه برۆی میشلی طاقت به ندی جه رگم بون، که باب
بوو، به بریان توێی ده رونم چاوپڕ ئه سرین ته ن زه بونم
مه جنون ئاسا . بوت جنونم لیێم حه رام. بوو ،خوردو ،خواب
خواب و، خوراکم گرینه، (رَحْمَةً لِلْعالَمینَ)
روحمێ، کهٚ به منی حه زینه، با کوٚتا، بیٚ ئه ؤعه ذاب
با کۆ تا بیٚ. داخ و، ده ردم، ناڵه ناڵ و، ئا هی سه ردم

---

تیٚبینی (۱) له هێندێکنوو سراوه کاندا له جیێ ئه م هه ڵبه سته ی دوایی، ئه حمه دی کوری...

هه ڵبه ستی: ئه ی شه هه نشاهی جه لیله. ئه حمه دی کوری ذلیله

دامه نی گر توی ده خیله، ئه یخه یه سه ختی و، عیتاب: هاتووه

(۲) له بزێک نوسراوه دا ، له جێگه ی ئه نبیایان تۆی خاته م. ئه نبیا راگه شتی خاته م هاتوه

(۳) له نوسراوه یکدا. له بری: وا به عیشقی تۆ سوتام هه روه کو، کوێ طور به تاب واله عیشقی تو... که وتمه حالی اضطراب. هاتووه ـ

شیبهی بارانی بەهارێ دائیمەن، لەیل و، نەهار
دائیمەن، ئەز، هەردە نالم، جان و دڵ وەک کوێ زوخالم

کوشتەیی دوبروی هیلالم، ئەی گوڵی ئەغیارو، یار
ئەی گوڵی یارو، عەزیزان دەردی عیشقی ژو، تەمیزان

نایەتە کێشان و، میزان، نییە بە میزان صەد هەزار
خاریج ئەز حەدو، میزانە، تیرلە جەرگ و، کەزەبانە

دڵ ئەوا، وەحشی و، نەزانە، یارە صاحەب ئیختیار
هەرکە، صاحەب ئیعتیبار بێ، مەقصەدی وی دینی یار بێ

ئەو لەسەر، قەول و، قەرار بێ، زو، دەبێتن ژەستگار
ئەحمەدی کور تۆش لەوانی، دات بەبات عومری جەوانی

ئاخری. دونیات نەزانی، چون دەبێتن رۆژگار

# ٢

## دەڵێن

### ئەورۆ. بەهارە

مەکەن، مەنعی عاشقان، عاشق، کاری، دیژەوارە
هەرچی، عیشق، لە دل بێی، بێ صەبرو، بێ قەرارە

دائیم، لەبەر، هیجرانێ، رەنگ زەردو، لێو، بەبارە
دە، عیشقێدا، سوتاوم، غەمم، لە چوار، کەنارە

لەبەر، دەردو، حەسرەتان، گریانم دێن، هەزارە
گەلۆ، دەردان، ئەز، هەڵگرت. ساتێ ناگرم. قەرارێ

شەوو، روژێ ناصەبریم، لەبەر غەمی، دەیارێ
دڵی من، هێند، لەجۆشە، ئەسرینم، دێنە خوارێ

ـە گین، بەوەی ساکیت بێ، ببێن دەنگی، بەهارێ
**بـە گـوڵانـم، دێن صـەبوری، سـەر، بـینـە دەر، لـەخـارێ**
مـز گـێـنـی، بـێ لـە یـاران. دەلێـن ئـەورۆ، بـەهـارە
هاتن، طەیری دە، ڕەنگین، جوت بەجوت بون، قەتارە
نـیشـتـن، لـە دەم، شـەتـاوان زەینـیکـە، چـەن هـەزارە
ڕەنگاندنیان، قوپی و، شەت، لە هەر گۆشەو، کەنارە
**گـوڵ هـاتـنـە پێـکـەنـینێ. نـە، یـەک، نـە، چـەن هـەزارە**
هـەوری دەڕەش دەهـاتـن، گـرتـیـان بـەری، ئـاسـمـانـێ
غەمی، لەدڵم، چەن زۆرن، بابرۆن، دە گەڵ، ئەستانێ
لـە گـورەی دە، شـەمـاڵـی. لـەڕێـژنـەی، دەبـارانـێ
کوێستان، ما بون، لە تەمێ. هەوەڵ مانگی نیسانێ
**بـە سـروەی دەشـەو بـایـە. گـوڵ خـۆی داوە، لـە سـانـێ**
هـەوری ڕەش، هـاتـنـە خـرۆش، لـەدامێـنـی، کـۆسـاران
چـیـاو، زۆزان. سـەوزە، پۆش. دە گـەڵ لـکـی، دەداران
وەنەو شەم، چەن ظەریف دین، گولاّن، لە دمڕو باران
بە کەسک و، سور، دەخەملێن، لە سەر، جۆ، جۆباران
**دەلێـن ئـەورو، بـەهـار هـات. مـز گـێـنـی بـێ، لـە یـاران**
لە کۆیـستـانـی دەعەظیم. هەوری ڕەش دە[1] خـرۆشـن
بـە، نـەخـشـی دە، بـەهـارێ گـولاّن، زەڕ بـافـتـە، پۆشـن
هەر، وەکو، ئاهوی چینێ. صەحرا. میسکێ دەفرۆشن
لـەشـادی. دە بـەهـاری، چـەن، لـە ذەوق و، لـەجـۆشـن
**کـیـۆو، دەرو، دوڵ و، دەشت. پاکی، سـەر مـەست و، خۆشـن**

---

١. دەخروشن. نەجولینەوەو، لە هاتو چۆدان دەرخروشن. لە حالتی خروشاندان واتە نەگەر دە بێ پێشگری کردەوەیەو، لەجیگای (می) فارسی یەو، بوزەمانی حالەنەگە دەر بێ ووشە فارسیەو، واتای حالەتی پیدەدا، نەک کردەوە:

زەینی خوم دا، کوێستانێ. چەندی، لێم کرد، خەیاڵە
گوڵ بون لەچوار کەنارێ. لێی شین ببون هەڵاڵە
زەردو، کەسک و، بنەفشە، سور گوڵ و، تافتەی، ئاڵە
لە بەر، بۆنیٛ وان ،گوڵان. یاران دەبون، بێ حاڵە
بولبول لە کوێیە، مەست بێ. بکا، ئەفغان و، ناڵە
لە کوێستانی دەوا، رەند، دڵی ئەزە، حەزینە
گوڵبون، لەدەم ڕوباران، جوان دەبون، بەپەر ژینە
بابێن گوڵان ببین هەر، کەس دڵی غەمگینە
ئەو گوڵی دە، دونیایە وەفایان بۆ، کەس نینە
خۆشی لە بو، وان کەسان دڵ بە دونێ خۆش نینە
ئەو، سوێسنەی ساوایە. تازە سەری هەڵ، دەدا
خاشخاشک و، گوڵە مێلاق. ئەطڵەسی سور، دەبەرڎا
وەنەوشە، پڕ جغارە، سەری، لە بەردێ، دەدا
بۆنی دەبا بای صەبا، بولبول بۆی لەخوێ دەدا
کاری دونیایە، وەیەهەر تاڵی یە، ویٛت دە دا
بە، لرفەی، بای شەماڵی بەسۆزی، دەشەو بایە
بۆنی گوڵان دەپڕژێن، تێکەڵ بون، لە صەحرایە
گوڵ، دەرکەوتن لە خارێ. دەریان. کردن، گەلایە
ئەو، گوڵی جوان و، ظەریف، بونە بەرگی، دونیایە
یاران مەدحی، بەهارێ هەرگیز، لە تاریف نایە
بەهار، هاتە سەر تەختێ. گوڵ پشکوتن، بەتاوە
تەرزی گوڵانم زۆرن، چەن تەرز،سوێسنی ساوە
موژدە، دەنە، بولبولێ ئەو عاشقی دڵ سوتاوە
ئەو دونیایەی وا، ڕەنگین وەفای بۆ کەس، نەماوە
چەند لاوو، جوانی پیر کرد. بۆ خۆی بەقیتی ماوە

بۆنی گولاڵن ئەز هەڵگرت، لەدەم، جۆو، سەراوان
هاتن طەیری گەرمێنێ، کەوتن، لەدم، شەتاوان
لەهاشەی دەشالورێ، گڕ، بەر بونە، هەناوان
فرمێسکم دێن بە جوتە، خوێناوم دێن، لە چاوان
لەحەسرەتی دە، یارێ. دەناڵم وەک سوتاوان
لە بەر، غەمی دەیارێ. شەوو، ڕۆژم خەو، نایە
چەن جوامیرو، سوار چاکن،کوچیان کرد، لەدونیایە
ئەحمەد، ئەتۆش ڕا دەبری، یار، بۆت دەکەن دوعایە
مزگێنی بێ لەیاران، جێن (جَنَّةُ آلْماوایە)
ئەو بەهاری بە، گوڵزار، بۆ کەس، دە، تاریف نایە

## ٣

## کوا، مُحَمّدْ ص ع شای مەدینە

دڵبەرا، دائیم دەناڵم دەم، بەدەم شام و، سەحەر
جارێ ناپرسی لەحاڵم چاو، عوقابی خۆش خەبەر
چاو، عوقابی مهەجەماڵی دوشمنی کوفرو، ضەلالی
نوری سیّری لایەزالی. کاشفی (شَقُّ الْقَمَرْ)
کاشفی قەمبەر، دونیمی شافیعی (یَومَ آلْآلیمی)
فاتحی دەرگای نەعیمی (أنتَ لی نَورُالْبَصَرْ)
تۆی، بینایی هەردوچاوم، بەفیدات کەم جیسم و، ناوم
هەڵگراوە خوردو، خاوم، خواردنم بۆ تە، زەهەر

سەرنج: دەگەڵ ئەوەشا. هەمو هەڵبەستەکانی (بەهارە) بەپیتی (ر) نابڕێنەوە بەلاّم لە بەر ناوی (بەهار) و، پینجینەکانی هەوەڵ کە بە (ڕێ) بڕاونەتەوە. لەپیتی (ر) دا، هێندراون

خواردنم کیێم و، زو خاوەصە برو، هۆشم لێی بڕاوە
ئاتەشی دڵ وا، بەتاوە. میثلی شەمعی نیۆ، فەنەر
وەک، فەنەر، دڵ پڕلە نارم، باری عیصیان بۆ تەبارم
ڕوسیاەو، شەرمە سارم، من لەبەر، (یَومَ الْخَطَرْ)
من لەبەر، یَومَ الْمَماتم، دێ کە، قابیض بۆحەیاتم
وا، خەجیلۍ بێ هۆش و، ماتم. نامێنێ هۆش و، خەبەر
نامێنێ هۆش لەو سەعاتێ. دەفتەری دونیام دەداتێ
ڕوح دە گـــاتە جێی نەهاتێ. نامێنێ مەیلی پسەر[۱]
نامێنێ مەیلی جیهانم، دێتە جونبوش، ڕوح و، گیانم
گەر، لە گیر لاچێ زوبانم، نێوی حەقمان دێتە بەر
نێوی حەق دێنین بەزارە، تەن ئەوەند، تەشنەو، بیمارە
دڵ هەمیشە إنتیظارە (هَلْ یجیی ماءُ القَطَرْ)
ئـــاخ لەبوۆە، یەک قەطرە ئاوە، لەودەمەی دونیا تەواوە
شاەو، دەرویێش توپە جاوە (قَدْ دَخلتُ فی الْقَبَرْ)
تا قیامەت قەبرە مالم، دین مەلائیک بۆ سوئالم
رەبی توێ موخبیر بەحالم، ئەم خەیە، سەر، زێی خەطەر
ئەم خەیە، سەر ڕێی هیلاکەت لیم دەپرسن زۆر بەشیدەت
(قالوُا مَنْ رَبُکَ) مەیێت کیت، پەرستۆتن پیغەمبەر
کیت پەرستوە کێێ إمامت، مەذهەب و، دین و، کەلامت
حەشرو، میزان و، مەقامت. بۆن بەیان، کە ئەو، خەبەر
بۆن بەیان کە سیری قەلبێ سا، خودایە، تۆم رەبی
ئەز بلیم (اَللهُ رَبی) دا، خەلاص بین لەو خەطەر
دا، خەلاص بین لەو، مەقامە، ئاخری دونیا تەمامە

---

۱. لەجیاتی (پسەر) (لەسەر) یش هاتووە:

جه معی ئومه ت خاص و، عامه، ڕاهی حه شریان دێته به ر
دەشتی مەحشەر وا ،دەبەستن،جوملە مەخلوق صەف دەبەستن

یه کهه زارساڵ،ڕا[1] ده وه ستن، که س لیمان ناکا،خه به ر
ناپرسێ که س لێن حه واڵه، ده شتی مه حشه ر دێته،ناڵه

ئاگرو، پۆلوو، زوخاڵە،نامێنێ حیلم و، صەبەر
نامێنێ عەلاج و، چارە، چەن هەزار،کەس بێ ژمارە

باب لە فرزەندی بیزارە، ئەو، لە بەر، تینی جەمەر[1]
ئەو لە بەر، گریان و، شینە، (قالُوا یارَبِّ رَضینا)[1]

کوا موحەممەد شای مەدینە،بۆچ لە مە،نابێ خەبەر
بۆچ خەبەردار نابێ لیمان سوت جەرگو،قەلبو،پێمان

یەک هەزار ساڵ،حەشرە جێمان کوا،حەبیبی ڕۆی جەشەر
کوا، حەبیبی کولی عالەم (ما تَقَدَّمْ قَبلَ) ئادەم

پاک لە مەحشەردا بووین جەم،بووە زوغال سەمعو،بەصەر
بووەزوغال سەمعو،بەصەرمان،باری عیصیان هاتە،سەرمان

چاو، کە هەڵنایەن لە شەرمان دەست لە ئەژنۆ،قوڕبەسەر
دەستە و ئەژنو،دا، دەنیشن پڕ گوناهان رادە کێشن

خێرو، عیصیانمان دە کێشن، ڕەبی نەن کەی،چاو لە بەر
چاو، لە بەرنابین ایشەاللّهْ چونکو خوی فەرمویە اللّهْ

[2](لا تَقْنَطوا، مِنْ رَحْمَةِ اللّهْ) هەم شەفیعە پێغەمەر
ئەو، شَفیعُ المُذْنبینَ،لە وەدە مەی دۆزەخ،بە تینە

دێتە سەر، ئومەت بەقینە، نامێنێ هۆش و، خەبەر
پڕ گوناهان دێن و، چونە، دەفتەری وان سەرنیگونە

(فافرَأوُا، ما تَفْعَلوُنَ قد دَخَلتَ فی السَّقَرْ)

---

٢. لە نو سراوە یە کدا، (لا تَقْنَطواُ رَحْمَةَ اللّه) هاتوۆە، دیارە مامۆستا هەژاریش ئەمەی بە لاوە ڕێک و پێکترە بە لامِ إعرابەکە تێک دەچێ: (لەبری تینی جەمەر. (شین و، جەمەر) یش هاتوە.

ئه‌و، سه‌قه‌ر، ئاگر، گڕینه‌، بۆ کوفاران زۆر، به‌تینه‌
دێته‌سه‌ر عالەم به‌کینه‌،نامێنێ هۆش و، صه‌به‌ر
نامێنی هۆش له‌وسه‌عاته‌،دێ جه‌هه‌نه‌م،بانگ ده‌کاته‌
کوانێ تاریکُ الصّلوٰته‌، چاوه‌ڕێی وانه‌ سه‌قه‌ر
جێێ و،مه‌قامن زه‌مهه‌ریره‌،به‌حشی مه‌حشه‌ر، زۆر، که‌ثیره‌
باکۆ تا که‌ین فکرو، بیره‌، چاکه‌،بیکه‌ین موخته‌صه‌ر
موخته‌رصه‌ر که‌ین به‌حشی ذیلّه‌ت.ذیکری حه‌شری کولّی میلّه‌ت
یه‌ک به‌زه‌حمه‌ت.یه‌ک به‌ڕه‌حمه‌ت،ڕێی صیراطمان دێته‌به‌ر
دێته‌به‌ر مان ڕێی صراطه‌، بۆ گوناهباران نه‌هاته‌
یاره‌بی بنده‌ی نه‌جاته‌، بۆن شه‌فیع که‌، پێغه‌مه‌ر
بۆن شه‌فع که‌،تو به‌ڕه‌حمه‌ت نه‌ن خه‌یه‌ تارێکی ظولمه‌ت
پێن عه‌طا که‌، قه‌صری جه‌نه‌ت (أعطيناً طوُبا)، شه‌جه‌ر
ئه‌حمه‌دی کوبڕی فه‌قیره‌، حه‌ق ته‌عالا ده‌ستگیره‌
باری عیصیانێ که‌ثیره‌، بو کره‌ته‌، ذیکری سه‌حه‌ر

## ڕازی خۆت بۆ که‌س مه‌بێژ

دڵبه‌را، تا که‌ی خه‌جڵ بێ، دڵ له‌به‌ر، ده‌ردی درێژ
تۆ خودا. ڕه‌حمت له‌دڵ بێ. به‌س به‌ناحه‌ق خوێن بڕێژ
به‌س بکه‌ قه‌تڵی ئه‌سیران، تۆ، به‌وان په‌یکان و، تیران
یار،مه‌کوژ، هێنده‌ فه‌قیران، هه‌رچی کوشتت،زوی بنێژ
هه‌رچی کوشتت زوی وه‌شێره‌، خوپڵینگی. سام شێره‌
حۆریی و، زیبا و، دلێره‌، ئاگری عالەم، بڕێژ

ئـاگـری پـڕتـیـن و، تـا بـه، پـڕ بـه تـیـن و، پـڕ عـه‌ذابـه
هه‌ر که‌سێ دی. بۆی که‌بابه. سوت بو، به‌وناری،له‌مێژ
سوت بو، به‌ناری زۆر، به‌تین یارا، به‌عیشقی شای ئه‌مین
سـا تـۆ، وه‌ره‌حـاڵـم بـبـیـن،نـیـتـر بـه‌مـن ژاراو، مـه‌چـێـژ
بـه‌س بـچـێـژه پـیـم زه‌قـومـه، طـالـعـی مـن زشـت و، شـومـه
به‌حری خونیین دێ، له‌ڕومه، دڵ به‌مه‌ودای تیغی تێژ
دل به ده‌ردانـی شـه‌لاڵـه، هـه‌ر،که، دی خـه‌سـتـه‌ی خـه‌یـاڵـه
باک نییه. هیچ قیل و، قاڵه، بۆ چیێ یه‌تی. ڕۆژو، نوێژ
بـو چییه، إسلام و، دینه، چونکه بۆ که‌س ڕوحـم نـیـنـه
کاری‌ویم،هەر قەتل‌و،خووینە،عاشقان سەرمەستو، گێژ
عـاله‌می مه‌ست و، مه‌جازه،نین له‌عیشقی راست،بازه
طـالـبـی عـومـری درازه، مـاڵ دوسـت و، گـیـژو،[1] ویـژ
مـاڵ دۆسـتـی صـه‌رف و سـووده، ئـه‌نـده‌رونـی بـێ وجـوده
وه‌ک تـه‌نـور، خـاڵـی لـه‌دوده،پـڕلـه ئـاگـر،نـان[2]بـریـژ
وه‌ک ته‌نوری پڕله‌تینه، هه‌ر، ده‌سوتێ چیـن به‌چینه
عـاشـقـان دڵ پـڕبـریـنـه، بـۆی لـه‌جـان و، ڕوح بـریـژ
شیبهی خاشاک و، غوبارم، چاوه‌ڕیی پابۆسی یارم
حـه‌وجـێ، نـیـن دادو، هـه‌وارم، نـالـه‌نـال و، قـیـژه‌قـیـژ
ئـه‌حـمـه‌دی کـوری هـه‌ژاره گـه‌رچـی پـیـت نـیـن،إخـتـیـاره
ده‌ردی دڵ په‌نهان بداره، رازی خۆت بو که‌س،مه‌بێژ

١. له‌دوسی نوسراوه دا له‌جیاتی گیژو، ویژ (که‌ڕو گیژ) هاتووه:
٢. له‌ بری نان بژیژ: (تن بژیژ) یش، هاتووه:

## راهی عیشقیٚ

خۆش بەحاڵی عاشقانی دڵ لەسەر ذەوقی، کئوس
باک نەبون هەتک و، مەلامەت، قەط نەترسن،مِنْ حُدُوثْ
دەست،لەسەرهەڵگرت،لە، بۆ(لات)و، (هوبەل) (عوزا)و(یەغوث)
ئەصلی عاشق وا دەبیٚ، نەک دڵ بەحیلەو، چاپلوس

هەردەمە، دەر یەک خەبەر، هەر لەحظە بۆیەک دەست بوس

سەر، بە قوربانی کەسیٚکی تالە دونیا. زیندەبیٚ
یاری ئەوەڵ گرت بەجان، تا سەر، بەدڵ بۆی بەندەبیٚ
نەک هەمو ڕۆژیٚ لە نوۆ، با دیگەران لەب خەندەبیٚ
تەن یەک و، دڵ صەدهەزار، فکرو، خەیاڵ،پەرٚ گەندەبیٚ

هەر کەسیٚکی دیت بە چاوان. نیم سەعات با هەم جلوس

---

تی بینی: (١) لەچەن شوینا شیخ ئەحمەد پیتی (ث) و (ص)ی کردۆتە هاو قافیەی (س)و سەربەندە کانی پی گر توۆە،دیارە ووشەی هاوپیتی دەست نەکەو توۆە، دەگەڵ ئەوە شالە باری عەروضەوە ئەم کارە زۆر پەسندی نییە، بەلام ئەمرۆ، زوربە عەیب دانا ندریٚ و، رەنگە هیٚندیٚک کەس بە هونەریشی دا، بنین.

(٢) لە نوسراوە یەکدا، لە جیٚگەی ئەم سەر بەندە (فەضلی حەق دەر سەر، چو فیل و، مەنگەنورس فەضلی حەقەنەک کولینگ دەر سەر چو.....هاتۆوە (٣) لە دو نرسراوەدا، لەجیی ووشەی لە صەفی، عاشقان، نوسراوە، ناوی وی مەکتوب لە صوفحی عاشقان، یان لە صەحفی عاشقان (٤) لە نرسراوە یەکدا، لە جیٚگە: طالبی روی نەو جەوان. ژو، بەردەری صانع دەبیٚ...ئاوا هاتوۆە طالبی ژوی نەو جەوانانی مەهی ساطیع دەبیٚ، (٥) لە نوسراوە یەکیانا، ل ژیر ئەم پینجینەدا (گەر، بەریش و، خابە بابە....نوسراوە، نوسخەدە رنەزدی مەلا حەسەن) دا است، وەنیلاً نوفتادە است: (٦) لە نوسراوە یە کیاندا، هەڵبەستە کانی: گەر بەریش بابە.....کەو تونەتە پیٚش هەڵبەستە کانی (کەرد دەگەڵ موسای عیمران وەعدە خەلاّقی غەفور. (٧) لە نوسراوە یە کیاندا، لە جیٚی. گەهوەرەی موردەی صەبیان: هاتۆە گاهوارەو، مەهدی صیبیان نابیٚ، بیٚ شین و، گرین:

هه رله وێ رۆژێ که من خولّقام، له سه ر مولّکی زه مین
ده ربه ده ر، سه ر گه شته بوم، ده ر راهی جانان دڵ غه مین
شیبهی قه قنه س. دڵ به جۆش و، زاری و، دیده، نه مین
قه ط نه بوم توشی طه بیبێک میثلی (لوقمانی) ئه مین
بیێ، بکا ده رمانی ده ردی، بێ ده وایم بِالخصوص

تۆ، له دونیا یه ت نه دی عیشقێ ده گه ڵ (مه جنونی) کرد
یه کی وه ک (صه‌نعانی) چۆن روسوا ،له‌دونیای دونی کرد
ئێک‌وه کو (فه‌رهادی)هه‌مڕای.سه‌نگی (کوێ بیستونی) کرد
(وامیقی) خوێنخۆرو، کۆی قاف، هه مڕه هی هامونی کرد
میش وه کو، وان، زه هر نۆش و، خاکی پای جانانه بوس

بمرێ عاشق چاکه. نه ک ده ر، ڕاهی عیشقێ، ناته واو
په ڕی کاه و، دانه یی خه شخاش،جیهان بێنێته چاو
ڕۆژو، شه و، بۆ دلبه ری خۆی رێک بسوتێ دڵ،به تاو
عه قڵی وا، که م. عیشقی وا، تیژ،مه خلوقاتیش وا، به داو
یا خودا، به و عاشقان ده ی صه بری (ئه یّوبی) ئه موس

ڕاهی عیشقێ زۆر گرانه، خۆ،له کن،ئه هلی نه ظه ر
یه ک ئه وه قِه ط سه ر نه پێچی ئه ز قه ضاو، ئه ز قه ده ر
جان و، دڵ، ته سلیم به جانان که ی،به بێ خۆف و، خه طه ر
خۆت بکه ی ته فویض به یار، ئه ز، ماسیوا، بی، بێ خه به ر
نه ک به دڵ شیبهی نُسورو، عه قعه ق و، ده م، چون خروس

مه خلوقاتێ ئه ز ده بینم. عاشقانی بێش و، که م
هه ر یه که،بۆ خوێ به ره نگێ،دای له حه رفی عیشقێ،ده م
چی حه قیقی، چی مه جازی، نێش و، نۆش و، زه هرو،سه م

[1] قه‌لبی عاشق وا، بسوتێ شیبهی کوره‌ی ده‌ردو، غه‌م

نه‌ک به‌چاو مه‌ست و، غرور، ته‌ن فه‌ربێه‌ چون که‌ باشی[2] عوس

روح و، جانی من فیدای ئه‌و، نه‌قش و، له‌وحی سینه بێ

سینه‌ یی، بێ رازو، غه‌یبه‌ت. دور، له‌ بوغض و، کینه بێ

ظاهیره‌ن کافر، به‌ باطن، گه‌نجی ده‌رگه‌ نجینه‌ بێ

نه‌ک له‌ بۆ، زه‌رق و، ریا، پۆشیده‌ و با پەشمینه‌ بێ

یان به‌ دم طالب. به‌ دڵ چون (پیله‌ته‌ن) با (ئه‌شکه‌بوس)

هه‌رکه‌سێ عیشقی وه‌ده‌ست که‌وت، با ئه‌و کا، هه‌رزان فرۆش

نیک و، به‌د، هه‌رچی وه‌ره‌ یێ بێ، ده‌ر، ڕه‌هی جانان خه‌مۆش

ظاهیره‌ن، زه‌هری (هه‌لاهیل) بێ، مه‌ترسه، لیێ بنۆش

وا، ده‌ گه‌ل نه‌فسێ به‌، دوژمن، سه‌ر به‌ تاب و، جه‌نگو جۆش

وه‌ک (عَلِيٌّ ٱلْمُرْتَضىٰ) کرد، به‌ر، ده‌ری (قه‌لعه‌ی غه‌موس)

هه‌رله‌ ئه‌وه‌ل تا به‌ ئاخر چه‌نده‌ها. بون پاڵه‌وان

صاحیبی تیپ و، سوپابون جومله‌ با گورزی گه‌ران

طالبی جه‌نگ و، جیدال. شه‌رار، له‌سه‌ر ملکی جیهان

چی ده‌ گه‌ل نه‌فسێ بوه‌ دوژمن، جه‌نگ ده‌ گه‌ڵ ئه‌عدای نیهان

خاکی پای نین (روسته‌م) و، (گورشاسب) و، (گوده‌رز) و، (طوس)

چی به‌ ڕاست مه‌ردی زه‌ هه‌ با، جیفه‌ی دونیا چکار

گه‌ر به‌ ظاهیر مه‌یل بکا. بۆ صه‌رفی مسکێن و، هه‌ژار

باطینی خوێنی جگه‌ر خوڕ بێ، ده‌رون پڕ ده‌ردو، ژار

جایی مینه‌ت بێ، بلێ ئه‌ز عاشقم له‌ ڕویی یار

وه‌رنه، چی حوبی دونیه‌ی بێ. ده‌ر حه‌قیقه‌ت ئه‌و، یه‌ئوس

---

١. له‌ دو نوسراوه‌دا له‌جیاتی (قه‌لبی عاشق وا بسوتی) ... (من له‌ پشینیان وه‌ها بیست قه‌لبی عاشق پڕ له‌ غه‌م

٢. له‌ نوسراوه‌ که‌ی میرزا عه‌زیزدا، (که‌باش و عوث) هاتوه: خاوه‌ن به‌رانی به‌ته‌ماع و سامان داره.

[1] یەک لە نیشانەی دەعیشقێ، وایە ئەو دێوانە بێ
بۆ جەمالی یاری خۆی، ئەز ماسیوا، بێگانە بێ
ظاهیرو، باطین تەعەلّوق ئەو، بەهیچ ئەشیا نەبێ
عاشقی شوعلەی چراغ، تەن،سوختە چون پەروانە بێ
بەڵکو لایق بێ بە جانان. خاکی ژێری نەعل بوس

یەک لە نیشانەی دەزاهیدی،ئەوە ئەی ذَاالْکَمالْ
بێ وجودبی خۆت لە کن هیچ،لاف نەدەی لەوە جدو،حال
نەک بە عیلمی شەیطەنەت ماهیر،لەبۆ جەنگ و، مەقال
[2] شاة بی (في جَلْدِ ذِئْبِ) نەک غەنەم جەلد، ذِئْبْ مەئال
هەم چو خینزیری موضیّر، کە لبی عەقور، شەڕاری روس

ظاهیرەن صوفی، بە باطین، کەو دەنی عاصی، کەڵەک
(حَیَّةٌ فی جَلْد حوُتٍ) مارە،دەرپۆستی سەمەک
بۆ طەماعێ گەشتی هەفت ئەرضان دەکەن، تا نۆ فەلەک
دەر حەقیقەت نین لەبۆ، وان هیچ ئەبواب و، دەرەک
شکڵی ئادەم، دڵ چو، دەجّال، ضالّ و، گومراەو، یەئوس

عالمی عیلمی رسوم، بەرحاڵی عوشّاقان بەخیل
زاهیدی زوهدی ریا، گومراە، دەبێتن بێ دەلیل
عابیدی غەڕە بە طاعەت. مونکیری قەولی جەلیل
هەر کەسی ڕایی لە خۆ، ئاخر دە بێ نادیم، ذەلیل
چی بە یار عاشق نەبێ. ئەو، موفلیس و، قانیط، یەئوس

---

١. لە جیاتی (یەک لە نیشانەی دەعیشقێ...لە نوسراوەیەکدا: (بو نیشانەی عاشقی پیویستە ئەو دیوانە بێ) هاتوە هەڵبەت ماموستا هەژاریش ئەوەی بەلاوە راستە:

٢. لە شوینی ئەم کوتە هەڵبەستە لە برێک نوسراوەدا (شاتی فی جلدی ذئب بی و، ببیە، پەذخوَر فی المَال هاتوە: ئەوەشَ بەلای ماموستا هەژارەوە جوانترە:

[1](ئینی ر اوەندیّ و) بەلعەم) عالیمی عیلمی ڕسوم
ڕاسیخ و، ماهیر لە مەکرو، کەیدی ئیبلیسی ظەلوم
(زیج و،ئوسطور لاب و،روبع و،رەمزو،ئەعداد و، نُجوم
میثل و، مانەندیان نەبون. غەیرەز، رەسولان دەر، عُلُوم
چونکە ئینکار بون، نەبون واقیف بە ئەسراری قدُوس
ئەهلی عیلمی بیّ عەمەل. دەم، واعیظ و، دورەز حەقن
طالبی حیلە و، حەرام. شیبهی نسورو، عەقعەقن
هەمنشینی ظالمان با جەورو، ظولم و، ئەحمەقن
چونکو عاشق نین بە مەولا،وان لە عیشقێ دڵرەقن
ئاکیلی لاشەی بیغال و، ذیئبی ئوستوخوان کروس
چونکە دونیا ئاخرە عالەم، گەڕا. سەر فیعلی بەد
عیلمی عالم، بۆ طەماعە، نەک لە بۆ،وەجهی ئەحەد
صۆفیان دەر جوستوجۆی عوجب و، ریا، کیبرو، حەسەد
لیّک ئەمین نین، قەط چجار،خوشک و،برا،باب و، وەلەد
حاکمان طالیب بەجەورو، ظولمن شیبهی (فەیلەقوس)
بەعضی مەخلوقات دەبینم. دێنە.روی وەجەو، ئەظەر
یەک، یەکە، بەیت و، غەزەل، ئەشعاری پێشینیان لەبەر
دینن،لە نێوخەڵکی، دەخوێنن،[2]اعتیقادیان، بینە، سەر
نین دەغەم بەد نامی خۆدا، ڕۆژگار خۆش بچتە سەر
قەطعیەت ئەز دامەنی یار، سەر، لەبەر ناکەن رونوس
عاشقی،بەنگ و، شەڕاب و، ڕەقص و، قەواڵی نییە
طەبعی کوشت و، حەملی ئەثقال: مل بە ئەغلالی نییە
دانیشی عیلمی عەزازیل، ڕەسمی نەقالی نییە

---

۱. لە جیاتی ئەم لەتە هەڵبەستە: (هەم چو راوەندیّ و بەلعەم عالمی عیلمی ڕسوم) نوسراوە، ڕونە بەلای ماموستا هەژارەوە باشترە:

ئه و، به نه زدی خاصی مه ولا فیعلی ده جّالی نییه

[1]با، هه مو، دوژمن طه مه ع، که م کا، له سه ر ئه عضای نفوس

راهی عیشقێ. نه، به ڕه ئیه، به ل به سه عیی بێ شتاب

نه، به مالّه، نه، به طاعه ت، نه، به عیرفان و، ئه واب

نه، به عیلم و، نه، به فیکرو، ڕه مزو، ئه عدادو، حیساب

عیلمی قال نین، ده فته رو، ده رسی نویشته ن، ده ر، کیتاب

فه ضلی حه ق ده رسه ر به کاره نه ک به فیل و مه نگه نوس

راهی عیشقێ راستی و، ته سلمی یه،ده ر، راهی دۆست

نه ک به عه قل و،زیّده ،زانی و ،(مه نته شا )و، که شکۆلّ و ،پۆست

نیک و ،به د ،هه رچی وه رێ بێ ،ده ر ،ره هی جانان نیکوست

خۆزیه م،به و که س دلّ و، جان داده، سه ر، ده ر، راهی اوست

نه ک له ریێ یار، نائومێدو، دڵ له عیشقی ساده لوس

عاشقی به یت و، غه زه ل،لاف و، گه زاف و، گه ف نییه

پــر چ و ،ته وه رزین و، مه طه ڕه قێ چه نگ وناى و ،ده ف نییه

خه رقه یی په شمینه پۆشیده، عه صا. ده رکه ف نییه

مه ستی و، مه غروری و، طه عنه زه نی و، عه فعه ف نییه

لیّت موعه یّه ن بێ، وه ها نابێ له بۆ که س ڕای خلوص

چه ن هه زار ،ته قواو ،طاعه ت ،چه ند هه زار عیلم و ،عه مه ل

چه ن هه زار .ئه ورادو ،ئه ذکار ،چه ند هه زار ،میثل و ،مه ثه ل

هیچ نییه، ده ر، راهی عیشقێ دڵ نه بێ إخلاص ده گه ل

زانینی زۆر، بۆ طه مه ع، دینت ده خاته نیّوه خه له ل

ماسیوای إخلاص له کن یار، نایه نیّتن یه ک فُلوس

یه ک له نیشانه ی ده. مه عشوقێ ئه وه، یه ک ره نگ بێ

---

۱. له‌نو سراوه‌یه کیاندا ئاوا هاتووه. (با، هه‌مو دوشمن طه‌مه ع ته‌رک کا. سه‌ری ئه‌عضای نفوس)

باغەم و، دەردت، شەریک، با شادیەت هەم رەنگ بێ
هەروەکو تۆ، بۆی دەسوتێ ،ویش لەبۆت،ئەو ،رەنگ بێ
وەقتی عەیشت. شادبێ وەقتی غەمت دڵ تەنگ بێ
لایەقی مەعشوقی عاشق بێ هەتا (یَومَ آلعَبوس)
یەک لە نیشانەی دە، دەروێشی، ئەوە قانیعَ دەبێ
طالبی ڕۆی نەوجەوان، ڕۆ، بەر، دەری صانیعَ دەبێ
لە شەڕو، شوران بەری. لەفیتنەتان مانیع، دەبێ
گوێ لەقەولی کەس نییە. بۆ قەولی حەق سامیع،دەبێ
ناوی مەکتوبە. لە صەفی عاشقان (خاصٌ ألخُلوص)
شەرط و، إقرار بێ هەتا زیندوم لەسەر مڵکی جیهان
تەرکی طاعەت پاک بکەم. هەرچی بەظاهیر، نەک ،نیهان
[1]ئەکل ونەوم ،وشوڕ بی زۆر، گوفتاربکەم باروح و، گیان
گەر، بە بێ شەرعی، نەبێ، روزەو، نەمازان ،کەم، زیان
تابم کافر لەکن دەم. واعیظی دڵ چابلوس
گەر، لەبۆ. ئیمانە طاعەت، غەیری کوفرم نین چکار
گەر، لەبۆ، جەنّاتە طاعەت، نامەوێ جوز، قەعری نار
[2]نیم خەدیمی طاعەت و، تەقوایە ئەز پابۆسی یار
ڕوسواو، بەد نامی دونیا، نامەوێ ناموسی، عار
تۆبە لەو، زوهدو، ریای پڕ عوجب و، پڕ کیبرو، نحوس
مەذهەب و، میلّەت، لەبۆ عوشاق نییە، جوز، روی یار
عاشقان غەیری جەماڵی یار، چنا کەن إختیار

---

١. لە جێگای ئەم لەتە لەبڕ یک نوسراوەدا ئەم کوتە هاتۆوە: (خواردن و خەو کەم بکەم تارادە هێنم جیسم و جان)
٢. لە نوسراوە یەکدا ئەم نیوە هەڵبەستە ئاوا هاتووە (طاعەت و، تەقوایە ناکەم تا ببوسم پای ئەیار، دیارە مامۆستا هەژاریش ئەوەی بەلاوە باشترە:

رۆژو شەو بۆ روئیەتی جانانە، خوێ دەر، ئینتیظار
غەیری وی با نارو، جەنّەت، کوفرو، ئیمان نین چکار
نابەوێ چی،نەفعی نەفسە، جوز ضەرەر، شەرّی نفوس
مەجلیسی ئەز، جاهیلان،قەط،نابێ، بێ جەنگ و، برین
گەهوەری موردە صەبیّان، نابێ بێ شین و، گرین
ئاخوری نەرّەحیماران نابێ، بێ، قولەو، زرین
هەمنشینی یاری بەد، خو، ناقصی دونیاو، دین
ڕوسوا و، بەد نامی دونیا، چی بەبەدخوهەم جلوس
کەرد، دەگەڵ (موسای) عیمران وەعدە خەلاّقی غەفور
(وادیەی، ئەیمەن) بیا تا بێیە ڕۆی وەجدو، حوضور
ئێکی وەک ئەحمەد لە عەرشێ نەقشی نەعلەین کرد ،ظوهور
غەیری یار طالب نەبو، بۆیە بە زویی چوۆە،حوضور
نەطەلەب کرد، روئیتُ اللّە ئەو، بە بالا هەم جلوس
چونکەنەی‌بوو ،صەبرو ،تاب کرد ،عەرضی رەبّی عەیب پۆش
رَبِّ أرینی گوت، وەلاکین (لَنْ تَرانی) هاتە گۆش
طوری‌شەقّ کرد ،لەوحی‌ئایەت،با(خضر) کرد سەعی‌و، کۆش
هیچی قەط بۆ پێک نەهات،ئەو ،چونکە نەی کرد ،فەهم‌و ،هۆش
إعتیقادم نین بە جوز عیشقی، تەوەکوّل. ڕای خلوص
(ئەهلی غار) هەرچەندە بون. پیرایەیی عەقڵ و، شوعور
دەست لە دونیا شوستبون عاشق‌بە ئەلطافی غەفور
چونکە إخلاص بون بە عیشقێ‌وان بەدڵ چونە، حوضور
بون لە جامی عیشق مەست و، بادەیی کەیف و، سورور
ذەوقی دونیا، دان بە عوقبا، نەومی، غاران هەم جلوس
گەر، بەزێش و،.....بایە سابرین سەردار دەبوو
گەر، بەصەبرو، بار کە‌شی با جینسی....موختار دەبوو

گەر بە حیلەو، دانیشێ با ریوی صاحەب کار، دەبوو
گەربەسیّاحی و،بیداری بایە گــورگ،کەرامەتدار،دەبوو
**غـەیـری عـیـشـقـی خـاصّـی اْلـلّـهْ (لا أریٰ) راهـی خـلـوص**
مـەردومـانـی،بـاطـنـی بـیـنێ لادەداتـن،دڵ زیخـەلـق
خۆی دەکا پەنهان بە ظاهیر، کیسوەتی جامەیی دەلق
ڕوسواو، شەرمەزاری پێشی چەشمی عامی خەلق
مەقصەدی صدقی مەقامە ئەو، بە نەزدی (باری فەلق)
**مـەرتـەبـەی حَقُّ اْلیَقـیـنْ هـەر بـۆ وی خـاصـە بِالخُصوصْ**
بشنەو،ئەزمەن،یەک حەدیث ئەز جەنبی (رَبِّ آلْعاَلَمین)
یـا عـبـادی انَّ عَـرْشـی فـی فُـئـوادآلـمـؤمـنـیَـن
قاَلَ (نَحْنُ أقْرَبُ الَیْه منْ حَبْل الوَریـد) مـنْـهُ مُبین
فَـاعْـبُـدوُنـی لاٰالـهَ الاّ أنـا حَـقُّ آلْـیَـقَـیـن
**عـاشـقـان گـوفـت (لـی مَـعَ آلـلّـهْ) مـا،فـەدیـمیـمبەحـدوث**
ئەی دڵی سەرگەشتەیی،ئەبلەی ضەعیفی نابەکار
قەولی جانان نابی حاڵی، تالە چاوان خوێن فووار
پـێشـەوایـان خـوێـن دڵـی خـۆ کردە قـوتـی إنـتـیـظـار
[1] خوزێ من گورگین سەگێک بام،کەوتەبەردەرگای یار
**سـەردو گـەرمو، زەجـرو، ضـەربو جـارجـارە خـاک بـوس**
یاخودا،هەرکەس لەرێی عیشقێ سەری خۆیبردەپاش
خواردنی خوێنی جگەر، خاری موغیلان بێ، فەراش
عومری(خضرو)و،کاری(شمر)و،(سامیری)بۆیبێمەعاش
سەعیی (ئەفلاطون) ئەرەسطو، لوقمانی عیلم باش
**کاری نەنگو، جامی سوزە، ڕشتە بۆی، تبل، (جالینوس)**

---

١. لە نوسراوەیەکدا ئەم کوتە هەڵبەستە بەم جوزە هاتووە (خوزێ من گورگین سەگێک بام پاسدەری دەرگاهی یار) مامۆستا هەژاریش ئەوەی پێ باشترە:

کۆرە ئەحمەد سەرلە سەنگ دە، تۆ گوتت من عاشقم
راست لە ڕێی عیشقی دەچەم، دەر، ڕاهی جانان صادقم
خود، نو ماهە ستی،ببینی وا بزانن لایقم
بێ وجودو، کەمترین مەخلوقی بەندەی خالقم
صەد هەزار، عیلمم هەبی. نابم، بە خاکی پای خروس

# ق

## ١

## کەلبی دەرگای چوار یارم

دڵ هەمیشە مەی پەرستە، بۆمەیی جامی ڕەحیق
بێ، خودو، حەیران و،مەستە،بادە نۆشی فی آلْحَقیق
فی آلْحَقیقەت بادە نۆشە، دل بە ظاهیر مەی فرۆشە
ئەو، لە باطین دا، خەمۆشە، بۆ خەیالاتی عەمیق
بۆ خەیالاتی عەمیق و، فیکری باریک و، دەقیق
هاتە مەیدانی حەقیقی،ذرّە ذەرّە،وەک دەقیق
وەک، (دەقیق)ە زان قیاسە[1]، چاکت دانا. بەو، ئەساسە
فکری دانا، وەک ئەیاسە بوون، بە خەشخاش و، سەویق:
[2] مەعشوقە بوە مەغزی فەرقم،ئاگری گرت تەحت و،فەوقم
ناری عیشقت بو. بەتەوقم. هەڵگڕاوەک مەنجەنیق
(ناری نمرود) بۆ (خەلیلە) سالمی،حوکمی جەلیلە
فکری عالەم، قالو، قیلە، جانو، دڵ لەو راغەریق

---

١. لەحیاتی چاکت دانا بەد قیاسە، (داندراوە بەو قیاسە) لە بڕێ نرسراوەدا هاتووە

٢. لە بری (مەعشوقە بوە مەغزی فەرقم) (یادی یارە مەغزی فەرقم) یان یادی تویە مەغزی فەرقم هاتووە) دیارە ماموستا هەژاریش ئە وانەی بە لاوە باشترە: وەک سەویقە مەغزوز فەرقم ئاگری... قاضی سنو و. نووسراوەکەی خوم (سەویق) فاوت:

مونغەریق بون ئەهلی حیکمەت. بۆ خەیاڵی دەرکی قودرەت
گەینە تەعطیلو، موشەقّەت٠وان،لە بوطلانّی حەذیق
عاطڵو، باطڵ خەیاڵن. حیکمەتی (چەقمین) مەئالن
مەکرو، قەولی وان. بەتاڵن. کێ دەزانی ڕێی حەقیق
ڕێ حەقیقەت بوو، لە ئاغاز، خوم بە تەصدیق و، بە ئاواز
دینی توم هەڵگرت بە دڵخواز، هاتمە سەرجادەی طەریق
ئەم طەریقە عیشقی تۆیە، لەذّەتی ئەز ذەوقی تۆیە
قومری ئاسا. شەوقی تویە، بوو بەزنجیرو، ڕەفیق
بو، بە زنجیری سەعادەت، هەردو ئەلفاظی شەهادەت
ڕێ نەجاتە بۆشەفاعەت، خەطی ئەعمالی نەمیق
حوجّەتی دەستی یە مینم، عیشقی تۆ، سەرمەشقی دینم
بومە، سەیدی. بۆ، یەقینم، ڕۆژی بازاری عەتیق
ڕۆژی ئەوّەل چاک دەزانم، خۆم فیدات کەم ڕوح و، جانم
جارێکی خوێنی ڕەوانم، بێتە خوارێ،وەک عەقیق
وەک عەقیق و، دوڕو، یاقوت، نوطقی تۆیە لەعلی یاقوت
دانەیی ئەلماسی ناسوت، تاجی سوڵطان را، یَلیقْ
دوڕی تاجی ئەنبیایە، جەوهەری کەنزی عەطایە
مورسەلان را، پێشەوایە. جوملە عالەم را شەفیق
تۆی شەفیعی کوڵی عالەم دوڕی یەکتای نەسلی ئادەم
بِاللّه هەر تۆی خەتمی خاتەم، بێ میثال و، بێ ڕەفیق
بێ ڕەفیق و، بێ میثالی، توی حەبیبی لایەزالی
حوبی تۆ، بو، حەق مەئالی، خەڵقی کرد جوملە فەریق
فیرقە، فیرقە ڕۆژی میزان، نیک و، بەد، وامات و، حەیران
بۆ شەفاعەت دێنە جەولان (اِرْحَمُونا، یا صَدیقْ)
(یا صَدیقی)، خوارو، زارم، گەر، گوناهو ذەنبە، بارم
کەلبی دەرگای چوار یارم، (یا، حَبیبی یا وَفیقْ)▪
وەفقی تویە حیفظی ڕوحم، لوطفی تۆ مایەی فتوحم

غه رقی نیو (طوّفانی نوحم) هام، له ناو ده ریا،غه ریق
من حه ریقی عیشقی یارم من ئه سیرو، غه م گوسارم
بیّ ته ره حوم صه عبه کارم، جه رگ و، دلّ. له وژا،حه ریق
له ت له ته، نیّوی ده رونم. شه رحه شه رحه. ته ن زه بونم
وا ، له ده هشه ت، بیّ سکونم، ضه یقه صه درو، جان (یَضیقْ)
ضه یقه تی هیجرانی تومه، زه عفه رانه. ره نگ و، رومه
پیّم نه ماوه. عارو، لوّمه. (حاشَ لِلّهْ لا یَلیقْ)
لا یه قی عه فوو، عه طا یه. ژوی له قاپیه ی موصطه فا یه
کوره ئه حمه د ، بیّ به ها یه، ته ن ضه عیف و، جان ژه قیق

# ٢

## نۆش بکه ین کاساً دِهاقْ

[١]نایه، جه وابی دلّبه ری، سوتام. له به ر، ده ردی فیراق
هه ر ،تا کو ،رۆژی مه حشه ری،هه رداد ،له ده ستی إحتیراق
هه رداد ، له ده ستی مه هژوان، سه رخیّلی پۆلی ئاهوان
دوتاقی قه وسی ئه بروان. وان گوت گه لوّ (شُدّو آلْوَثاقْ)
وان گوت به عیّلی زه نگیان، قایم بکه ن، وان به ندییان
دو طاسی قه وسی هیندیان. تالّ کرد ، لمن عه یش و مذاق
لیّم تالّ بوو ه، عه یش و ،نیشاط ،ده رچو ، له ده ستم پیّی نه جات

سه رنج: له سه ره وه ی ئه م پارچه هه لّبه سته وه، نوسراوه ده رحاری نویشته شود. ١٣٢٢ ه ـ ق یاد گاری ده رویش مه لا ئه حمه د. که رکوک. واته کاتیّ ئه م پارچه هه لّبه سته. به ده س مه لا ئه حمه د. ده رویش بو یاد گارو، بیره وه ی له شاری که رکوکی عیراق نوسراوه بژواری کۆچی حه ضره تی ژه سولّ ١٣٢٢ بوه، ئه وه ش بلّیّن ئه م نوسراوه یه، ته نیا له ده سنوسه که ی خوالی خوشبو ،میرزا عه زیزی میرزا باولی(تورکه مانکه ندی)بو کانا هاتوّوه وبس:( که لبی دمرگای چوار یارم)
١. له نوسراویه کیاندا، له حیاتی نایه....بابی جه وابی...هاتوّوه

خێر بوو، گەلۆ، یارم. نەهات، برژام، بەدەردی إشتیاق
برژام. لەبۆ ذەوقی ویصال، نەمان قەرارو، صەبرو، حاڵ

ئەو بڕۆ ڕەقیبی شەڕ، چەپاڵ[1] لێم هاتە، سەر کوفرو، نیفاق
لێم هاتە، سەرفیسق و، فجور، لەو یاری جانی خسمە، دور

هانام، بە تۆ ئەی شای صەبور، کەی بین بە یاری جان، مولاق
کەی بین، بەجانان، هەمنشین، سەرمایەیی دونیاو، دین

پێی شادبێ قەلبی حەزین[2] پێێ نوش بکەین (کَأساً دِهَاقْ)
بێن نۆش بکەین، کاسەی شەراب، دمرچین لەناری (ذَاْلعَذاْبْ)

ساکین ببێ دڵ لەو شەهاب، ذووقی حەمیم ئاوی غەساق
ذووقی حەمیم و، ژەهرو، سەم، چی میحنەت و، ئەندوەو، غەم

فەریاد. خودا. وندا، چکەم، لەو نەفسی پڕغەدرو، حەماق
لەو نەفسی شومی حیلەساز، مایەی فتورو، فیتنەخواز

ئەوخائینی ئەهلی مەجاز. (فاحفظنی مِنْهُ یاَرزاَقْ[3])
(وارزُقْنی مِنْ خمرِ آلْجِناَنْ) ئەی پادشاهی موستەعاَنْ)

شادن بکە، یارەب ئەمان، بەو، ڕاکیبی مەرکەب بوڕاق
بەو، ڕاکیبی بوڕاق بەدەست، بەو، شەهسەواری دیدەمەست

بەو، شاهیدی ڕۆژی (اَلَسْتْ) صاحەب وەفا، عەهدو، میثاق
صاحەب وەفا، عەهدو، قەرار. شۆخ و، شەریف و، نامدار

من عاصیم و، عیصیان بار. (فَاْرحَمْنی). یا، تەنها و، تاق
(فاَرْحَمَنی یاْ رَبَّ آلرحیمْ. فَاحفَظْنی مِنْ ناَرِالجَحیمْ)

گەر، من نەکەی تۆ دڵ موقیم. نابن بە جارێک إتیفاق
نابن بە جارێک، بەرقەرار. ئەو، نەفسی شومی شەرمەسار

قەط فیعلی چاک ناکا، چجار. إلاّ نەبێ تەکلیفی شاق
الاّ نەبێ تەکیلفی بەد، پەنا بە ذاتت یا ئەحەد

---

۱. لەجێی چەپاڵ. جەماڵ، نرسراوە:

۲. بین لەحیاتی پێی لە نوسراوە کەی میرزا عەزیزدا نوسراوە:

۳. لە نوسراوە یەکیاندا لە شونی فاحفظنی منە یارزاق: بژو، زاکبی مەرکەب بوڕاق: نوسراوە:

نه فس و، هه وا، ليم نابێ ره د،هه رمن ده گيرم،ده رشيقاق
هه رمن ده گيرم، بێ خه به ر، وه نيه، له هيجرێ بچمه ده ر

هه و سارێكی، خستومه، سه ر ميثلی حه ميرم ده ر، نوهاق
ميثلی حه ميرم سال و، ماه، ده ر، زيری بار گوم كه رده،ڕاه

موذنيب و، عاصی و زوسياه. ئه هلی مه ضه لاّت و، فه ساق
ئه هلی مەضەلاّتو ،ضه لال.سه ر كرده سه ر،عيشقی به تاڵ

دڵ كرد .به خانه‌ى‌به‌د خه ياڵ.ده ر،ئاخيره ت بوٚم نين خه لاق
ده ر ئاخيره ت بوٚم نين، چچار، هانام به توٚ په رووه رد گار

وه ك من نييه[1] رژدو، غه دار. له حو كمه تی شام و، عه راق
وه ك من نييه صاحه ب خه طا، نه فسی به ذه نبی (قَدْ أتىٰ)

(فاغفرْ لَنا يا ذَا آلعَطا، مِنْ نَارِ، إنّی لا، أطاقْ)
له و ناری پر تا بيش و، دود. ئه ی صاحه بی إحسان و، جود

به خشی توٚ عه بدی بی وجود، با ناڵه يی صه دری عوشاق
ئه ی عاشقانی بێ موراد، ده رڕاهی مه عشوق ڕه نج به باد

چی غه يری يار ،وه‌هم‌و ،فه‌ساد ،ئه‌ی‌واله‌يی،حه‌ی،فه‌رد ی‌تاق
واله يی هادی و، نه صير. ئه و، (كاآلعَجوُزه ی) بو كی پير

عاله م،له به ندی وی ئه سير خوٚز گه م به وه ی زوی دا ،طه لاق
خوٚز گه‌م ،به‌وه‌ی ئه‌هلی‌إيمان.زو ،ده ستی هه ڵگرت له‌و ،زه‌مان

له‌وڕا حيله‌ته‌ ی بێ ئه‌مان. جارێك ده كا،ده‌می إراق
خوين‌ڕێز‌له عه‌ينان ميثلی زه‌هر ، گه‌رقه‌رح ڕێژ‌بێ‌نيصفی شه‌هر

دايم به‌خه‌شه‌م‌و ، قين‌و، قه‌هر ، كه‌ذّابه نه‌ك ئه‌هلی صه‌داق
صادق نييه ئه‌و كاذيبه پوچ هه‌رچی ئه‌و پێی طاليبه

إحسان‌له‌ كن‌وی هاريبه. مايل به نه‌فس‌و، إستيراق[2]

---

١. له نوسراوه كه ی خوٚم و ميرزا عه زيزدا، له جياتی (رژد) ڕه د، نوسراوه:

٢. له نوسراوه‌يه كياندا. له بری (إستيراق) واته گوی بونه فس راگرتن و، به گوێ كردن: ئيشراق (انشراق) (واته وه جدو، له خوده رچون، كه پتر ئه م حاڵه ته له دوای بيستنی، سه ماع و، ئاهه نگی تايه به تی كوٚمه‌لی ده رويش و، صوفيدا. ده ست ده دا) هاتووه:

ئەحمەدی کوڕ: تا کەی وەها، نابی لە دەست شەیطان، ڕەها
نەفس و، هەوا وەک ئەژدەها، تابیع بە گومراهی و، شیقاق

## عیشقی شای ئاخرزەمان
## یان، صونعی ذاتی کردگار

من لە، داخ و، حەسرەتی تۆ، ئەرض و، ئاسمان پێ بو تەنگ
ئینتیظاری روئیەتی تۆ، برد، لە ڕوم، ئەلوانی رەنگ
برد، لە قەلبم عەقل و، فامە، جە[1] یشی حوبت زۆر، بەسامە
دینی و، دونیای لێ ڕفامە، دوشمنی تەڕ دەست لە جەنگ
جەنگی و، سیلاح تەواون، ئەو، لە قەتلان زۆر، بەداون
دڵ بە تیغی وان بڕاون. بێ ئیمانن وەک فەرەنگ
وان، نییە ڕوحم و، ئیمانە، شێخ و، شاب و، پیرو، جووانە
هەر کەسێ دی. بوی لە گیانە. کوشتەیی قەوس و، خەدەنگ
وان، خەدەنگ دایم لە کارن، ساو، دراون، سەر، بە ژارن
صونعی ذاتی کردگارن، ئەی طەبیبی دڵ، جە، سەنگ
ئەی طەبیبی بێ وەفایە. مایلی جەورو، جەفایە
هات لە جێی، بمدا شفایە، کرد، زبانم لاڵ و، لەنگ
لاڵ و، لەنگم حەق بە دەستم، زەخمداری تیرو، شەستم
هێند لە عیشقت مات و، مەستم، حەو جێی نین تریاک و، بەنگ
حەو جێی نین بەنگ و، خەرابە، سیری یار، کەس ڕێی پێ نابا
هەر، جەفاو، مەوت و، عەذابە. داخ و، دەرد و، ژار و، ژەنگ

[1] . لە جیاتی (جەیشی حوبت زۆر بە سامە) لە نوسراوەیەکدا، (جێی چول بو، زور بە سامە) نوسراوە، دیارە ئەوەش بەلای مامۆستا هەژارە راست و دروستە:

ژارو، ژەنگی (فی فُئوادُ)ە زیدە لەخەڵق و، عیبادە
عومری فانیم دا، بەبادە، شوبهەتی کەشتی و نەهەنگ
کەشتیێ عومرم. فەنابو، لەحظەیێ یار، لیم جودا بو
ئاگری ئەو تۆم لیێ ڕابو. توند تەرەز، تیرو، تفەنگ
هەر، وە کوو،ڕەعـــدیبەهارە،بەرقیصاحەب تین و،تارە
عاشقان دڵ. دەردە دارە، سام شیرو، خو، پەڵەنگ
سامو، هەیبەت شیبهی شیرن، تیغ بەدەستن ئەو، دلیرن
من، دەریێ مردن. دەنیرن، داخۆ، زو، بیێ، یادرەنگ
دڵبراو،بەدەستی خویە. تەختی عەقرەب لیێ وە کویە
ئەی دڵە، وان قەصدی تویە، دەت کوژیێ دڵداری شەنگ
دەت کوژی شۆخی لەطیفە ناصیەی بەدری شەریفە
قەلبی پڕدەردو، ضەعیفە، صاف کرد، وەک زۆنی،زەنگ
قاڵی کرد،وەکئاویصافە،لەفظییارمبیێخیلافە
هەرچی دامەن،کرد طەوافە،تەرکی کرد، ناموس و،نەنگ
تەرکی کرد، شەرمو، حەیایە، عەقڵ و، إدراکی نەمایە
عیشق، نیشان ئاشکرایە، ناڵەوەک سەمتورو، چەنگ
چەنگو،سەمتور،عودو،بەربەط،یاریصاحەبتەختوهەیبەت
عەقرەبان گرت[1]،تەختی جەبهەت،چون خەزانن زەردرەنگ
ڕەنگی وان،ئەو کەس دەزانن،عەشقی شای ئاخرزەمانن
رونیەتی یار،بۆ ئەوانن،بەحری عیشق لیێ خواردبیێپەنگ
بەحری عیشقیێ لیێ بەجۆشبیێ،با فیغان،شین و،خرۆش بیێ
طەبعی بیمارو، نەخۆش بیێ. ناڵەشیبهی صەو[2] تی زەنگ
ناڵە شیبهی صەوتی نەیبیێ، دڵ بە عیشقی صافی حەیَ بیێ
وی زەبان لەمەدحی طەی بیێمیثلی پورەی نەحل و،هەنگ

1. لە جیاتی (گرت)، (گەزت) لە نو سراوەیەکدا هاتووە:
2. لە جیاتی (ناڵە شیهی صەوتی زەنگ) (ناڵە شیبهی دەنگی بەرزەنگ) هاتووەو، ئەوەش بەلای ماموٚستا هەژارەوە ڕێک وپێک ترە

شیبهی سیڵاوی بەهاریٚ. ئاولە چاوان بیٚتە خواریٚ
غەیری مەدحی ذاتی یاریٚ، خەرج[1] نەکا ئەزمانو دەنگ

با زەبان صاحەب نەوابیٚ، دڵ لەسەر خوٚف و، رەجابیٚ
دەردی وی، هەڕویی، دەوابیٚ، ڕوئیەتی یاری چەلەنگ

روئیەتی یاری ظەریفان. لوطف و، إنعامی لەطیفان
شاد، دەکا دایم ضەعیفان، دەردە، دارانی کەشەنگ

نەحمەدی کوٚر، گەر ڕەشیدی دڵ بە عیشقی یارجەدیدی
وەختە بیٚ وەعدەی نومیٚدی، مردی بوٚچ نابی لەدەنگ

# ل

## ١
## دڵبەری شیرین کەلام

ئەی دڵا. تا کەی لە بوٚ، ذەوقی ویصال
هەر دەناڵی، دائیمەن بولبول میثال
بوٚچی توٚ، نەت بیست لە یاری ذی کەمال
هەر کە، خوٚت ون، کرد لە دونیای بیٚ میثال
مژدە، بیٚ لیٚت. تیٚر دەبینی، روی بە خاڵ
ئاستانەی دڵبەری شیرین کەلام
(جَنّتُ آلفِرْدَوْسُ) و، هەم. (دارُآلسّلاٰمْ)
ڕویی توٚ، رەوشەن گەری (لَیْلُ آلظّلاٰمْ)

1. لە نوسراوەیەکدا لەجیاتی زستەی (خەرج، نەکا ئەزمان ودەنگ) ئەزمان ئەورتەی بیٚ ئەدەنگ. هاتووە هەڵبەت ئەوەش پەسندی ماموٚستا هەژارە:

[1] گەر، بڵێی کەلبی مەیە، هەی هەی بێچارە بێرەلام
پاک دەبن فانی غەمی ئەم چەند ساڵ

جانی جانان، ڕوح و، جانم بێ فیدات
ئەی حەبیبی حەقی جوملەی کایینات
ڕۆژی مەحشەر، وەقتی، عەرضەی عارەصات
عاصیان مەطڵەب لە تۆن، عەفوو، نەجات
کەلبی خۆت هێێ هێێ کەلەو، وەقت و، مەجال

کەی دەبێ، ئەی پادشاهی (لَمْ یَزَلْ)
تیر ببینم ڕویی بێ نەقص و، خەلەل
تا ببم طاهیر،لە، هەرعەیب و، عیلەل
ڕویی تۆ ماهی مونیری بێ بەدەل
کەرد، بە یەک شەب نۆ فەلەک ژێری نیعال

من فیدای ئەورۆژە بم ئەی نامەور
قەومی عاصی گرت لە خزمەت تۆ، مەقەر
کرد، طەڵەب موعجیز لە تۆ (خیرُ الْبَشرْ)
حەق بەزووی فەرمو، لەبۆت شەق، شود، قەمەر
تابن طاهیر،لەوە همی بەد، خەیاڵ

خۆشەچینی جەبهەتت. شەمسەست و، ماه
تۆی، یەقین، دەر، دین و، دونیا، پادشاه
شافیعی عیصیان باری (ذی آلْخَطا)
کەی دەبێ قەلبان بکەی ساکین،لە،ناه
دا، ببێن سەر، کردەتۆی بەدری هیلال

---

١. لە بری ئەو بەشە هەلبەستە لە نوسراوەیەکا، ئەم کوتە هاتووە.
گەر بڵێ ئەی کەلبی دەرگام بێرەلام.
ڕونە ئەوەش بەلای مامۆستا هەژارەوە جوانترە:

ئەی شەهی عالی جەناب و، نور، جەبین
شادییە بەندەی ذەلیل و، دڵ حەزین
حەق، سەبەب توێ، کردە ئەفلاک و، زەمین
یار، بە عیشقی قادری فەردی، مەتین
تۆ بە لوطفێک شاد، بکە، قەلبی مەلال

ئەی حەبیبی پادشاهی (لا یَموُتْ)
صاحەبی سیّرو، صیفاتی (لا یَفُوتْ)
[1]لەو، ڕۆژەوە. حوبّت لەقەلبم بووە، ثەبوت
ڕۆژو، شەو، خوێنی دڵی خوم. بووە، بەقوت
ڕوح فیدا بوم، بۆ، وێ شەمعی بێ زەوال

هەر کەسێ عاشق بە کرداری تۆبێ
مونتەظیر بۆ، دینی، روخساری تۆبێ
دڵ بە داخی کەنزی ئەسراڕی تۆبێ
مل بە دامی طەوقی پەڕگاری، تۆبێ
فکری نین دونیای دون و، ملک و، ماڵ

قیصەی میعراجی تۆ شاهی ئەمین
خالقی فەرموی لە قورئانی موبین
یەعنی، (سُبْحانَ الذّی أسریٰ) یەقین
پێتکراء ئەنعوم، شەفاعەت، تاجی،دین
ئەی بە بالا سەروی، شمشادو، نیهال

وەک لەنورێ خەلّق بوی،پا، تا بەسەر
کولّی مەخلوقات لە بوّت بو، سوجدە بەر
حەق لە، شەئنت فەرموی (وَ ما زاغ آلْبَصَرْ)

---

[1] هێندێک نوسراوەدا، لە بری ئەم نیوە هۆنراوە بەم نووە، (حوبی تۆ لە ورۆژەوە دڵمی ...) هەڵبەت پەسندی لای مامۆستا هەژاریش ئەمەیە:

سەنگ و، ئوشتر، کرد، دەگەڵ تۆ چەند، خەبەر

**کرد،زوبان جاری لەبۆ تۆ،سوسەمارو،هەم غەزال**

پێشی ظاهیر بون لەخەلقی إنس و، جان

نوری تۆ خولقا، لەعالەم، بوعەیان

ئەی شەفیعی موذنیبانی ئین جەهان

رەحمێ کە، دەر حەق، منی شێت و، نەزان

**چونکو تۆی مەقبول لە پێشی (ذوُآلجَلالْ)**

ئەی دەگەڵ خالیق بەگوفتارو، خیطاب

غەرقی، بەحری، لوطفی بێ، حەدو، حیساب

حەق، لە زومرەی، خاص ئە، تۆی کرد،إنتیخاب

پەی، رەویی، رێی تۆ، زەهی (حُسْنُ آلْمَاٰبْ)

**تۆی بە، کەنزی، سبری خۆی کرد، إشتیغال**

دڵ موطیعی ئەمری خەلاقی عەلیم

بەر، کەنار، ئەزماڵ و، گەنج و، زەڕو، سیم

غەرقی، إنعامی خوداوەندی کەریم

حوبی، تۆ، (یُحْیی آلْعِظٰامْ، وَ هِیَ رَمیمْ)

**چەشمی دڵ حەیران لەنوری (لاَیَزالْ)**

شێصت و، سێ سال با حەیاتی ئەو،سپیر

صاحەبی ئەو، صوحف و، ئایاتی مونیر

رۆژوشەو، ئەز خەشیەتی شاهی کەبیر

خوردی وی هەر، تەمر، بو، خوبزی شەعیر[1]

**دائیمەن با نەفس و، شەیطان دەرجیدال**

ئەحمەدی کۆر، تا بمێنی ئاەو، زار

هەر بکە رۆژو، شەوەز، دەرگاهی یار

خالقی فەرموی لەبۆ عەبدی هەژار

١. لە نووسراوەیەکدا، لەبری شەعیر شەکیر هاتووە.

# (یا عِبادی إنّی، رَبٌ غَفارْ)

## وان گوناهکار، ما کەرەم. رەسم و، خیصال

صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ الدُرِّ المَصونْ        أحمدِ الهادی جَلاءُ نورِ العُیون
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ بَدْرِ الشَّرَفْ        لُؤلؤِ المَکْنُون فی بطنِ الصَدف
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ البَدرِ المُنیر        سیدِ الکونینْ بشیرٌ و، نذیر
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ کنزِ العَطا        شافِعُ لِلمُذْنبین ذی الخَطا
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ نُورِ القُلُوبْ        واهِبُ لِلعاصیان ذی الذُنُوبْ
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ شمسِ الشَّرَفْ        وجهُهُ نُورٌ و دُرٌ فی الصدفْ
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ جَدِّ الحَسَنْ        شافِیی الأمراض فی وَقتِ المِحَنْ
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ نُورِ المُبینْ        فی القِیامَةْ شافِعٌ لِلْمُذنبینْ
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ نُورِ الظُهُورْ        حُبُهُ بَرْقٌ و نُورُ فی الصُدُورْ
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ ختمِ النبی        صاحبِ الفضلِ الکَثیر المُتَّقی
صَلِّ یارب عَلیٰ شمسِ الأنام        دافِعِ الغَمِ وَرافِعِ السَقام
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ بَدْرِ الکَمالْ        صاحِبُ حُسْنٍ ونُورٍ فی الجَمالْ
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ بَدْرِ الدُجیٰ        مَعدِنَ الإحسانِ وَ کَهفِ الرَجیٰ
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ نُورِ القُلُوبْ        شافِعُ العِصیانِ فی یَومِ الکُروبْ
صَلِّ یارَبِّ علی نورِ الصفا        صاحِبِ الاعجازِ وَالبَحرِ الخَفا
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ نُورِ الهُدیٰ        وَجهُهُ کالبدرِ فی لیلِ الدُجیٰ
صَلِّ یارَبِّ عَلیٰ جَدِّ الحُسینْ        مُجتَبی المُختارُ إمامِ الحَرمینْ

١

## من شه هید ، کردی

حه مدی بێ حه د ،بۆ ،خودایه ی صاحه بی فه ضله و ، که ڕه م
وی له نوری صافی خۆی خولقاند . شه هی عالی حه که م
ئومّه تی کرد ، پاشه جومله ی ئومّه تان (خَيْرَ آلأُمَمْ)
ڕۆژێ مه ی هێنا وجود . ئه ز مولکی ماکان و، عه ده م

دڵ له داخی دڵبه ران بووه مه جمه عی ده ردو، ئه له م
ئاگری هه ر حه وت دوزه خ، ئه زیه مین و، ئه زشیمال
تێم گه ڕا ، سوتا به حوبێ جانیان،قه لبی مه لال
(ضاقَ وَقْتُ آلْعُمْرِ مِنّی) تال بو،لیّم عه یش و، مه جال

چونکو من دونیاو،دین. هه ردو،به یه کره نگ کرد خه یال
بو مه پڕغه یبه ت له، کن هیندو، عه ره ب. ڕۆم و، عه جه م
من له ده ست هیجرانی جانان (لَيْتَني كُنْتُ تُرابْ)
یارهه زاران میثلی من کرد،خوێن جگه ر، دڵ،چون،که باب

پڕله هه یبه ت ئاته شی پڕ سوزو، تابیش هه م،به تاب
هه رچی ده ر، دونیاو، دین، گه ر،ما،به یومنی بێ حیساب
ڕوسیابم. گه ر، به بۆسه ی زیری پات، پاک، به ر، نه ده م
تاله دونیایه، بمێنم. به نده ئه م خاکی ده رت

مونته ظیر، بۆروئیه تی ڕویی، چوماهی ئه نوه رت

رۆژی قوربان، شیبهی قوچ، خوبکەم بە قوربانی سەرت
دا خوڵیم، زیز، نابیی گەردەست نێم لە بالائ عەرعەرت

تا ببم پیێی شاد، وەکو (موسا) نەجاتی بو لە، (یەم)
تا بەسەر، بۆ کێی بو، دونیا، قەدرو، قیمەت، عیزو، ناز
کیێ نەجاتی بو، لە دەستی جادو کاری حیلەباز
بۆچی هێندە ذل، دەگیرم، ئەز، لەدوی عیشقی مەجاز
دەولەتی قائیم و ایمان، کامیل و، عومری دراز

دو، تورنجی زەرد، لەسینەی دلبەری، زیبا صەنەم
چاک لە حوبی جانیان بوم، عەقل و، عومرو، ڕەنج بەباد
شیبهی یارم، نەو جەوان، قەط مادەری، گیتی نەزاد
جانی من (وَاللّٰهُ، بِاللّٰهْ) نیم، لەرێی عیشقێ، عەناد
ڕوسواو، بەدنام. لە کن. ئەهلی ئەحیبّاءو، وەداد

بێ خەطاو، سوچ و، گوناه هەردەمکوژیی (قالت نَعَمْ)
داخو. ناکەی جارێ قەط فکرێک بلێ قەتلەو، وەبال
یاردلی مایل بەشەڕ، فورقەت، جودایی و، إنفیصال
من شەهید کردی بەبێ تەکفین و، دەفن و، إغتیسال
مەر، ئەوێ رۆژێ. سەرم ئەز، عیشقی تو خالی و، بەتاڵ

کردە پەحشەر بێ وەفاو، دانایی: بێ هەمتا حەکەم
عاشق ئەو کەس قەط لەنیک و، بەد. نەکا فیکری جەزا
زۆربنالێ، زۆر بکێشێ میحنەت و، دەردو سەزا
ڕوح و، جانی صەرفی کاری. یاربێ، تەسلیمی رەضا
شیبهی (قەنبەر) خاکی پابوو، بۆ (عەلیَ مورتەضا)

نەک دەمێ یار، بەعدە زئان پڕکین چو، ذئبان ئەزغەنەم
دلبەرم. بۆدەردی بێ دەرمان طەبیبی خاذیقە
نیک و، بەد، هەرچی هەبێ نەز، مەدحی گۆیاو، ناطیقە

چه شمی مه خلوقات به، دین و، ڕوئیه تی نالایقه
یاسه زاوار نینه، ده وڵه ت، دیده نی وێ خالیقه
گه ر، وه‌نه بوا، بۆچ (عه زازیل) فیرده بو، (إسمی عه ظه م)
(أحْرِقَتْ قلبی بنار جَذْوِکَ مالَمْ تُصیبْ)
(ما یکون لی أنیسٌ لیس لِلْجَرْح طبیبْ)
(لیتَ أُمّی لم تَلِدْنی) نه ک‌له بۆ طه عنه ی ڕه قیب
صه د هه زار ساڵ گه ر بکه م، فه ریاد له کن یاری حه بیب
صه وتی من نایه له سه مع و، ئوذنی ئه طڕوش و، ئه صه م
ئاه له بۆیه ک یاری جانی. صاحه بی شه رط و، وه فا
کامڕان ده ر، عه یش و، شادی بێ‌له سه ر ذه وق و، صه فا
نه ک هه میشه تابیعی جه نگ و، جه ده ل جه ورو، جه فا
هه رچی حه ق پیێ دا، به عافییّه ت گه یشته (قد عَفا)
موژده بێ بۆ حاڵی وی‌ئه زیه ش جیهه ت بوّی هات ره قه م
تا، له، دونیایه بمێنێ صاحه بی ڕاهی نه جات
شادمان.ده رعه یش و،عوشره ت دڵ له سه رذه وق و،نیشاط
لیت به دوربێ. ئافه تی ده ورانی دون تاڕۆی مه مات
حه یف له‌بۆتۆ‌نیی له سه رحاڵێک‌به هیچوه قت و،سه عات
ڕوبی تۆ مه هتابی عالم، به ختی من (لَیْلُ آلظُّلَمْ)
من له عاشقهایی پێشینه ی زه مان‌پرسی،خه به ر
گوت له وێ روژێ، که خولقا،ئه رض و،ئاسمان‌به حرو،به ر
مودّه یی ده یجور، شه وێک بو، هاته ڕوی وه جدو، نه ظه ر
چونکه من دایم له، کن ده یجوره له یلای روخ قه مه ر
جارێکی هه ڵگره نیقابێ، تۆ له ماهی چارده هه م
ئاه له ده ستی نه فسی شوم و، ره دّو، مه گارو، ده غه ل
عومری کوّتاو، عه قڵی نوقصان، دڵ له سه رطولی ئه مه ل

دەر ،تەغافول،بۆچ گوزەشت عومرم لەڕێی (سوءُ اَلْعَمَلْ)
ڕەنگەخەلق لیم‌بگرێ عیبرەت،من بکەن (ضربُ اَلْمَثَلْ)

**عاجیلی خۆم بەر، نەدا، تا ئاجیلی، پێی بکەم، سەلەم**

خۆز یا شەشصەد، هەزار ئەفعی دەم و، دوم، پڕلەژار
صەد ،هەزار، کەژدوم،بەعەزمی،لەدغەتی،قەلبی هەژار
یەک کەڕەت جونبوش بکەردان،وان،بە خەشم و، کین و،قار
دڵ بگەزتن، بەس نەبو، خەلاص دەبو، لەوتاب و، نار

**نەک هەمیشە دڵ (دەماوەند) سەر، بە ئەبری تارو، تەم**

گەر حەقیقەت، حەق بدامن، یارێکی دڵدار. دەوێ
ویش،وەکو من،سوختەجان و،دڵ چو،کورەی نار،دەوێ
دائیمەن دەرخۆف و، دەهشەت،دڵ لەڕێی جەبار، دەوێ
ظاهیرەن، ئەهلی بوت و، ناقوس پەرست، زونار، دەوێ

**باطینی عالیم بە (تحتَ الأرَضْ) تا لەوح و، قەڵەم**

عاشق ئەر عەقڵی هەبێ. یاری ئەزەل، ئەر گرت، بەدڵ
دەست لەدامان سست،نەکا تاچاو، دەکەن پڕخاکو،گڵ
خۆی لەڕێی ویدا. بکابێ شەرم و، عار، روسواو، خەجڵ
ئەودەبێ واصل، بە باغی جەنەت و، گوڵزارو، گوڵ

**نەک بەدم مارو، بەدڵ خوار. وەک گوریس، پڕپێچ و، خەم**

تا لە دونیایە، هەبێ ذورییەتەک، لەولادی (نوح)
کەس نییە دەرکا،لەدەستی زەخمی تیرت،جان و،ڕوح
ناڵینم شیبهی جەرەس،دێن،گێج کونی،شام و،صوبوح
گەر لەدەستت بم،نەجات ئەوجار،دەکەم تۆبەی (نوصوح)

**صادقم، دەر، ئین سوخەن، جانا، بە دیدارت، قەسەم**

عاشقان، گوتیان ذەلیلی، فەحم، تەن ئەز،ڕوی بیساط

[1]تابە جەمازی، نەچێ، ئوشتر، لەرێی (سەمّی خیاط)
لیێت، موعەیەن بێ، لەبۆت،نابێ، گوشاد،دەرکی نەجات
یار ئەگەر، سالێ بکا، جارێک بەعاشق إلتیفات
خاک، بەسەرمن، رۆح و جان،ئەز، دەستی وی،چۆن،دەردە کەم
(بارَکَ اللّٰهْ) چەند، لەطیف و، تورک و، رەندو، دڵبەری
زێڕی دەست ئەفشاری قاڵی، خەزنەبی (ئەسکەندری)
نەی، چو بالآیی بڵیندت، تەرزی توڵی عەرعەری
تۆ، بەمن بۆسێ، شەفەقەت کە، لە، لەعلی شەککەری
جەنگ،مەکە،لیێم،زیز،مەبە،سا. بێنە، تا، بەر جان،نەهەم
رۆژێ حەق فەرموی (اَلَستُ) لەوساوە، تارۆژی حیساب
کەس نەبو، بۆ تۆ، نەبێتن، کوێی زوخاڵ و، دڵ کەباب
سوتلەحوبتهەرچیبون،ئەزئەهلیعوشاق،شێخو،شاب
ئەرقەمو، ئەژدەر، ئیلانی. تەن سیاە، میثلی غوراب
بەست صەف لەو، صەدری ئەبیەض، لەیێن و، نەرم و، ئەدەم
دڵبەرا، بەشقی خودا، تۆ، بۆچی،ناترسی، لەحەق
لە نەخۆشان، تۆ دەکەی قەطعی دەواو، سەدی، رەمەق
ئەهلی إحسان و، عەطا. ناڵێن بەکەس، نیی، موستەحەق
گەر،تۆبێی،مەنعم بکەی،جارێم،بکە،دوو،نیصفە،شەق
جابزان، نەفعێک دەدا، پێت، حەسرەت و، ئاە و، نەدەم
بۆسەیەک، ئەز، وەجهی جانان، شوبهەتی، ئایینە، صاف
موژدەبێ، بۆ عاشقان، گەر، بێ،بەهای قاف، تابەقاف
سینە، کەعبەی خاڵی تۆ،ئەو،سەنگ،دەکا،عالەم طەواف
تۆ دیسان بۆ چیت وە کارجست،وان کەمەند،دامو،طەناف
تا بخنکێنی، بەوان، عاشق، بەصەد، جەورو، ستەم

---
١. ئاماژەو، دیاردەیە، بونەم ئایەتە پیروزەی قورئان (حَتّیٰ یلجَ الجَمَلُ فی سَمِّ الخیاطِ)

ئەحمەدی کوڕ،خوێت عەبەث، گومڕا ،دە کەی ڕوسوای عام
صەد ، هەزاران. میثلی توّهاتون و، چون، لە دوای، مەقام
کەس وەکی توّ،دڵ نەسوتا .قەط،بە سەودای،عیشقی خام
جارێکی هوّشیار ، وەبە، فکرێ بکە، بێ عەقڵ و، فام
ناسزایێ شبهی توّ، کەی بوی، دەوای (داءُ آلسّقَمْ)

# ٢

## ئەمن لایق بە سوتانم

هەمو کەس، بابزانێ من، لە سەودای،توّوە،حەیرانم
لە عیشقی، نێرگسی خاوت، بە قووەی مەرگ نازانم
هەتا ، روژی قیامەت، دێ، بە ئومێدی مولاقاتم
ئەتوّ، روّژێ، بە تەعجیل بێ وەرە، سەر، سەیلی، گریانم
وەکو، کەبکی خەرامان. من، کەدایم شێت و، شەیدا بوم
ئەمن، دوروّژە، ئەم دیوی، لەبەر، وەی حاڵ پەریشانم
کە،ئوردوی عیشقی توّ،هاتن کە،ملکی دڵ. بکەن،غارەت
توّ خوا، سالیک بلێ چبکەم، ئەمن لایق بە تالانم
ئەوا. ملکی دلم، روّیی. بە ئوردوی عیشق تەسلیم، بێ
بە قوربانی دوچاوت بم، وەرە پێش، داری ئامانم
دەلێن، ئەو شورشەچی بوو، لەسەر توحفەی دڵی توّ، دا
هەموڕە قاصی عیشقم بون. ئەسیرو، دیل، لەمەیدانم
لە، ناری عیشقی توّ، بوّ، من، کەدایم، خوردو، خاوم چوو

---

سەرنج: پینجینە بەک، لە پێش ئەم پێنجینەی دوایی. لەدە سنوسەکەی میرزا عەزیزا بوو، بەلام بەدا خەوە کوێریان کردوتەوە، هەرچی کردم بە زرەبینش بوّم ساغ نەبونەوە

١. تیبینی: دە گەل ئەوەش زوّر کەس پێی وایە وێ ناچێ ئەم پارچە هەڵبەستە هی ئەحمەدی کوڕ بێ بەلّام لەنوسراوە کەی میرزا عەزیزا، بەخەطێکی زوّر شپرزەو، شپڕێو، بە ناوی ئەوانەوە نوسرا بووە: منیش بەصەد چەرمە، سەرە، ساغم کردنەوەو، لیرەدا نوسیم، ئەگەر بەهەلە چوم. زوّرم لێ مەگرن. چونکو، ئاشنایەتی بەروم دەگەلیان نەبوّە:

ئەمن بەو خاڵە، شەیدا بوم، ئەسیری تیری تور[١] کانم
کە زاهید مەنعییان کردم، بەرادەر ،خاک بەسەر خۆم،بێ
دەخیل دەردیک هەیە بۆمن، کە، پەیدا نابێ دەرمانم[٢]
بەست بێ ئەحمەدی غەمگین هەتا کەی ناڵەو ئزاریێت دێ
بکەن مەنعم رەفیقانم کەمن لایق بەسوتانم

# ١

## شای گوڵان

شەو، هەتا رۆژێ، دەناڵم ئەز، بە صەد ئاەو، فەغان
ئەز، فیدای ئەبرۆی هیلالم، مەستی چاو، جەیرانەکان
شەربەتی. لەعلی لەبانی، مەشعەلی ماهی، جەهانی
ئەر، بەدەردم، تۆ، نەزانی، مەرگ لەمن، فەرضە عەیان
شەمعی رۆی فانۆسی شاهان، من لەبەر، ئەندوەو، ئاهان
ئەورو،(یۆسف) کەوتە چاهان.(میصرییان) دڵ پڕ،لە ژان
شام و، بەغداو، شیرازن، مەعدەنی میصرو، حیجازن
ئەو، فیدای، دوچاوی، بازن، مەهوەشی شیرین، زەبان

---

١ . یان: ئەسیری تیری موژگانم:

٢ . رەنگە شێخ ئەحمەدئەم پارچە هەڵبەستەی دوای یەخسرکردن و دور خستنەوەی شێخ عوبەیدیلا بۆ طائف دا نابێ: دیارە ئەم، با سەشمان، لەبەرا، هیناوە تە گۆرێ و، گونمان. شێخ ئەحمەد، دوای ئالوزانی، باری خانەتای نهری و، گیرانی شێخ عوبەیدیلا لە سالی ١٢٩٨ و، وەفاتی لە سالی ١٣٠٠ دا، دەگەرێتەوە موکریان و، لە سالی ١٣٠٥دا، واتە هەرئەو سالە کاک ئەحمەدی سولەیمانی وەفاتی تیائە کا. وەفات دەکا:

مه هوه شی شیرین و ،ده لبه ر .مه نبه‌عی له‌ب ،حه‌وضی که‌وثه‌ر
ئه ز ، له داخت ، دڵ سه راسه ر ، مه جمه ره ، بێ شک بزان
شاهیدو ،موطریب و ،مه ی بێ ،ساقی ساغیر ،مه ی به له ب ،بێ
ئه‌ی ،دڵه ی ،مه جروح ، که‌ی‌بێ ،خۆش ،وه‌بن ،ئه‌ود مردو ، کوّان
شێخ و ، شابان تۆ ، قه تالن ، مه ست و ، هوشیاری خه یالن
ئه ز ، له ده ست قه وس و ، هیلالن ، مه سکه نم نین ، له جه هان
شێت و ، دێوانه و ، فه قیرم ، من ، به تای زولفت ئه سیرم
ئه ر ، نه بی له حظێک له بیرم. موده یی عومرم ، زییان
شه ربه تی شوڕبی ، قولوبان. من فیدای تۆ ، شاهی خوبان
ئه ز ، له به روان ، بێ عویوبان. (مالی فی آلْأرضِ مَکانْ)
شاهی جوملەی ، مه ست عه ینان ، مه عده نی إقرارو ، به ینان
ئابی جامی ، شه فه ته ینان. موسکیری قه لب و ، جه نان
شادیه رۆی ، سه ر ، بیساطم. مایه یی عه یش و ، نیشاطم
ئه ز ، له ده ست تۆ ، بێ نه جاتم. من نه مان تاب و ، ته وان
شه عشه عه ی ،قورصی قه‌مه‌ر ،تۆی .من‌دڵو ،جانو ،جگه‌ر تۆی
ئه ی له حاڵم بێ خه به ر ، تۆی. مه حشه رم ، دی ، بێ گومان
شوخ و ، شه نگی نور ، جه بینی ، مایل و ، قه تالی خوینی
ئه وه که سه ی رۆی تۆی نه بینی ، ما ، له بوّ ،ده ردو ، غه مان
شای گوڵان .به‌نازو که‌شمان ،مه‌ظهه‌ری وان ، کین وخه شمان
ئه‌ز ،له‌ده‌ست فیتنه‌ی دو ،چه‌شمان .مه‌لجه‌ئه ،شای موسته‌عان
(شِدّتـی فـی کُـلِّ ساعـتْ[1] ما بَقَتْ لِلْقَلبِ راحَتْ)
ئه ی لـه ، ده ست،تیـرو ، ریـماحـت (ما یَکونُ لی أمان)
شاعیران ئه بیات و ، ئه شعار ،مه دحی شوخ و ،ڕه ندو ،دڵدار

---

١ . له برێک نوسراوه دا له حیاتی ساعة. ساحته واته مه یدان: هاتۆوه:

وان ئەتۆ، کردن بە گوفتار. ما، لەڕوی دەورو، زەمان
شوکر، گوێ، رەبی وەدودم، من لەدونیا، بێ وجودم
گەرچی ئەز، بێ صەرف و، سودم، مادیحم، بۆ یاری جان
[1]شین و ،ئەلف و ،میمی نامە. مەی بەدەستو ،دەست بەجامە
ئەز ،لە بوێ کەمتر ،غولامە،مەی خوڕ،ئەز ،غونچەی دەهان
[2]میم و، حێی و، میم و، دالە: مەی بەدەست و، ڕو، بەخالە
ساقیێیە حەوضی زولالە، شافیعە، بۆ، عاصیان
شاد، دەبی ئەحمەد: دەزانی. مادیحی جانانی، جانی
ئەر، لەوێ فیعلی، نەزانی، مەنعەلیت، باغی جینان

## ٢

## دەمدەم، لەعیشقی. دەم، دەدەم

تا قیامەت داد، لەدەستی طوطی یە، شەکەر. شکەن
نەی، قەدی، سینەصەدەف، شەکەر، لەبی. نورین بەدەن
حوری رەنگ، سیماپەری، شادی، دەری قەلبی حەزەن
گەردنی شیبهی میناوو، لەب، میثال، (لەعلی یەمەن)
[3]هەرزە گۆیی، کینەجۆیی تورک خویی طەعنەزەن
ئاگرم. بەربۆ، لە، دڵ، سوتام،لەبوت،سەر، تا. قەدەم
بومە،(ما کان) ئەز ،وجود کەوتم.لەمەیدانی عەدەم

---

١. واتە شام، یان شای من:
٢. واتە محمّد. یانی شاو گەورەمن موحەمەدە(ص)
سەرنج: لەسەرەوەی مِنْ کَلامِ شیخ ئەحمەدەوە نوسراوە ١٣١١ ـ ه ـ ق
٣. ئەم سەر بەندەلە نوسراوەکەی میزعەزیزدا، ئاوا نوسراوە هەرزە گویی توندخویی کنیەجویی طەعنەزەن:

دەمعی من، دەمعی[1]، عویونیٚ. دیٚن، هەمدەم.دەم، بەدەم
ئەزلەداخ و،دەردی دڵ.دەمدەم،لەعیشقیٚ، دەم، دە، دەم
وەرنی (والـلّـهْ) مـاَرَأَیْـتُ رُؤْیَـةَ آلـوَجْـهِ آلـحَـسَـنْ)
(مـا رَأیـتُ) روئـیـەتـی یـار، (مِـنْ بَـعـیـدٍ أو قَـریـبْ)
قەط،نەبوٚە،جاریٚک،شەکەر،لەفظیٚکی خوٚش، بوٚمن نەصیب
دا، بەوەی ساکین ببیٚ، ئەو، قەلبی مەحزونی غەریب
(عِـنْـدَ أقـوال آلْـخَـلائِـقْ) نـین. عـویـوب، بوٚوی عەجیب
شـیـبـهـی مـن، دورەز، عـویـونـن. ئاهـویـی مـوڵـکـی خـوتـەن
داد،لەدەست ویٚ،قاتلی،بیٚ رەحم و،بێ‌ئنصاف،حاڵ نەزان
یار،ئەلنەنەن،سوو،یەرنەنەن. گویز،لەرنەنەن. ئاختی قان
سوت لەحوبی وی فوئادو، دڵ. حەتا، قەلب و، جەنان
ئافەتن. پەی عەقڵ و، دینان، روئیەتی ڕوی نەو جەوان
سـی و،دو،دوڕی،دەمـەکـنـون.دەرج دەر،دورجـی دەهـەن
لەب میثال، عوناّبی تەڕ، طەرحەش[2]، مودەوەر. شیبهی میم
وەجە،چون ماهی شەش و،هەشت.میشک بوٚ،عەبنەر شەمیم
شەکەرین.لەفظی، دە، یاران. حەیدە کەن،عەظمی رەمیم
تـازە، تـوولـەن. نـەورەسـن. ئـامـانـە (جَـنـاّتُ الـنّـعـیـمْ)
پـاک، لـەعـیـصـیـان، دامـەنـی ویـن. دلـبـەری گـوڵ پـیـرەهـەن
کەی دەبیٚ، یارەب، دەمیٚ شادبین. بەدینی، نەونەمام
هەروەکو، حاذیق طەبیب، دەرمان بکا (داءَ آلْحُمامْ)
(لەیلی ثانی) یاد. بکا. مەجنونی بیٚ عەقڵ و، نەفام
تورکە،توحفەی،نەرم و،نازوک،غونچەلەب شیرین، کەلام
تەختی جەبهەت ئەز، بلور. مارین ذەهەب، سیمین ذەقن

---

١. ئەنوسراوە یەکدا، ئاوا نوسراوە دەمعی من خوینی عویونن..٢. لەبری (طەرحەش) لە نو سراوەکەی خوم دا (زاری): هاتووە.

دونیاء وەک سەگی برسی وان، هەمیشە لە یەکتر بەشەڕن ولێک هاتونەتە، سەر پاشوان:
ذِئب وکیلاب: گورگ و گەماڵ گەل:
بڕوەجهی وی: بۆ، وەدەست هێنانی ئەو لاشەیە
وەک ئاسیاو، چەرخی چەنە: چەرخی چەنە یان وەک بەردی سەرئاش هەڵدە سوڕێ
بەر، بەڕە: بەرخ و، بێچوی مەڕو، پەز:

موسا لە کۆیی نارو نور: واتە: ئەگەر حەضرەتی موسا، ئەچو بایەتە دوڵ و دەری ئەیمەن، کەی چاوی بە، تیشک و، رۆشنایی ئەوینی ذاتی حەق دەکەوت. یانی تارەنجی فەرهاد ئەکێشی بە دیتنی شیرین شادو، شوکرنابی:
روشنە: ڕۆچنە، ڕۆژنە. کولانە. جێگەی هەتاو، تێ کردن
ظولمەتی بێ ڕۆشنە: واتە زۆر تاریک و بێ رونا کاییە:

## بم بە قوربان میثلی قوربان

پیتی ی (١)
دلبەرا: ئەهۆی دڵبەرو، خوشەویستە کەم:
مەحبوس: زیندانی و بەندی:
واوو، تی: تۆ، ئەتۆ. تە:
مەرهەم: مەلحەم، هەتوان:
صاحەبی شەرط و...: ئەی خاوەنی شەرط و، وەفا:
خیطابان: ڕۆژی پرسیارو، ولاّمان (مەحشەر)
قامەتت: قەدو بالاّت هەر دەڵێی تو لە ئەمامە:
ڕۆ: ڕۆژ. ڕۆچ. ڕۆش:
کاف و تی و بی: واتە کُتُب، کتیو، گەل:
نون ویە: ئەی، قامیش:
صەد جاروە هایە: هەرچی بلێم صەد هێندە زیاترە:
نال: نالەو، هاوار، قیژە، قیژ، نالاّندن:
صەفا: خێرو، خۆشی، پیچەوانەی کەسەرە:
جەفا: کەسەرو، غەم و پەژارە:

جام: پیالە دەفری شت پێ خواردنەوە
حەک بکە: بکوژێنەوە کوێر کەوە، گونا حانی، لە دەفتەردا، نوسراوم (واتە دفتەری کردەوەکانم)
بوو، وجودت: وجودو، ذاتی تۆ، بەر، لە ئادەم هەبوو، واتە: تۆ، لە پێش ئادەمدا، خەلق کرا بوی
وادەی، مورادم: گەنگیێ یە کات و، دەمی بە مەبەست گەیشتنی، من:
بم بە قوربان: تا، منیش وەکوو، قوچی قوربان خۆم، بکەمە، قوربانی:
یەزدان: خوداوەندی، گەورە و، مەزن:
بەهری دەردم: بۆ چارە سەر کردنی پەژارە کەم:
دائی سەقیم: نەخۆشی إسقائی کە پیاو هەمیشە تینویەتی و، لە ئاو، خواردنەوە تێر نابێ (نەخوشی قەند)

وی إسمی ڕەحیمە: چونکو ئەو ناوی ڕەحیمەو، بەزەیی دارە

توّ دەلیلی: چونکە توّ، ریّ نیشاندەری منی، من. ترسم نییە دەگەل ئەوەشا زوّر، دەترسم: چوویە، لامیع: واتە: چویە، خزمەت نوری حەق:

صانیع: کردگار، خوداوەندی خولقیّنەر:

وای ئەصبحەت کردی: وای پیّ فەرموی.

ئەوامن لە ئوّمەتی، توّ خوّش، بووم

عوذر، خوایە: مەعذەرەت خوازیم بوّ. بکە، بوّم، بپاریّوە:

تا ئیوّارە: واتە: ئەگەر من هەموو روژیّک هەر، لە بەیا نیوّە، تا شەوی تاریفی ئەو دلّبەرەی، خوّم بکەم، بوّم حیساب ناکریّ کەوایە، با، خوّم چیدی ماندو نەکەم و، واز بینم:

بو تو بەندە: یانی ئەحمەدی کویّر، کویّلە و عەبدی خوّتە. بیبەرە، ناو، بەهەشتە وەو، دەستی بگرەو، بەرەلاّی مەکە، کویّرە، ریگەی، لیّ هەتلە، دەبیّ و، دە کەویّتە ناو، دوّزەخەوە:

## دەست لەناو دەست. دەم لەناو دەم

پیتی ی (٢)

بەثریب: ناوی بەرووی بەر لە إسلامی شاری مەدینەیە:

زبن کودامین: زاین کدام، این: واتە: لەکام یەک لەم، میر گوّلاّنەیی و، گوّلی کامیانی:

قبیلەگای: واتە: توّ. ڕوگەی هەموو، ئەو کەسانەی کەدەلّیی. مانگن (مەهەوەش) وەک مانگ:

شیرین دەهەن: بیّژەو، زار شیرین و خوّش:

ڕوّحم ئیلّە (تورکی): بەزەییەکت بە من دا، بیّنەوە:

ئیلە: بکە، بکەرە. بنویّنە. لە خوّت نیشاندە

بیر: یەک، دانەیەک واتە: بیر، روحم ئیلە، گولّە باخە (گولّەسورەیە) روخساری گولّستان و گولّزارە:

باز عیونی تیّر بەخویّن: چاوەکانی وەک چاوی بازی لەخوین تیر بوو، وایە، گردنی وەک کەلّە کیّوی بەرزە وەک ملی سی. واتە قازی کیّوی، دریّژە

کبل: کیّلی سەرگوڕیان کەلّە کیّوی:

سی و، دو، دور: مەبەست سی ودو ددانە کانیّتی:

ساق ستون: واتە لولاک و، پوزی وەک ئەستوندەک راست و ڕیّک و پیّکە:

بیّ ئامان: خەطەرناک، مەترسی دارو. بیّ موّلەت

شیر ئەفگەن: شیّر فریدەر. شیر لەکار خەر:

تیر زەن: تیر هاویژ، تیرلیّدەری دلّ و گیان:

ذەلیل: یەک کەوتە، داماو، کەنەفت:

سەودا: هەوا. ئەوین، ئوّگری:

تومر لەسەر: هەوای توّم لەسەر دایە. کەو تونە سەرەوە

ملکی نه‌ن: ولات‌و، ساماني، له‌شم:
روخ ئافتاب: روخسارت ده‌لیٚ خوٚره
عه‌قل سوتنی: هه‌مو ئاوه‌زی سوتاندن‌و، گشت ته‌مه‌نی تالان کردو، به‌فیروٚ، بردی:
قه‌ندئاب: خوٚشی وشیرینی قه‌ند ئاوی دو لیوٚی ئه‌و گونا جوانه‌یه که‌ده لیٚی لالی سورن. عه‌قل و دین‌و، گشت شتیٚکی له من ئه‌ستاندوه و، شه‌رمه‌زاری سه‌ر روی، زه‌وی کردوم‌و، ناتوانم. سه‌ر، هه‌لیٚنم:
شه‌فقه‌ت: ره‌حم‌و، به‌زه‌یی
روحمیٚک بکه
باشروه، دوینم: ده‌سه‌رت گه‌ڕیم فیدات، بم:
گوبلمی: دلّی من، مه‌یل‌و خواستی من توٚی ده‌ویٚ:
ئیسنر، سه‌نی: توٚ. ده‌خوازیٚ: حه‌ظ، له توٚ ده کا
دِلّنی: رێنوێنی‌و، شاره‌زاییم. بکه. بوٚ ئه‌وه‌ی له ولاتی دوره‌وه له نیشمانه، دوره که‌مه‌وه توٚ ببینم:
ئه‌ز. نه: من. نه‌تو.
میهری توٚ...: واته: ئه‌وین و خوٚشه‌ویستی توٚ هه‌ر گیزاو، هه‌رگیز، ناتوانیٚ، له دلّی ئه‌ویندارانداا خوٚی بشاریٚته‌وه‌و، سه‌ر، وه‌ده‌ر، ئه‌نیٚ‌و، خوٚ ئاشکارنه کا:
چه‌شمی ده‌و: به کویٚرایی چاوی شه‌یطان، ڕایه‌ک ده‌ستی جه‌فا، لابه‌ری خوٚت، به سه‌رمندا، بیٚنه‌و، ده‌ستیٚکم ڕه‌، سه‌ر، خه:
بمالوٚ: بیٚنه، بخشیٚنه، بمالّه، زیٚ خشیٚنه:
ئیسنه‌مه‌م (نورکی): نامه‌ویٚ، گه‌رکم نیه: له توٚ، ویٚوه، غه‌یری توٚ، له دونیادا، هیچ چه‌شنه خیٚرو، خوشیٚکی تر:

وه‌ی سه‌نن: ئه‌ی هاوار له ده‌ست که‌مه‌ندو، داوی ده‌ستی توٚ (من چیبکم) ده‌ترسم، من بخنکیٚنن (قور قورم گور خورام) ئه‌ترسم
برقسن: بوغسن، خه‌فه که‌ن.
منی: ئه‌ز، من. من خه‌فه که‌ن، واته: ده‌ترسم به‌و که‌مه‌ندانه‌ی خستونه ملی منه‌وه بخنکیٚم:
دلّبه‌ری بیٚن ماوه‌ری: واته: ئه‌و دلّبه‌ره چ دلبه‌ریٚکه. بوٚنی (ماءُالوَرْده) گولاوه، بچته کن: بچیٚته. لای دلبه‌ری گیانی من
ویٚ خه‌طیٚ: ئه‌و خه‌ط و، نوسراوه‌یه‌ی بوٚ بخوٚینیٚته‌وه
ئایه‌تی لا تقنطی: واته خورداوه‌ند ئایه‌تی پیروٚزی لا تَقْنَطوا مِنْ رَحْمَةِ اللّه:ی بوٚ، گوناحباران ناردوه
به‌لکو: به‌شکه‌م، شایه‌د، ڕه‌نگه، خوٚز گه. ئه‌ویش. مزگینی ئایه‌تی لا تَحْزَنْ اِنَّ اللّهَ مَعَنا، به ئیمه، که‌ره‌م کات
جوٚری بلقیس: مه‌به‌ست بلقیسی ژنی حه‌ضره‌تی سوله‌یمانه واته به ویٚنه‌ی ئه‌و:
باش باش: خاص. حاص: دوپاته. کردنه‌وه‌ی ووشه، بوٚرا گه‌یاندنی، زوٚره، واته، فره‌باش:
ده‌ردن له بوٚم: واته ژیان‌و، پیٚ بژیو، ئیش و، که‌سه‌رن، بوٚ من و تامیان، لیٚ نازانم:
فیراش: رایه‌خی، راخراو، جیٚگه‌ی له‌سه‌ر دانیشتن:
نه‌جّار: دارتاش، نه‌جّاری دارتاشی:
زیٚری ئه‌شریت...: واته: هه‌ر به‌لیٚدان‌و، تاشینی، تیشه‌ی ئه‌وینت که‌سه‌ر تا پای منت پیٚ دا تاشیوه. له‌ژیٚر، ویشه‌وه. به‌زه برو زوٚری ئه‌سکه‌نه‌و، مه‌کاره‌ی زمانت جه‌رگم، کونکه‌وو، جاریٚک بمدوێنه:

نیش: پێ وەدان، گەزتن چزاندن
فەوم و فیل: خزم کەس، خێڵ:
حەبسی چای بی، رەوزەنی: زیندانی چالی بێ ڕۆچنەو، رۆشەنایی:
پشکۆ: پێلو، سکل، پۆلوو
دارەبەن: دار پوشو، دارێکە، کاتێ، ئاور دەگرێ‌نا کوژێتەوە تا تەواو، دەبێ و، دەسوتێ:
عیشقم بووە دوچار: دەگیری داوی ئەوین کەوتوم
هاتە حاصل: واتە: ئەو تووەی من چاند بوم. بەری هێنا لەیەک بە صەدیش زیاتر بوو، خەرمانی غەمانی من یانی ئەو خەرمانە هێندە زور بو، زەکاتە کەییم دا بەخەلکی تر:
چاوی بون، لەسەر: واتە: چاوی هەبو جارو بارە چاوێکی بە شیرینە کەی دەکەوت، بەلام من ئەوەشم نیە:
طەی کەم: وا بووە، منی کویر چۆن دەتوانم ئەو گشتە رێگە دورەی شیرینە کەم، ببڕم و، بیگەمێ:
دلبەری عاشق: ئەگەر ئوگرو، دلبەری ئەویندارێکی وەک من بێتە سەر رێگەی رەضامەندی و پێکهاتن و، دەگەلم رێک کەوێ، خوم لە هەمو شایانی دینا. بە هێزتر و، تواناتر دەزانم:
هێند کو: ئەوەندەی خوم پاراست نەم توانی خوم. لە ئێش و پەژاران ڕزگار. بکەم:
دەست و پێم بەست: دەس و پێ، بەستم و، لە کاری خستم:
دلفگار: دل زامارو، بریندار:

بە کشەوی: شەوێکی بە لینگدان و، ڕاکردن هەلدێم و، خوم دەرباس دە، کەم:
ملکی ئەوین: ئەوین اسلام و کوفرنا ناسێ بۆ هەر شوێنێک راکەی ملکی عیشقەو، دەت گرێتەوە کەوایە. هەر لەو کوت و، زنجیرەدا بمێنەوە و، دەنگ مەکە:
قەعری گیژەنی: وا بوە، دەتەوێ بۆ کوێ برۆی. ناتوانی چونکو کەو تویەتە قولایی گیژاوەی ئەوینەوە و، دەرە تانت نابێ:
خوێن بەخور، دێن: واتە خوێنی نشتەری
برژانگ و، مژولان هێندە، زورە چەند جۆگەی هەلبەستووە و، بەخور. بە دامین و، چاکی کە واکەمدا. دێتە خوارێ
جەوشەن: زرێی ئالقە ئالقە کە هەموشیرو
تیریک نابیرێ و، دەچە مێتەوە
صنەوبەر: داری کاج، یان. کاژ
عەرعەر: سەروە کێو یلکە کە لەهی تر
کوتاترە
سەودا: تا سەو، ئارەزو. ماخولیایی:
مەقام: مەقام گرتن یانی لە جیگەیەک دا،
مانەوە:
سەر، وەنێ: سەر بنێی وە، سەرت لە سەر
سینگم دانێ، دەمێک بحەسێوە:
خالی و، فەراغ: بە تال. والا و ئاسودە:
سیروە: چفە، سرتە، شنەبای لای بە یانان
دەماغ: لوت. کەپۆ، دەم
بای شەمع و، چراغ: لە پێنی شەموە، چرادا:
داغ: سوتاندن. چزاندن. کەسەرو خەم
تەختی با: بەپێ تەخت و، خاک و، خولی
ولاتە کەم. خوشحال بم و، بە ناوات بگەم

فەد چو، چەوگان: واتە: لەغەم و، پەژارەی دوری تۆدا، باڵام وەک قەفی گوچان و، گاڵۆک، چەمیوە و، خوار بۆتەوە

سەریشم، بۆتە. گوێ. گوێنی گوێنیکەرانی زەمانەو هەر ڕۆژێ لە شوێنێکم:

چبکەم ئەز: من چی بکەم، بۆچی خوداوەندنا مکوژێ

عاجزم: وەڕەزم. ماندوو، شەکەتم:

بای صەبا: ئەی بای بەرە بەیانان. بای مژگێنی هێنەر

بێن: بۆن و. بە رامەی خۆش و، دڵگیر:

لە جانان: لە لایەن. گیانی گیانان و، دڵبەرەوە:

ما تَشْتَهِي آلْاَنْفُسْ: هەرچێکی نەفسی ئادەمیزاد، بخوازێ. لە بەهەشتا، هەیەو، دەس دەکەوێ: واتە: من ئەم بۆن و، بە رامەیەی لە لایەن دڵبەرە ڕاستەقانێکەمەوە بۆم، دێ بە بەهەشت و، هەرچی لەوێدایە، نا گۆڕمەوە:

من فیکر کرد: ئەی خوداوەندا هەرچێکی من بیرم کردەوە گشتی بێهودەو، بێ کەلک و، جێگەی گاڵتەو، گەمەپی کردن بوو:

فەت نەبوم لاو لاو صیفەت: واتە: هەرگیز نەم توانی وەک گوڵە لاو لاو پیچ بخۆمەوە، لەو جۆگەڵەی یاسەمەنی قەدوباڵای دڵبەرەکەمی لەسەرڕواوە، نزیک بمەوەو، بێنێکی خۆشم وەبەر، لوت کەوێ.

طەبعی یار واتە: تەبیاتی یاری من ئاوایە کە

دەڵێ

ئەو چ جێی لێ یە: ئەو کوێرە، قەلەندەرە، کوا، ڕێی دەکەوێ، تەنانەت ببێتە غولامی خاکی بەر دەرگای من و، لەوێدا تخیل بێ و، بتلێتەوە:

وانە: دەڵێ. دەبێژێ. وا بووە، ئێژێ

کۆتا بکا: ببڕێتەوە، تەواوی کاو، وازی لێ، بێنێ:

خەنێ، خەنە: حەنا، ڕەنگی سەری ژنان کە لە داری حەنّاء دەگیرێ و شتی پێ ڕەنگ دەکەن:

خەلق: واتە: خەڵک بە چاک و، خەراپەوە، سەرکۆنەت دەکەن و، پێت دەڵێن:

فەصدی جانی مەن: بۆچی بەبێ تاوان و، گوناح، دەتەوێ گیان. لەمن، بستێنی

چەمەن: چیمەن. مێرگۆڵە، مێرگ

سوسەن: گوڵە سویسنە کە لەنێو، خاڵاندا، گوم بووە:

داو: داوە خواز. زۆر بە تاسەو، ئیشتیا:

لە نا کاو: لەپڕ بێ ناگا، بێ هەواڵ:

ناگەهان: کوتوپڕ، بێ وەخت

بێ چاو: ئەی کوێرە چونکو لەم جیهانەدا، ئەوەندە بە سەوید، بوی خۆشەویستی و، نۆگری دڵبەر. دەتبانە باغ و بەهەشتی تایەبەتی گرۆی پیاو، چاکانەوە:

قازان: مەنجەڵ. تیانە، دیگ

هەوێن: ماکەو، مایەی پێ گیرساندنی ماست و، پەنیرو، لۆرک

دەوین: دەخوازن. دەیەوێ

غەم ڕەوین: خەم و، پەژارە لابەر

فەغان: هاوارو، ڕۆڕۆ، کردن:

سه‌ بلی ره‌وان: سێلاوی وه‌ڕێ که‌وتو نه‌ گیر ساوه‌وه‌

که‌رد عه‌ یان: خه‌وی وه‌ده‌رخست و، هه‌مو که‌س دیتی

به‌نده‌ن: به‌ده‌ن. له‌ش و قالب قه‌دی کێو:

نا به‌ نه‌ قووه‌ی به‌ یان: به‌سه‌ر، زماندادێ به‌لاّم هه‌رگیز ناکرێ ڕای گه‌یه‌نی و نیشانی بده‌ی

ئه‌ز بوم، له‌ره‌ندان: که‌ ئه‌من له‌ناو کۆمه‌لی بێ سه‌ره‌و، به‌ره‌دا، به‌ هوێ ئه‌م و ئه‌و هه‌لبه‌سته‌ خۆشانه‌وه‌ خه‌لک ڕێزم لێده‌گرن:

وه‌رنیه‌: ده‌نا، نه‌ گینا. ئه‌ گه‌ر، وا، نه‌بێ:

مه‌طروح: فرێدراو، دور خراوه‌وه‌:

ضه‌ریر: کوێر. نابینا، نه‌خوش و، له‌ره‌ز که‌و توو:

گاآلعَدَمْ: وه‌ک هه‌ر نه‌، بوبن، واته‌ زۆر کۆری تر، هه‌ر ناویشیان نه‌ماوه‌و، له‌ناو چون به‌لاّم من به‌ هوێ ئه‌م و ئانه‌مه‌وه‌ به‌ لای خه‌لکه‌وه‌ به‌ڕیزم و هه‌ره‌ نه‌مێنم

ئاخ: خۆزیا، خوز گه‌ بتوانم تام و چێژ که‌م

عه‌ بنی عِنْدَ النّاس: هه‌ر به‌لای هه‌مو که‌سه‌وه‌ رون و، ئاشکرایه‌ که‌من به‌ هوێ نه‌وینی تووه‌ به‌د نێو، شه‌رمه‌زار، بوم

که‌به‌د: سیپه‌لاک، جه‌رگ، جیگه‌ر

ئاخ: زور، مه‌خابن فره‌، به‌ په‌رۆشم:

سوتن: سوتان. هه‌لچوقانی گیان و له‌ش:

دامه‌ن: داوێن. شاقه‌ل، چاک

چه‌شمی ته‌ر: چاوی به‌ فرمێسک و پڕ له‌ ئاو

مه‌ پیچ: مه‌ پێچه‌وه‌، بێ فه‌رمانی مه‌که‌و، به‌ گوێ بکه‌:

صه‌د، قه‌بول کا: ئه‌گه‌ر به‌ ده‌یان جار به‌ خاک و، خۆلی به‌ر ده‌رگانه‌ که‌یت قبول کاو، لێت په‌شیمان بێته‌وه‌، دیسان هه‌ر به‌ فه‌رمانی بکه‌:

خوصوص: به‌ تایه‌به‌ت روح و، دڵ و جگه‌ری بۆ بکه‌، نیشانه‌و، ئامانج بالێداو، برینداری کا:

حه‌مایل که‌ی: وه‌ک ئالقه‌ی حه‌مایه‌ل ده‌ستت له‌ ده‌وری مل و گردنی دلبه‌ر بهاڵێنی و، به‌ ئاره‌زوی، خۆت، بگه‌یت:

جار، ده‌ کێشم: هه‌رادده‌ که‌م و، به‌ هه‌مو که‌س راده‌گه‌ینه‌م:

ره‌وضه‌ی به‌هه‌شت: باغی به‌هه‌شت:

به‌ حوکمیش بمده‌نی: ئه‌ گه‌ر، به‌ زۆریش به‌ ملم دا ببڕن و، ده‌ ئه‌ستۆمی پێچن:

جه‌لاّد: پیاو، کوژ، میر غه‌ضه‌ب:

دین به‌ تاڵ: بێ دین. کافر:

ره‌هزن: ڕێگر. جه‌رده‌:

## دلبه‌ری نورین جه‌مال

بیتی ی (٣)

ده‌خه‌وبندا بو، من دی: له‌ خه‌و دامن چاوم

پێکه‌وت:

لیێ ده‌خوازم مه‌طله‌بێ: خواسته‌ی خۆمی

لیذاوا ده که‌م:
به‌زاری و ذه‌لیلی: فره به گریان و لالانه‌وه‌وه:
بو سه یه ک: راموسێک، ماچێک:
غه‌بغه‌ب: له به‌ر چێله‌و، به‌ر لوغه‌ی:
به یضاو، مونه‌وه‌ر: سپی و، ورشه‌دار:
طه‌تازو، دلبه‌ر: شوخ و، دلرفێن:
مه‌شره‌ب: جێگه‌ی لێ خواردنه‌وه
بو مه، بێ: یا خوا، ببێته به‌ش و پشکی ئێمه:
نه‌صیب: سام و به‌ش، پاژ، پشک
جه‌رحی دل: برین و، زامی دل:
خوشوه بێ: خوشه‌وه ببێته‌وه، سارێژ ببێته‌وه:
به شقی شای خیرالانام: بو خاتری حه‌ضره‌تی موحه‌مه‌د (ص٤)
ده‌رحه‌ق، مه، بێ: ده‌رباره‌ی، ئێمه، هه‌بێ، سه‌باره‌ت:
تا: داو، تال. هه‌ودایه‌ک:
سه‌ر به دوش: سه‌ریان خستوته، سه‌رشان و چه‌نبه‌ره‌یان داوه
چون عه‌فره‌بی: هه‌روه‌ک دوپشک سه‌ریان هه‌لگه‌راوه‌ته‌وه
سه‌ر کرد به‌نده: سه‌ریان له دلی گیرساندوه
نه‌ب: تاو، تێ، نوبه‌تێ، یاو، له‌رز:
جه، سه‌نگه: دلی له به‌ردی ره‌ق دروستکراوه
مردن ده‌بی: کاتێ به‌ره‌حتی ئه‌و، کات و، ساتی دوای مردنه:
مه‌جال: ماوه‌ل، ماوه، مولەت
خه‌طی مه‌کته‌بی: خاله‌کانی وه‌ک خال و، خه‌طی نوسراوه وه، جوان و، رێک و پیکن:
نه‌ظاره: واته، ده‌فته‌رێکه هه‌مو که‌س لیی ده‌روانێ:

ستاره‌و، نه‌جم: ئه‌ستێره. ستێر، ستێره، ستێرک
دین: دیتن لێ روانین، ته‌ماشا کردن:
گیسو، شه‌بی: بسک وه‌ک شه‌وه‌ی ره‌ش:
که‌لافه: گولوله هه‌ل پێکراو، واته زولفه‌کانی هه‌رده لیپی گلوله‌ی میشکن.
روخساریشی هێنده رون و، بێ خه‌وشه ده‌لێ روژه، به لام ئه‌و زولفه، ره‌شانه، رژانه سه‌ر ئه‌و گونایه‌و، وه‌ک شه‌وه زه‌نگی دوای روژناوای لێ کردو، ئه‌و لاجه‌نگ و روخسارشی که شادی ده‌ری هه‌مو که‌سه، داپوشی:
قه‌ندین له‌ب: لێو، له شه‌کر دروست، کراو:
کافی، عیصیان و، مه‌لاله: واته، ماچکردنی خولی به‌رپێی چاره‌وای ژێر، ئه‌و، بو، لابردنی هه‌مو گوناح و، په‌ژاره‌یه‌ک به‌سه‌و، لایان ده‌باو، نایان هێلی:
ناو، لیپی بوراقه: ناوی ئه‌و، چاره وایه‌ش بوراقه‌و، سواره که‌شی په‌یمان و، به‌لین راسته:
یاری تاق: واته: خودای تاک و، ته‌نیا:
شافیعامن: ئه‌ی تکاکاره که‌ی من
ئه‌ز له‌بی: من، من، له‌خزمه‌تا، حاضر و بازرم. فه‌راموشم نه‌که‌ی. لابی: بلی
ئه‌ز به‌نی: من خولام و، کویله‌ی توم:
خیو: خاوه‌ن. صاحه‌ب، صاحیو:
ناده‌م ئه‌ز پیی مه‌نصه‌بی: من ئه‌م پله و پایه‌ی خومی. پێ ناگورمه‌وه‌و، خولامینی خوم پێ، گه‌وره‌ترو، به نرخترە:
صه‌د که‌من مه‌نصه‌ب وه‌هابه: ئه‌گه‌ر، صه‌د ئه‌وه‌نده‌ی ئرپله‌ی من هه‌ر غولامی و،

کوێلەیی بێ هێشتا ناگوڕ مەوەو، دین و ئایینشی بۆ، وەلا دەنێم:
پاک: هەمو گشت، تەواو، تواو، تەمیم:
توی موراده: تۆ مەبەست و، ئارەزویانی:
مەجروح فوئادە: دڵی بریندارە زامارە:
مەضرەب: لیدان. درب، کوتان
توحفەو، هەدیە: دیاری دەست، خۆشانە:
ویصال کەبن: بنێڕن. پێی بگەیە نین:
نەک: نەوە کو، نەخوازەڵە، ڕایەکی تر:
لەعب: گەمەو، گالتەو، کایە:
عەناد: نە یاری، دوژمنایەتی:
دەک: خوز گە، هەرچی، زوتر:
هەلا بێ: هەل و پەل و ڕێزال ریزاڵ. بێ
عەنا: ڕەنج و، کەسەر، دەردو ماندویەتی
چارە بی بو نبن دوعایە: واتە: نزاو، پاڕانەوە کارێک ناکاو، بێ کەلکە:
مەرخوز: یان مەرغوز، موی بزنە، مەرەزە:
دیم چراغی روی بیساط بی: روخساری ببێتە چرای سەرزەوی:
نەجم و، کەوکەب: ئەستێرەی راوەستاوو، گەرۆک.
نجم الهدایە: ستیرەی رێ، نوێن:
شاهی...: واتە شای شایان و، بێ ئەنوایانە:
نەخشە بی: خوز گە نەخشە بێ لە ئێمەش دڵ، فەراغی ماسیوا بین: دڵمان هەر، ئەوی تێدا بێ و، بەس
مودە نیکبش: ماوەیە کیش پێکەوە ببینە هاواڵ و، ئاشنا:
مەکعەب: جێگەی کەعب واتە: سوڵ و، کەوش، کاڵە:
گەردی تەحتی ئەونیعالان: تۆزو خوڵی ژێر ئەو کەو شانە:
نوی غەم لەسەر بی: واتە: پەژارەی توی دەدڵدا بێ و، بۆی دەفکردا بی، لام وایە بەسەر هەمو دنیادا، دەسەلات دارو، خاوەن، فەرمانە
دووجیهان، بەر فەتحە بێ: بە سەر هەردک دنیادا سەر کەو توو، پیرۆزە:
بچینەم: بچنم. لێ کەمەوە، هەلبرم، بە ئارەزوی خوم
سەنگین فوئاد: دڵ لەبەردبێ. دلی رەق، بێ:
عەناد بی: یانی دە گەڵ ئەوینی تۆدا. ئاراو بەینی نەبێ جێگەی هەر ئاگرەو، چی تر:
سی عوذ: یان سی عوذر، واتە: تازە پیگەیشتو.
یا خودا، سی پەنجە بی: هیوایە عومری بگا بەسی پەنجاە واتە: ١٥٠ ساڵ
توکی مەرخوز: توکی مەرەز، ئاوریشم:

## جا چۆن دڵم پڕغەم نەبێ

پیتی ی (٤)
ئەز خوفی وی ئافەت دەبێ: لە ترسی وی لەناو دەچێ
مەکروفەن: فێل و، گزیکاری یەوە

هیجرەت دەکانن: لە ولاتی لەش وە دەردە کەوێ
برێک: کەمێک، توزێک. نەختێ
بەوی: بەو هەمو، هیچی و پوچییەوە:
خزم: خیڵ. کەس و، کار، هۆزو، فامیل
عاقیبەتن: ئا کامان. دواییمان:
خاکم: واتە چونکو ماکە کەم خاکە، ئەشێ بیمەوە خاک:
شەقییە: ماندوە، بەلەزە، بەپەلەو، تا لۆ کەیە:
ئەمەل: ئارەزو، خواست، ویست:
غەرەمەبە: لە خوت دەرمە چوو، بادی هەوا مەبە
وەبە: وابە، ئەو جورەبە، وەسا بە
پێن نینە: واتە: هیچ توشەو، زمهەرێکی روژی دواییشمان پێ نییە:
ئەوهەش: دیارە ئەوکارەش (ئەوەش) لە بێ ئاوەزی و، بێ بیری، منەوەیە:
نوندوتول: چالاک، راهاتو، هەلسوراو:
گیروشەل: پەیزەن و، لەنگ، چەوێر:
دەستگاو، دەبدەبە: کوشک و، بارەگاو، هەراو، هوریاو، بگرەو، بەردە، ساز و ئاواز
هات و، چون: هاتن و، روێیشتن
بون جودا: لە تەختی شایەتی جیا بونەوە:

واحید: هەر بە تەنیا خوداوەندە مێنتەوە:
نەنوێژ، نەروژو ناگری: نوێژ، ناکەی و روژوش ناگری:
خوت داوی ناوی داوی دام: بسوەوە دەس. هێنانی پارەو نانێکی حەرام، خوت دەخەیە، ناوەندی. داوو، لە گەرەوە:
لە کنت وەیە: لەلات وایە، پێت وایە:
ئەو هەت: ئەوەشت، ئەمەی شت:
هەر، رابری: دنیا هەرئەشێ تێ پەرێ و، بروا. گوزەر کاو، ئەمێنی:
بو خودا، دەبێژم: واتە: ئەی رەبەنو، بێ چارە. ئەوەت بو خودا، پێ دەلێم، نابێ یادی خوداوەند. لە بیرە خوت بەرێوە، چونکو روژێک دێ دەگیر، دەکەوی و، کەس بە هاناتەوە، نایە:
جیگەو، حورمەت: پلەو، پایە و رێز:
عیلاج: چارە، چارەسەر، دەرمان:
دراو: پول. پارە، ئەسکیناس:
دەی جا: کەواتە، کەوایە. دەسا:
مەزار: گورستان. قەورستان. جێگەی زیارەت و، چاو پێکەوتن:
وەکو بون: کووە، بون. خڕ بونەوە بەر هەف بون. کومن.
جاچون دلم: کەوا بو چون دلی من پرنابێ لە پەژارەو، کەسەر:

## هەرلەمن ببیەن بەیانە

پیتی ی (٥)
ببیەن بەیان: ببیستن. قصە و باسی راستەو،

رەوان
جانان: هاوالانی گیانی. گیانی. خوشەویستان

هیچ بەدەنها: یاخوا، هیچ لە شێک وەک
لەشی من
غەرق: نوقوم. شەلاڵ
قوڕ نەبی: هەرگ. لیتاو،
مەوجی بی کەران: شەپۆلی بێ برانەوە،
قەراغ
گڕ لە گیانم: ئاور، بەربوتە لەشم و،
خەریکی سوتانم:
دەیری ویران: کەنشیتی کاول. بوو:
مەئوا: جیگەو، مەکۆ. شوینی لێ حەسانەوە:
باغی جینان: باخی بەهشت:
چیدی نین قەط، نور نەبێ: هەر نورو
روشەناییین:
بەدەنها: لەش گەل، قالب یەل:
کاشفی غەم و، کرۆبن: لابەری هەمو خەم و
پەژارەیەکن:
نەقشی ئوستادی غوبوبن: ئەوانە هەمویان
نەخش و، نیگاری گەورە مامۆستاو،
چازانی نادیارو، لە بەرچاو. وونن
(خوداوەند)
کی بەوان: کیێە، چکەسێکە بۆ ئەو حوریانە
نەکەو تبێتە، پەژارە و خەفەتەوە:
تاب و، گر: تین و، بلێسە.
کان: مادەن، کانی، چاوگە
رەمز و سێر: نهێنی هەمو کەس پێ نەزان
گەر بەریش مەستور نەبێ: بە مەرجێک. بە
ریش وۆردێن. دانە پوشرابێ و، لە بن
ئەودا خوی نە شارد بێتەوە:
حەظ دەکا: دەیەوی گەرە کێتی پێی خۆشە
دل ئەولیا بی: دل دە یەوی لە ریزی پیاو
چاکاندا دا بنرێ و، بە تەواوی شارەزای
ریگەی حەق بێ ئەشێ دەست لە ئەوین
بەر نەداو، بی پارێزێ:
هیچ نیبە خاپور نەبی: ئەگەر بیتو. لەسەر
ریگەی ئەوین وەلاچێ. ئەو دڵەبەکار
نایەو، هەر دەبێ کاول و، ویران، کرێ:
لی مەکانە: ئەوە دەبێتە شوێنی مارو، مێرولە.
مەعمور: ئاوا، ئاوەدان:
عاشقی عیشقی بە چاوکە: واتە: ئەگەر تۆ.
بەراستی خۆت بە ئەویندار راستەقانی
دەزانی. ئەشێ. تەنیا. ئەوین دەبەرچاو،
بگری و، ماکەی هەمو شتێکی تر،
لەناو، بەری
وەو نو: ئەو تو. وەها، ئەو جورە، رە چاو
کەو، بیکە، روانگەو، هەمیشە لەبەر
چاوت بێ. کە نەفس پیێی بادی هەوا
نەبێ
هەرزە کار: بەد کردار، سەرگەردان:
گیز: کاس. هوڕو، ووڕ. بێهوش و گێل:
رەدۆ سەر کەش: لەرێ لادەرو سەر بزیو:
پیشی عام مەشهور نەبێ: بەلای خەلکەوە ناو
دەر ناکاو، نیوی ناز ریتەو، بلاو
نابیتەوە واتە: عەوام پەسندی ناکات:
وەبکا: دەبێ کارێکی وا بکا:
نەفس ئەستور نەبێ: خوی بەزل نەزانێ و، لە
خوی دەر نەچێ
کز: لاواز. بێ هینرو، توانا. بێچارە بێ
دەسەلات
ئەبلە و، نادان و، مەسنی: واتە: ئەگەر پشت
بە نفست، بەستی و، باوەری پێ بکەی.
دیارە. گەوج و، نەزان و، سەر، لێی
شیواوی:

بو ئەوانە: واتە: بو ئەوانەیە کەبەلای
خەڵکەوە بە هیچ نەزان ناسراون
ناو بە خاص مەذکور نەبی: واتە: نیوت بەپیاو
خاص و مروی خودایی بە ناو خەڵکدا
بلاو، نەبو بێتەوە ئەوە. رازداری تۆ، ئەو
جەوان و، تازە پێگەیشتوی بەهەشتە،
ئەگینا شۆرەت و ناوی خاص لێت دە
بێتە مولۆزم وەکو کەلە شیری بێ وادە
سەرت، بە بادە داو، دەت فەوتێنێ:
جەنگ جو: شەڕ خواز، شەڕانی، جەنگانی:
نیو خور: بەرماوە خۆر پەس ماندەخۆر، واتە
کەلە شیر کە بێ وادە دەخوێنێ بانگ و،
هاوارە کەی پێ دەوی دە کەنەوە و،
دەبی دەنگەی کەی بخوانەوە:
رازی دل یەک: واتە: ئەوەی دە، دڵت دایە.
دەبێ دەگەڵ وتەو، بێژەی زارو،
زمانتدا، یەک بن. ئەشێ سەرێک و
زمانیک و، لەشێکت بێ. یانی نابێ دو
ڕوو، چەن زمان بی:
بەفەن بی: تەنیا، دەگەڵ نەفسی خۆت
بە فرۆ، فێڵ بە. و فریوی دە. بەلام
دەگەڵ خەلک راست و، رەوان بە
مەقدور نەبی: نابێ. بلێ بۆم ناکرێ و،
ناتوانم نەفس فریودەم و، بە قصەی
نەکەم:
رَبِّ أَرِنی: خودایە خۆتم نیشان دە:
لە بۆ: بۆچی، بۆچ حەضرەتی موسا. بە
تەنیایی، یانی هەر ئەو ئەو، قصەی
کردوەو، کەسی تر. بۆ ئەوەی. ئەو
دلەرەقەی خۆی لە هەمو گومان و، دود
لیک پاک و بێ خەوش کاتەوە:

أَنَا الْحَقُّ: من خۆم حەقم
شیخ مەنصور: مەبەست، حوسینی کوری
مەنصوری بەیضای فارسە کە لە شاری بە
غدا، دا، کوژراوەو: (٨٥٨ ـ ٩٢٢ م)
هاو چەرخی شوشتەری و، جونەید بوە:
بەئەبەد: هەرگز، هیچکاتێک هیچ نالێ
مەگەر ئەوەی خوداوەند، ئیذنی داوە:
وَ مٰا یَنْطِقُ عَنِ الْهَوٰی الایە:
دەورەی جەدیدی: واتە: خەلکی ئەو دەورو،
زەمانە تازەیە، و تووژیان بە کەلک
نایە نەدەبێ و تەیان لێ وەر گری و، نە
دەبێ و تەیان، لە تەکا، بکەی:
دەجال و یەزید: مەبەست جرجالی خەیالی
و یەزیدی ئەمەویە، وەک ئەو دوانە
هەر درۆ، فێلەبازی دەگەڵ یەک
دەکەن و، ئاوا دەڕواننە یەکتر:
ناظرو، مەنظور: تەماشا کەرو، تەماشا،
کراو:
کیذب: درو، دەلەسە. بیچەوانەی راستە:
موحیل: گزیکار، فیلەوەن، وەند
نەغمە بی، طەنبور: ئاهەنگ و، دەنگی
طەنبور
مەسرور: خۆشحال. بەکەیف:
ذات خەرنەل: مندارەوە بو، خۆر. داڵ.
لاشەخۆر: سی سار گە، کەچەڵە:
قاز: سی خۆماڵی و، کەوی کەزۆر قەڵەوو،
چاخە:
گورگی دڵذات: بەدڵ گورگی پیاو خورن و،
بە رواڵەتیش دەڵێ. مەڕی هەژارن
زور کەسی هەلداشت: واتە: ئەم گورگ
خەصلەت و خدانە، زۆر کەسیان لە سەر

که‌ندا لەوە، خستوتە خوارێ و، لەسەر
ریگەلایان داون هەروەک گورگ چۆن
دەنێومەردا خۆی حاشاردەداو، شان بە
شانیان دەروا، تادە گاتە جێگەیەکی
بەرزو، هەڵدێر، ئەوسا فرێیدەداتە،
خواری و، پاشان دەچێتە سەری و،
دەیخوا:

عور: کوێر، کوێری یەک چاو، نابینا:

کەسک: سەوز

بێ مەئالە: بێ ئامانجە، بێ مەبەست و،
ناکامە:

هەرکە: مادامێکی کاتێ تۆ ئامانجیک نییە:

کینە بازی نورجەمالە: ئەی دڵ پیسی
بوغضاوی، بە روالەت روخسار نورین:

کەس نە کرد نەفسی خومەظلوم: واتە کەس
نە یتوانی بەسەر نەفسی خوێدا زاڵ بێ
غەیری بایەزیدی بەسطامی نەبێ:

دەم مەزەن: دەمی تێوەر مەدە. قصەی لێ
مەکەو، لە هیچ باسێک مەدوێ. با
قصەو باستوە نیو خەلک نەکەوێ

ناو طەیفور: طەیفور لەقەبی بایەزید بووە وە
بە واتای باڵندەو، پەلەوەرە:

نەزدی دل: بەلای دڵبەرەوە بێ کەلک و،
بێ فاییدەیە:

کەس وەک من بێ وجودە: یا خودا،
کەسێکی تری وەک من بێ نمودو،
هیچ و، پوچ لە، تاریکی چاڵی نەزانیدا،
نوقم نەبێ:

مەنشەئی دەردو جەغاران: سەرچاوەو،
ماکەی. هەمو. ئیش و، غەم، پەژارەیە
کە:

جایی مارو، مور نەبی: واتە: دڵی هەژارو،
رەبەن، هەردە بێتە جێگای مارو مێلورە

دل بە دل ئەو کەی حیسابە: واتە: ئەو دڵە
کەی بە دڵ دا، دەنەدرێ ئەگەر
لەرێگەی دڵبەردا، نەبێتە کەباب و،
نەسوتێ و، چزەی لێ هەڵ نەستێ و،
وەک تەندوری دا گیرساو، بڵێسەو،
تینی لێ بەرز نەبێتەوە

چین. چین: رێز رێزو، توێ. توێ، واتە: دەبێ
توێ توێ ئاگر بگرێ و، لە گڕ نەکەوێ
و نە کوژێتەوە:

شوبهەتی سەمتور نەبێ: یانی: دەبێ بو
ئۆگرە کەی وەک سازو، سەمتور،
بنالێنێ بگری و، بکوڕو زێتەوە:

هەر نو بێژی وایە، وایە: هەرجورێکی، تۆ
بڵێی و، قۆڵم بو بکێشی هەرئەوە هەوەو،
چی تر:

ئابی ئەنگورو، رومانان: شەربەتی ئاوی ترێ
و، هەنار، واتە شەرابی ئەو دوانە

دل لە بۆ جوبی دە یاران: واتە: دڵ، بە هوی
جودایی و، جیا بونەوەی و، لێک
هەڵبرانی لە هاوالان، یا خوا، قەت
کۆشک و، سەرسەرا کەی ئاوەدان
نەبێ و کاول بێ.

تا لە یار دەستور نەبی: واتە: قورو، قەپ بە،
بێ دەنگ بەو، هیچ مەدرکێنە، تاوەکو
یار خۆی فەرمانی وتەو، بێژەت
پێدەداو، دەڵێ بڵێ جانەو ساکە.
ئەتوانی دەنگ، هەڵبری و، بکەویە
گوتەو، بێژە:

**پینی ی (٦)**

بادە: مەی، شەڕاب، ئەوەی مەست دەکا:
دەوێ: دەخوازێ. داوا. دەکات:
شاد و خورەم: دڵخۆش و، لە سەرحاڵ:
وێ شەوێ: ئەو شەوە، ئەڤێ شەڤێ
نیشاط: کەیف خۆشی: خوشحاڵ:
کەیف و ئاهەنگ: رابواردن و، بەزم و رەزم:
ناگەهان: لە ناکاو، کوتو پڕ:
را بوم، لەوێ: هەڵستام، راپەڕیم لەو خەوە:
بیدار بوم: خەبەرم بۆوە، وەخەبەر، هاتم:
نە، کەس بوو: هیچکەس لەوێ نەبوو:
تەن سەراسیمەی هەوس بوو: لەشم، هێشتا گیژو، کاسی، ئەو هەواو، ئارەزویە:
هەراسان: نەحەجمین. ئارام نەگرتن:
قەفەس بوو: واتە گیانم لە قەفەسی لەشمدا، ئاراو، قاراوی لێ هەڵگیرا، بوو:
ذی العیوبان: وەک بێ سەر و زمانان. وەک لاڵو، کەڕوبێ دەسەلاتان:
حاشَ لِلّهْ نامەوێ: واتە: ئەگەر. هەموو چاو، گەڵی دڵانم. بو ڕون کە ئەوەو، لە دڵی هەمو کەس حاڵی بمو، بزانم چیان دە دڵ دایە بە خوداوەند، سوێند، دەخۆم و، دەڵێم نامەوێ، مادام، ڕوی دلبەری دەگەڵ نەبێ و، ئەو لێم لالوت، بێ:
مەقصودی حاصل: مەبەستی وە دەست هاتووە:
واصل: پێ گەییشتو، دلبەر دیتو:
ذاتی پڕ ئەوی: واتە: هەر ذاتی حەقم گەرە
کە:
پرتەو: نور. روشەنی پڕێن:
کەو: کەبک. ژەرژ. چیل.
لەدو: لەشوێن. لە دوای هاوالان
خۆش دەکا: چاک دەکاتەوە برین و سوتاوییم:
هاتیفی دەنگ هاتە خواری:
دەنگی بانگ هەڵدێر، لە عاسمانەوە هاتە خوارێ و گوتی، سوچ و، قولینچکی پێشکەوتن، واتە: هەر لەو گوشە گیڕی و، دوری لە خەلکەوە بڕوا بە مەبەست دەگەی:
میش: منیش. ئەمنیش، ئەزێ:
خەلاصی: ڕزگاری، دەرەتان
کەس نەوی: کارێکی وام دەگەل بکە، هەر ئەتۆم بوی و، هیچی تر:
غەیری تۆم: واتە چۆن دەتوانم غیری تۆ، کەسێکی ترم بوێ ئەی ڕەسولی خودا، کە تۆ بە هەستیارو خۆشەویستی ئەوان قبول کراوی و، لە نێو خەلکی نەفام و، نەزان، چویە دەرێ و، رویشتێ میعراج یانی تو ئەو پەیام هینەرە مەزنەی. جا، چۆن دەخۆ ڕادەبینم. کەسێکی دی بکەمە، دۆست و، هاوالی خۆم
تیژە رەوی، کەس پا نەدیدە: واتە تۆ، ئەوەندە، توندو تیژ. رویشتی. کەس نەی توانی لاق هەڵێنانە وەشت، ببینێ و، زورزو. بە خزمەت نوری حەق تەعالا

گەیشتی:
سیڕ شەنیدە: چەندین فەرمایشی نهێنیت: لە
ذاتی حەق بیست:
خوسرەوی: ئەی پادشای هەردک جیهانان:
زوبدە: ئەی هەڵبژێراوی تورە مەی ئادەمیزاد:
خاکی پات: هەمو شای دونیاو. بەخشندەی
وەک حاتەم. خۆڵی ژێر پێی. تۆن:
خوردو خەو: رابواردن و، ئاسودەیی:
ئەکل و شەرابم: من هەر خەریکی خواردن و
خوارنەوەم
بی ئەوی: بەبێ ئەو، واتە: ناتوانم دەمێکی
بێ خواردن و خواردنەوە بم و،
بەبرسێتی و تونێتی. رای بوێرم و لە
عالەمی حەیوانی برۆمە دەرێ
بی ئەوەی یاری بە نازە: واتە، چۆن دە کرێ
من دەست لە ئەکل و شورب و، خورد و
خەو، هەل نەگرم، بو ئەوەی بەم دڵبەرە
نازەنینە بگەم کە توزی داوێنی مەڵحەم
و، هەتوانە، بۆ برینی تازە، پەیدا بوو،
کاری.
ئەخضەر کەوی: کەوا، سەوزیان کەوای
سەوزو، کەسک:
دامەنت خەرقەی إطاعەت: واتە: داوین و،
چاکی کە واکەی تۆ، خەرقەی تایەبەتی
خوداپەرستانەو، خەڵک دەبێ، ئەوە بە
سیپاڵی خوداپەرستی بزانن و، بەس ئەی
سەروکی، تکاکارانی رۆژی دوایی:
خاکی نەعل: خۆڵی ژێر سۆل و، کەوش:
دەوی: ئەوی. ئەمەوێ، دە خوازم:
ئەعمی: واتە: ئەو خۆڵە کل و، هەتوانی
چاوی کوێرە و، سارێژی، دەکانەوە

پیرو، روماە: وا بۆ. ئەو دینا پیرو، خۆ
رازینەوەت گەرەگ نەوێ
بەد فیعل و خیصال: پیرێ ژنێکی کردەوە و،
خەصڵەت و، خۆ خەراپە خەراپەیەکی
زور تەمەن دورو درێژە:
یەک مەجالە: هەر جارێکی خۆنیشاندام.
دەس بەجێ منی عەبەساندو، سەری لێ
شێواندم و، لاقم دەبەز چوو و، نەم توانی
برۆم:
حەیران: سەرلێ شیوان عەبەسان:
ئەز دەمام: من، دە عەبەسام. واقم وڕدەما
لەوی: لەو شوێنە، لە جێگەی خۆم:
بەد، خەرابی: لەم دونیایەی خەراب و، کاول
بودا، هەتا. رۆژێکی تێدا دەژی، وا
باشە، چاک بی:
چا: چاک، خاص، باش، پیاو خاص
صوبحە بی و دوش: سبەینی. سۆزی و، دوو
سوزیش هەر، لەوێ بمێنەوە:
دو صوبەی: دو روژی تر، صبەینی نا، ئەدوی
پیرو، فتادە: زوڕهان و، کەوتو لە کار کەوتە
کەج نیهادە: واتە: رێگەی بەرە و چونەوەی
ماڵێت خوار و خیچ گر توتە بەرو،
خوارە کە، خوارە کە بەرە و ماڵی حەق
وەرێ دەکەوی:
دوشمن لە بال بی: دوژمن و، نەیاری دەباڵە
خویدا. بێ تەمەنی بە فیرۆ برواو، هەوڵ
و، تێکو شانی بی کەلک بێ. ئەوە دەبێ
بزانی زۆر زو لەناو دەچێ و، نامێنێ
ئەگەر. بە شەوو، بەروژ هەوڵ بدا. بۆ،
مان. دیسان، کەلکی نیەو هەر لەناودە
چێ، یان چونکو دەزانێ وایە. دە بێ

شـه ورۆژ، رانـه وه سـتـێ و، هـه وڵ بـدا کارێکی باش بکا:
نـه سـره وی: ئـارام نـه گـرێ، رانـه وه سـتـێ نـه حه سیته وه، پشونه داو ماندو نه بێ
دڵ و یفـاق ده: دڵـی خۆت. ژێـک کـه شـک و، گومـانـی لـێ وه دەر خـهـه، بـیـرو، بـروای خۆت به لایه کدا بخه و، ساغی که وه و، هه ر بچووه به لای یاری ئاقانه و، ئه نیاوه.
واتـه: هـه رلانـی خـوداوه نـدی ئـا ک و ئـاق بگره و، لانی دونیا، به رده
یـه ک ده خـوازی: خۆزین. خوازن. خواسـتن، واتـه ویـسـتـن، گـه ره ک بـون. هـه روه کـو بوداوا کردن ده کار ده هـیـنـدری. بـو ژن خوازستن و، هێجبی کردنیش که لکی، لێ وه رده گیرێ:
یـه ک طـه لاق ده: واتـه: ئـه گـه ر دیـنـات ده وێ ئه شی ده س. له دونیای پـه سلان هه ڵگری. یان به پێچه وانه وه. ئه گه رلانی خودات گـه ره گـه. ئـه شـێ لانـی ئـه م دونـیـا پـیـره به رده ی:
پێک وه: پێکه وه. به یه که وه، ده گه ڵ یه کا. لال یـه ک. وێگرا. وه هـه م، ئابن و، کـو ئابنه وه:
هـه وی: هـه وو، هـه ڤـو واتـه دوهـه وی و، دوو، دژ. زۆر زه حـمـه تـه بـه، یـه کـه وه، هـه ڵ که ن و، ده گه ڵ یه کا. ئه با، بن
گـه ردی ئـه حـنـی: واتـه: خـۆڵـی ژێـر پـێـی حـه ضـره تـی مـوحـه مـه د، روشـنـایـی و، روناکی ده ره و، توتیایه بۆ چاوی کوێر، بوو، خۆشی ده کاته وه:

## عاشقان په روانه سان

پیتی ی (٧)
په روانه: په پوله
سـا: وه ک ویـنـه، واتـه: ئـه ویـنـداران وه ک پـه پـولـه وان، ده بـێ بـه ئـا گـری شـه مـی ئه وین بسوتێن:
به قه د، عه رعه ر: به بالاّ ده لێ دار، عه رعه رێ
چون میم وهی: وینه ی مهه واته مانگ
مـورغی دل شـود، حه بس ئه نده ر: باڵنده ی دلم. که وته به ندی زنجیرو کۆتی زولف و کـه زیـه ی تـۆوه و، ده ره تـان و، رزگـار بونی، بۆ نییه:
حه بس: به ند، زیندان:
ئه نده ر: ئاخ. نێو ناوی به نده وه
قه ید: زنجیرو، کۆت:
زی ولام وفی: زلف. که زی، پرچ
که ی ئه وانه م: گه نگێ. چۆن. ئه توانم
جان به ره م: گیان و، روحم. به رمه ده رێ یان گـیـان بـبـه مـه. گـۆره پـانـی شـه ڕی ئـه و دڵبه ره و، به سلامه تی بی به مه وه، ده رێ:
عه رصه گاه: گۆرایی. مه یدانی شه ڕ، یانی شه ر گه
ره زم: تیک هه ڵچون و، به گژیه کدا هاتن:
می زه نه د: لێ ده دا. ئه وه شێنێ:
به جانم: له له ش و گیانم.

پەی پەی: پەیتا، پەیتا، پی‌ئەندەر پەی. بێ و چان و، ماوەدان
خی و....: واتە خەنجەر، خەنجیر:
گەر تو بنومایی: ئەگەر، تۆ بێ تو بنوێنی جوانی خۆت بەلای. گولستان و، گولزارانەوە نە بۆن و بەرامەی گول دەمێنێ و نەعەنبەر:
خویش: خۆت. خۆ، هی خۆت:
نەزد: بەلای. لەلای. لە کن، لال:
گولستان: گولزار. مێرگ شوێنی گولان:
نیست گەردەد: نامێنێ لەناو، دەچێ:
عەطەر: بۆن و، بەرامەی خۆش:
قەلعەیی وەصل: قەلاودژی بە تۆ گەییشتن:
نەگیرد: ناتوانێ. بگری. وەدەست بێنێ:
روستەم و هەرچی بە لن: روستەم و زال و، هەمو پالەوان
زان سەبەب: بەم، هۆیەوە، بەم بیا نوێوە
بگرفت زولفەت: کزیەت، گرتی سەنگەر:
سین و نون....: سەنگەر، جیگەی قائمی شەڕ.
جەمعەند: کوێن، کۆ بونەتەوە، کۆمن
بەری شەمعی روخەت: لەبەر. لەپێش شەمی گۆناتدا:
ساقی: ئەی مەی گێڕ:
نووە: ئەتو، بدە. ویم بدە، بمدەیە، بمەرێ:
جامی شین....: پیالەی شەراب، مەی
دەستگیری کون مەرا: دەستی من بگرەو، بم هێنەدەر، لە گێژاوی دەریای غەمان و، ڕزگارم کە:
کون: بکە، بکەرە.
مەرا: من را، واتە دەستی من:
ئوفتادەئەم: کەو توم. کەوتومەتە، ناو....

دەر بەحری غەم: لە دەریای غەم نێو ناخی....
مولەقەب: نێو دێر. بەلای خەلکەوە بە غەوث و، فەریادرەسی داماوان:
خەلک: واتە مەخلوقات:
حەق: خوداوەند، یانی حەق تەعالا تۆی بە غەوث نێو دێر، کردۆوە:
دەر صەفی: واتە: لە ڕیزی پلەی خواناساندا خوداوەند، توی کردۆتە، ڕێبەو، پیشەوا:
سەرنبهادە: سەریان ناوەتە ژێر پای تۆوە.
هەمو قوطبی دونیا واتە: لاقت لە سەرسەری گشت قوطب داناوە:
قاف و طی و بی: قُطب، قوطب (ئەقطاب)
شاعیران: هۆنەرەوەکان، هۆنەران، هۆنەر، گەل:
زوریان: فرەیان. گەلێکیان
گوتوە: و تووە. ویژ تۆە. هوندۆتەوە
ئەز: لە هەلبەستی بە تام و چیژو، خۆش
بانەمەک: بە خوێ واتە تام دارو، بە مەزە
کەس نە گوفتە شیعری را: هیچ، کەس هەلبەستێکی وەک هەلبەستەکانی سەعدی شیراز، نە گوتوە:
دەر وجودەت گەشتە ظاهیر: واتە. ڕێو، رەوشتی حەضرەتی موحەمەد، دە تۆدا، خۆی نواندوە ئەی شای خاوەن سامان و سوپا:
عەینی: هەروەکی. دروست، وەکو، هەربەم چەشنە، واتە: ئەمانە لە ذاتی تۆدا. سەریان وەدەرنا. هەروەکو چۆن، لە، ذاتی بەکر، یانی حەضرەتی، ئەبوبەکری صەدیقا، خۆیان، نواند:

صیدق: راستو، دروستی، بێ درۆوز دەلە
سەی، وەکی یارو، هاوالی حەضرەتی
رەسول، لەئەشکەوتی، ئەوردا (ثور)
عەدلی: عادڵ و، بێ پیشێل، کردنی مافی
خەڵکی وەک حەضرەتی عومەری فاروق
و، بە حەیای وەک حەضرەتی عوثمانی
عەفان و، بە غیرەتی وەک حەضرەتی
عەلی بنی ئەبی طالیب رضی اللّه عنهم
أجمعین:
ذاتی: بەزاتی، بوێری. ئازایی:
عەین و لاموی: واتە حەضرەتی عەلی، یانی
خوو خدەی هەر چوار، یاری حەضرەتی
رەسوڵی ئەکەرەم لە تۆدا. کۆ، بۆ تەوە.
یاری تۆ شود: بو بە هاواڵ و، ئۆگرو،
دلبەری تۆ غەوثی بە غدا و شای شامو،
حەلەب وا، تە: ئەی ئەحمەدی کۆر،
ئەم زاتەی باست کرد، دەگەڵ خاوەن
شکۆی شام و حەڵەب یانی مەولانا
خالیدی نەقشبەندی شارە زوری هەر،
دوکیان. تۆ یان خۆش دەوێ. لەو
دوانەش بەو لاوە خۆت بە هاواڵی
کەسی تر مەزانە
مەگرە چیدی یار: واتە ئەی کوێرە، غەیری
خوداوەند. هیچکەسێکی تر. ناتوانێ،
دەستت بگرێ و، لە پەژارەو، کڵوڵی
ڕزگارت کاو، بت هێنیتە دەرێ کەوایە
یارو، هاواڵی راستەقانی هەر خودایەو،
بەس مەبەست ئەوەیە لە ئاکاما هەر
خودا دە فەریای پیاو، دێ و کەسی تر.
غەین وخی: واتە غەوثی ئەعەظەم یانی
عبدالقادری گیلانی (کرماشان)
١٠٧٨ ـ ١١٦٥ م: سەر زنجیرەی
رەوشتی قادری. وە، مەولانا خالید
نەقشبەندی. زیندو کەرەوی رەوەشتی
نەقشی واتە بهاءالدّینی بو خارایی و،
دامەز رینەری ئەو رەوشتە لەولاتە
موسوڵمانەکاندا، بە تایەبەت لە هەمو
کوردستانە کانا دیارە ئەویش هەروەک
لەبەرا، باسمان کرد. کوردەو، لە
هوزی میکاییلی و جافی شارە زوری
سەربە پاریزگای سولەیمانییە: واتە:
ئەگەردە تەوێ لەناو کومەڵی پیاو
چاک و خودا ناسا، یارێک بگری هەر
ئەم دوانە بەدۆستو، هاوالی خۆت
بزانەو، چی تر:
بە خواستی خوداوەندی میری مەزن لە شەوی
شەموی ٢٣ ی مانگی پوشپەری ٢٦٠٢ ی
کوردی، بەرامبەری ٢٣ سالی ١٣٦٩ ی
کوچی هەتاویدا، لە ئەواو، کردن و
دوبارە نوسینەوەی ئەم فەرهەنگۆ کە بە
بومەوە. هیوایە توانیبم رێچکەیەک، بۆ
باشتر زانین و، لێ حالی بونی
هەلبەستەکانی شیخ ئەحمەد، کرد
بێنەوەو، لیرەشدا ئەمەگی سەر شانی
خۆم بە جێ هێنا بێ، دیارە یاریدەدەریش
هەر خودایە:

شاری تاران

مەلا عەزیز محمدپور

داشبەندی

٢٣/٤/٦٩

# ئەو سەرچاوانەی پتر بۆ نوسینی ژیانو، بەسەرهاتی شێخ ئەحمەدی کۆر، کەلکیان لێوەرگیراوە ئەمانەن


(١) مێژوی ئەدەبی کوردی. دانراوی مامۆستا عەلادین سەجادی چاپی ساڵی ١٩٥٢

(٢) ساڵنامەی مهاباد. دانراوی دوکتور موحەمەد، مەجدی چاپی ساڵی ١٣٤٤ هەتاوی

(٣) بوزورگانو، سوخەن سورایانی ئاذەربایجانی ڕۆژئاوا. دانراوی سەروان کاویانپور

(٤) دیوانی حاجی قادری کۆیی، کۆکراوەی مامۆستا گیوی موکریانی چاپی ساڵی ١٩٦٩ هەولێر

(٥) دیوانی حاجی قادری کۆیی، کۆکراوەی ئاوڕەحمان سەعید سولەیمانی ١٩٢٥ بەغدا

(٦) دیوانی حاجی قادری کۆیی، کۆکراوەی مەسعود موحەمەد کۆیی چاپی بەغدا

(٧) دیوانی حاجی قادری کۆیی، کۆکراوەی حەمید میران. کەریم شارەزا، پێدا چونەوەی مەسعود موحەمەد

(٨) گوڤاری هووخت ژمیرە ٥ زنجیرەی ٢٣ ساڵی ١٣٥١ کۆچی هەتاوی

(٩) دودمانی عەشاییری دیبۆکری، دەسنوسی میرزا برایمی ئەفخەمی ساڵی ١٣٥٠ هەتاوی

(١٠) باغچەی بەهارستانی ١ و ٢ کۆمەلەهەڵبەستی دەسنوسی صاڵح مەحمود بارزانی ١٩١٨ - ١٩٢٠ بەغدا، بەصرە، حیلە.

(١١) نەظەری بە کوردستان و، دیداری با شوعەڕایی کورد. نوسراوەی خالید خاکی
(١٢) طەلاّی دەستەوشار: دەسنوسی صەدیق بۆرەکەیی (صەفی زادە)
(١٣) تاریخی مەشاهیری کورد، بەرگی یەک و، دو، دانراوی ماموّستا. بابا مەردوخی کوردستانی
(١٤) جونگ، یا جۆرکی دەستنوسی میرزا عەزیزی بوٚ کانی لە ساڵەکانی ١٣١١ تا ٢١ کوچی مانگی
(١٥) تاریخی مەشاهیری کورد، دەستنوسی ماموّستا قاضی موحەمەد خەضری شنوٚ
(١٦) میهرو، وەفا. دانراوی قادری فەتاحی قاضی چاپی ساڵی ١٣٥٤ تەوریز
(١٧) دیوانی شیخ ئەحمەدی کوٚر: کتیب فروٚشی سەیدیان، بە دەسنوسی مەلارەحیم ئەفشاری ساڵی ١٣٤٣
(١٨) میژوی ئیران لەزەمانی قاجاریدا، نوسراوەی دوکتور عەلی ئەصغەری هەمەدانی
(١٩) المعمرّین نوسراوەی سەهلی کوڕی موحەمەد، عوثمانی سەجیستانی
(٢٠) تذکرةُ الخواصّ نوسراوەی سیبطی کوڕی جەوزی
(٢١) پەراویزی قەرە خلیل لەسەر، شەرحی عەقایدی تەفتازانی لەسەر عەقایدی نەسەفی
(٢٢) فتوحاتُ المکّیة بابی ٧٣ دانراوی شیخ موحی الدّین عەرەبی
(٢٣) ألاصابة في تمیز الصحابه: دانراوی شیخ حافظ کوڕی حەجەری عەسقەلانی
(٢٤) تاریخی طەبەری: إمام موحەمەد، کوڕی جەریری طەبەری (مازەندەران)
(٢٥) مەثنوی فارسی شیخ عوبەیدیلاّی شەمزینی بە دەسنوی مەلاعەلی ناوێک
(٢٦) توحفەی موظەفەری: پروٚفسور. نوّس کوڕمانی ئەلمانی
(٢٧) بیرەوەری زەمانی فەقیێتی خوّم (مەلاعزیز، داشبەندی)
(٢٨) شاعیرانی کوٚر: عەلی ئەکبەر، میر سەلیمی
(٢٩) حەدیقەی ئەمانُ اللّهي: عەلی ڕەونەقی کوردستانی.
(٣٠) عُلمائنا في خدمة العلم والدّین. ماموّستا مەلاکەریم، بیارەیی
(٣١) انتفاضة الأکراد خلیلی خلیل، وەرگەڕاوەی سیامەند سیرتی نیز بە عەرەبی
(٣٢) دیوانی مەلای جەزیری بە شەرحی ماموّستا هەژارەوە
(٣٣) بەرگی یەکەمی شەرحی سودی لەسەر حافظ

(٣٤) گو ڤاری ئیرانشەهر. ژمیرەی ٢٢، کوری یونیسکو
(٣٥) مَفاتیح العلوم. موحەمەدی کوری ئەحمەدی. کوری یوسف کاتیبی خوارەزمی
(٣٦) بەدیع و، قافیە. دوکتور موحەمەد. خەزانلی و، دوکتور حەسەن سادات ناصری
(٣٧) شاری ویران عەلی حەسەنیانی
(٣٨) قورئانی پیروز
(٣٩) دەستوسیکی کونی خوالی خوشبو حاجی وەفایی مەشهوری سابلاغی
(٤٠) جامع ادیان: جانناس، ترجمه نه صغەر حکمت
(٤١) کردو کردستان. باسیتیل نیکتین (عربی)

## ئەو کەسانەی خۆم سەر، راست، شتێکم لێ بیستون
## یان لەزمان ئەوانەوە شتێکیان
## سەبارەت بە شێخ ئەحمەد بۆ
## گێڕاومەوە
## ئەوانەن

(١) خوالێ خوشبو. مامۆستا مەلاعەلی وەلزی (حەمامیان)

(٢) دوکتور، عیززەدین موصطەفا (بەهوی رادیو بەغدا، وە لەساڵەکانی ١٣ - ١٣٤٩ دا)

(٣) ماموستا. موحەممەد، جەمیل، روژبەیانی

(٤) مامۆستا. عبدالرّحمن شەرەفکەندی (هەژار)

(٥) وەستا کەریمی (هەباس ئاوا)ی لای داشبەند

(٦) میرزا حەمەدەمینی میرزا بایزی (حەمامیان)

(٧) کەریمی خدر باغەوانی (عەمبار)

(٨) صالح مەشۆشی (داشبەند)

(٩) حەمە موسای (قازانلی) سەر چۆمی جەغەتوو

(١٠) حەمە قولەی بوکان. نەبیرەی شیخ ئەحمەد (لەزمان میرزا برایمی ئەفخەمێ وە)

(١١) مام عەزیزی بۆکان و، چەند کەسی تر ........

# پێڕه سی ناوه ڕۆک و، هه ڵبه سته کان:

لاپه ڕه

## وێنەکان:

وێنەی: ـ نوسەرو، حەدیثی (حُبُّ الْوَطَنِ مِنَ الأیمانِ)
هەڵبەستی: ـ هەرنەورۆژەی کە دونیاهاتە دانان...
وێنەی: ـ شێخ ئەحمەدی مەزن (کۆر)
وێنەی: ـ گونبەذی شێخ ئەحمەدو، گردی قەبران
وێنەی: ـ مامۆستا هەژاری نەمرو، هەڵبەستی: بە کوردی دیسان زیندو دبمەوە
وێنەی: ـ خوا، لێ خوشبوو، مامۆستا مەلاعەلی وەلزیو، کۆرەکانی
وێنەی: ـ خوا، ناسانی ناوداری کورد، شێخ مەعروفو، مەولانا خالید
وێنەی: ـ بلیمەتو خوا، ناسی بەڕێزی کورد، کاک ئەحمەدی سولەیمانی
وێنەی: ـ مامۆستای روشنبیرو، هۆنەروچازان،کاکە حەمەی ناری
وێنەی: ـ هۆنەری گەل خوشەویست طاهیر بەگی جاف
وێنەی: ـ شابازی بە رزە فڕی هەمیشە زیندوی نەمر،شێخ مەحمود
وێنەی: ـ دوخوا، ناسو، هاوبیرو، هاواڵ فەقێ: مامۆستا جەلیزادە

و حاجی قادر

وێنەی: ـ گەورە پیاوانی هەڵکەوتومان، جەنابی مەلاو، مامۆستا مەسعود مُحَمَّد

وێنەی: ـ سەرەک کوردی خیرۆمەندو، پیاوچاک، حەمەئاغای کۆیی

وێنەی: ـ مامۆستای مامۆستایانی لێها تووخودایی کورد، مامۆستا قەرەداغی

وێنەی: ـ خواناسی مەزن و، شەهیدی رێگەی خوداو، سەربەستی گەل، شێخ عبدالقادر، شەمزینی (نەهری)

هەر وەک لەپێشەوە دا ، رامان گەیاند و گوتمان : مامۆستای چازان و، هەرگیز نەمرەوتو و ، شەکەتی نەناسی گەل ویست و ، و هۆز خۆشەویستم « مامۆستا هەژار»ی رەحمەتی دەیان فەرموو : «کاتێ لە جزیرو ، بۆتان بووم . گەلێک هەلبەستی خواناسیم لەدەم ، صوفییەکانی ئەوێ دەبیست کە تام و چێژی ئەم هەلبەستانەی ئەحمەدی کۆریان ، دەدا ، بەلام ، بە زاراوەی کورمانجی ژورو بوون .»

ئەوەشمان روون کردەوە ، ئەو شێخ ئەحمەدەی ئەوێ دەگەل ئەم شێخ ئەحمەدەی ئێرە ،هەر یەک بوون . بەلام ، بەداخەوە ، لەو هەلبەستانەی بە کورمانجی ژورو ،گوتراون . تەنیا چەن هۆنەیەک نەبێ ، وەدەستم نەکەوت . دیارە ئەویش ، لە دەسنووسەکانی کاک صالح مەحموودی بارزانی دابوون ولەبەر کەم بوونیان ، نەم - خستنە نێو دیوانەکە وە . جا بەم هۆیە و ، دەیان هۆی دیکەشەوە کە لە درێژایی مێژودا ، بوونەتە مشکی هەنبانەبڕی کە لە پورو ، فەرهەنگی رەسەن و ، خۆمالی ئێمە و ، چونەتە نێو کەندوی دەغل و دانی هەلبەست و ، بەیت و ، باللورە وە نەرێتی و سەریەهوردی باب و باپیران و ، گەورە پیاوانمانەوە و ، دەنک بڕیان کردون و ، گەسکیان لێ داون . تەنانەت ، بە دەگمەن ئەوەی بە تاک و ، تەراویش ، لە کەلێن و ، سووچ و ، قوژنی دەلاقەی دلی مامۆستا و ، خاوەن هەستێکی خودایی و ، نەتەوایەتیشدا ، حاشاری هەل گرتبێ ، لەتەرسی دێوەزمەی زۆرداری بە زۆر ، بە سەردا سەپاوی دزێوی خوێن تالی مێشک بە تال ، یان نەیان وێراوە ، رای نوێنن و ، لە گەل خۆیان دا ، نەوانیشیان . وەک صەدان کورپەی خشپیلانە و ، تازە ، وەگورو گال کەوتوی زیندەکیان لە ناخی ئاخێ . راکردووە و بۆ هەتا هەتایە سەریان پێ ناوەتەوە .

یا خۆ ، دراونەتە دەس چروک و ، تەرسەنۆک و ، خۆفرۆش و ، بێگانە پەرەست و ، گەل نەویستەوە و ، ئەویش بۆ دلخۆشی کاربەدەستانی کاتی میری ، دێنێ بە مەودای مقەستی بێ‌هەستی ، وایان قەلتوبڕ دەکا و ، لە قەوارەیان دەخا ، کە خاوەنە کەشی نەتوانێ ئەم وشە و ، رستە و ، لیزگەخۆمالیانەی کە بە بێژینگ و ، شێلگیری بیرو ، هەست گێژەوی کرد بوون و ، لە هەمور ، چەشنە زڕ و ، زیوان و ، زیزانە و ، چەت و ، گورگەی پەسەندی ئەم و ، ئەو وشتی کە ، پاک کردبوو‌ە ، بناسێنەوە و ،

سەر لە نوێ ، لە کوێرو و ، چێودان و ، زڕ و زیبلی ، ئاوێتە کراو ، هەڵ باوێرێ .
دەزانین هەڵبەستە کانی شێخ ئەحمەدی کوّریش ، هەر ئەوانە ، نین کە بە سەر زاراوانە ، یان بەسەر ، چەن لاپەرەی ونجڕ ونجڕ و ، شپرزەی جوّرکە ، دەسنووکانەوە بوون و ، وە دەس ئێمەی کە لە پورگری ئەوان کەوتوون . کە وابوو ، بانگاواز ، بو هەموو لایەک دەکەم و ، لە ماموّستا و ، فەقێ روّشنبیر و ، خوێندەوارە کوردە کانم ، لە هەموو ناوچە کوردنشینە کانی ئیران ، تورکیا ، عیراق و هی تریش ، تکا کارم ( بە تایبەت لە ماموّستا موحەممەد عەلی قەرەداغی و برا کوردە کوڕمانجە دڵسوّزە کانم ) . هەر چەشنە هەڵبەستیکی کوردی ، فارسی ، عەرەبی و تورکی ، کە گومانی ئەوەیان لێ دە کرێ هی شێخ ئەحمەدی کوّر ، بن و ،لەم دیوانە دا ، نەهاتبن بوّ می رەوانە کەن ، تا بە خواستی خوداوەندی میری مەزن ، زوّر بە سوپاسەوە ، هەربە ناوی خوّیانەوە لە داهاتو دا ، رەگەڵ کاروانی ئەم دیوانەیان خەین و ، کەلێنێکی دیکەی فەرهەنگە کەمانی پێ ، پڕ کەینە وە .

ئیتر بە سوپاسەوە
برای دڵسوّزتان : عبدالعزیز محمدپور
ناودێر بە مەلا عەزیز داشبەندی موکری
ناو و نیشان : تاران ـ ص .پ

سەرنج (١)

ئەم سێ هەڵبەستە تورکیانەی شێخ ئەحمەدکە ماموستا مەلا حوسینی تازەقەلایی ، بویان ناردوم ، بە سوپاسەوە لێرەدا نوسراومن ، بەو هیوایەی کە هەڵبەستەکانی دیکەشی بە شوێن‌دا بێ :

ئەی دوداغ ، باڵ‌دان شیرین ، بیر دەفعەدەن گوێرم سەنی
ئەی سیز ئینصافسز ، بیر دەفعەدەن ئویل‌دور مەنی

-----

واتای وشەکان : دوداغ = لێو ، باڵ = هەنگوین ، دان = لە ، بیردەفعەدەن = رایەک = جاریک ، سەن = تو ، سیز = ئێوە ، ئینصافسز = بی ئینصاف ، ئویل‌دور = بکوژە ، مەنی = من .

واتە : ئەی ئەوکەسەی لێوەکانت لە هەنگوین شیرینترن ، جارێک خوێتم نیشان‌دە با بت‌بینم . ( ئەگینا ) ئەی بێ ئینصاف یەکجاری بم کوژە و ڕزگارم کە .

***

بولبول گولی گوێردی ، تا قیامەت ئوخوێردی
بیر موطریبە باخەندەن ، نەهەوادەن کەچەلوێردی

-----

واتە : بولبول بە چاوپێکەوتنێکی گوڵ ، هەتا ڕۆژی هەستانەوە هەر بۆی دەخوێنێ و ، پێی هەڵدەڵێ . ئەگەر چاوی بە موطریب ( ساز لێدەر و نەوا خوێن بکەوێ ، دەبێ چۆن بکەوێتە هەڵپەڕین و ، وەسەماکەوتنەوە

سەرنج (٢)

***

ئەم چەند هەڵبەستە، پاشماوەی هەڵبەستی لاپەرەی(١٨٧)ە

شاهی جە معی ئەنبیا، تۆی شافیعی ڕۆژی جەزا
من گوناهکارو، ذەلیلم. ئومەتی تۆم، ئەز قەضا
ئومەتی عاصی و، فەقیرێشت وەکومن، هاکەذا (هکذا)
ئینتیظاری لوطفن و، پابۆسی ژێر نەعلت رە ضا
زیارەتی خاکی بەری پێت دە فعی هەر عیصیانی کرد

ئەحمەدی کۆری ذەلیل و عاجزو، دڵ پڕکەسەر
وا، لەدەگات کە و تووە بە لکو بهێتە بە رنە ظەر
جوملەیی شێخ و، وەلی، پاک، ئەنبیا یان سەربەسەر
موقتە بیس ئە ز نوری تۆ بوون و، لە بۆتۆ خاکی دەر
شۆ علەیی ئە نواری تۆیە. عالەمی نوورانی کرد